# پێرست

# منداڵە دارینە

پێشەکی:

حەمە کەریم عارف

***بێگومان جیهانی منداڵان، وێڕای سادەیی و پاکی و بێگەردی، ئاڵۆزی و تایبەتمەی خۆی هەیە، دریاریشە منداڵ دەکاتە بەردی بناغەی ئایندەو هەر وەچەو نەوەیەك بەپێی سوننەتی ژیان و جەبریەتی مێژوو دەبێ ئاڵاکەی دەستی تەسلیم بە نەوەی پاش خۆی بکات. جا کە ئەمە سوننەتی ژیان و یاسای مێژوو بێ پێویستە کار بۆ ئەوە بکرێت منالان کە دەکەنە نەوەی ئایندە بە رێك و پێکترین شێوەو شێواز پەروەردە بکرێن و بە جۆرێ ئامادەو تەیار بکرێن کە شایستەی ئەوە بن بەبێ ترس ئاڵای ژیانیان پێ بسپێردرێت.***

***یەکێك لە لایەنە گرینگەکانی پەروەردەکردنی منالان، رۆژنامەوانی منالانە، رەنگە خەڵکانێك هەبن پێیان وابێ نووسین بۆ منداڵان کارێکی ئاسانەو هەر کەسێك قەڵەمێکی هاکەزایی هەبێ، ئیدی دەتوانێ ببێ بە نووسەری منالان و وا بزانێ نووسین بۆ منالان هیچ داهێنان و هونەرێکی تێدا نییەو بریتییە لە کورتکردنەوەو سادەکردنەوەی هەست و هزری گەورە، واتا هەر هەمان هەست و هزری گەورەیەو بە شێوەو زمانێکی سادەو منالانە دێتە دەربڕین... ئەمە لە کاتێکدا کە هەموومان دەزانین منداڵییەتی چەند قۆناغێکی هەیەو هەر قۆناغە تایبەتمەندی خۆی هەیەو دەبێ لە هەر قۆناغێکدا بە زمانێك و بە رۆشنبیرییەکی تایبەت و گونجاو لەگەڵ ئەو قۆناغەدا منال بدوێنین و ئەوە رەچاو بکەین کە رۆشنبیریی منال تایبەتمەندی خۆی هەیەو پێویستە رۆژنامەوانی منالان لایەنی پەروەردەیی و دەروونی و هونەری منال رەچاو بکات و ببێ بە پردێکی ئەمین بۆ منال.***

***هەڵبەتە نووسین بۆ منال، هونەرێکی یەجگار حەساسەو لەناو کوردەواریدا یەجگار تازەیەو دەتوانم بڵێم هێشتا بە تەواوی نەچەسپیوەو ئەو هەوڵ و تەقەلایانەشی کە بە شێوەیەکی پەراگەندە دراون، یاساو رێساو داب و نەریت و بناغەی پتەویان بەرهەم نەهێناوە.***

***گوتمان پرۆسەی نەشونمای منداڵ پرۆسەیەکی بەردەوامەو بە قۆناغی جیاوازدا تێدەپەڕێت، هەر قۆناغە تایبەتمەندی خۆی و ئاراستەی خۆی هەیە، ئەمەش وا دەخوازێ منال بە ناچاری لە هەر قۆناغێکی تەمەنیدا، گۆڕانێك بەسەر هەڵس و کەوتی خۆیدا بێنێ و سەر لە نوێ***

پەیوەندییەکانی رێك بخاتەوە.. جا بەم پێیە رۆشنبیراندنی منالّ مانای وا نییە گەورە بێت هەرچی زەخیرەی رۆشنبیریی گشتی هەیە بە زمانێکی هەندێ سادە بئاخنێتە مێشکی منالّەوە، بەلّکو دەبێ ئەو شتانە بخەنە بەردەستی منالّ کە قۆناغی تەمەنی منالّ دەیخوازێو لەگەلّ تواناو پێداویستییەکانی منالّدا دەگونجێت. هەر چەندە سەردەمی منالّیی بۆ خۆی سەردەمێکی سەربەخۆیە، بەلاّم قۆناغی خۆیشی هەیە، تایبەتمەندیو تواناو پێداویستی منالّ لە قۆناغێکی منداڵییەوە بۆ قۆناغێکی دی دەگۆڕێ، پسپۆڕانی بواری منالّناسی، تەمەنی زەمەنی منالّیان کردووە بە پێوەرو پێوانەی تەقریبی بۆ ئەو قۆناغە جیاوازانەو چوار قۆناغیان دیاری کردووە:

1- قۆناغی یەکەم: (0- 7 سالاّن)
2- قۆناغی دووەم: (6- 8 سالاّن)
3- قۆناغی سێیەم: (8- 12 سالاّن)
4- قۆناغی چوارەم: (12- 17 سالاّن)

هەلّبەتە کۆمەلّگە بەشەرییەکان بە تەجروبە ئەوەیان کەشف کردووە، کە گوێزانەوەی رۆشنبیریی میللەتان بۆ منالاّنیان نابێ بە رێککەوت بسپێردرێت، بەلّکو بەرنامەو سەرپەرشتی تایبەتی دەوێت، بۆیە هەر میللەتێك بە شێوازی خۆی سەرپەرشتی پەروەردەکردنی منالاّن دەکاتو دەیەوێت دەنگی خۆی لە منالاّندا بروێنێ تا لە ئایندەدا بەر بگرێو لە رێگەی منالاّنەوە کە کلیلی ئایندەیان لە دەستە درێژە بە بوونی مەعنەوی خۆی بدات. ئیدی منداڵیش لە میانەی پرۆسەی پەروەردەی کۆمەلاّیەتیو رۆشنبیرییەوە شیلەی رۆشنبیریی کۆمەلّگەی خۆی وەردەگرێتو ئاوێتەی ئەزموونو دابو نەریتو بەهاو فیکرو رەگەزەکانی دیکەی رۆشنبیریی سەردەمی خۆی دەکات. ئیدی بەدەم گەشەکردنەوە، قۆناغ بە قۆناغ پەیوەندییەکانی پەرە دەسەنێو لە رێگەی کەنالّەکانی ئەو پەیوەندیانەوە کۆمەلّگەو خۆیو خەلّکی پتر دەناسێتو دەکەونە ژێر کاریگەری خێزانو قوتابخانە... هەلّبەتە خێزانو قوتابخانە وەکوو دوو ژینگەی سنووردار دەرەقەتی گوێزانەوەی ئەو دنیا هەرە فراوانو تازە بوونەوەو گۆڕانە بەردەوامەی رۆشنبیرییو ئالّۆزانی ژیانی کۆمەلاّیەتیو رەوتو رێچکە جیاوازەکانی ژیان نایە، ئیدی داموو دەزگای رۆشنبیرییو رۆژنامەوانیو راگەیاندن، لە رێگەی چاپەمەنیو بلاّڤۆكو فیلمو فیلمی کارتۆنو بەرنامەی رادیۆییو تەلەفزیۆنی تایبەت بە منداڵان، شان بە شانی خێزانو قوتابخانە کەوتنە بایەخدان بە منداڵانو گوێزانەوەی رۆشنبیریی بۆ منالاّن.

بێگومان رۆژنامەوانی منالاّن رۆلّێکی گرنگ لە پرۆسەی رۆشنبیراندنو پێکهێنانی کەسایەتی منالّ دەبینێ، چونکە ئاراستەیان دەکات، فێریان دەکات، کەسایەتیو زەوقو سەلیقەیان پەروەردە دەکات، زمانیان دەولّەمەند دەکات، خەیالّیان پاراو دەکات، حەزو ئارەزوویان پەروەردە دەکا، هەلّبەتە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی رۆژنامەوانی منداڵ، لەپالّ وشەدا, وێنەو رەنگە. ئاشکرایە هەر بلاّڤۆکێکی منداڵان وەکو ئەوزارێکی گەیاندنو راگەیاندن زمانی منداڵ دەولّەمەند دەکات، چونکە خوێندنەوە پرۆسەیەکی زهنییەو بەبێ

***مانای زمانەوانی مەیسەر نابێت، فێر بوونی مانای وشەش کلیلی کردنەوەی رەمزە نووسراوەکانە بۆچوونە ناو دنیای مانای وشەو زمان، جا تا سەرو سەختی منداڵ لەگەڵ زماندا زیاتر بێ، زەخیرەی زمانەوانی زیاد دەکات و بەرە بەرە ئاستی گوزارشت کردنی منداڵ بەرز دەبێتەوەو ئاشنای هزرو شێوازی هەمەڕەنگ دەبێت و ئەمەش دێتە سەر ئەزموونی خۆی و بەرە بەرە توانای ئەوەی لەلا پەیدا دەبێت گوزارشت لە ناخی خۆی و بیری خۆی بکات و بیروبۆچوونەکانی خۆی دابڕێژێتەوەو بە وشەو زمانی بسپێرێت.***

***واتە خوێندنەوە بازنەی زانیاری منداڵ فراوان دەکات و گەلێك راستی و زانیاری لەمەڕ خۆی و ئەو ژینگەو دونیایەی کە تێدا دەژی پێ دەبەخشێت کە رەنگە بە تەجروبەی شەخسی یان بە ئاسانی پێی نەگات، واتا خوێندنەوەی جدی لەو رووەوە رێگاکانی بۆ قەدبڕ دەکات. ئەمە جگە لەوەی خوێندنەوە چاوی منداڵ دەکاتەوەو گیانی رەخنەگری لەلا دروست دەکات و پێم وایە ئەو منداڵانەی دەخوێننەوەو بەپێی بەرنامە موتاڵا دەکەن، لە قوتابخانەشدا لەو منداڵانەی کە ناخوێننەوە وریا ترو زیتەڵەترو چاوکراوەترن.***

***هەڵبەتە دەبێ دان بەوەدا بنەین کە منداڵی کورد، لە رووی ژمارەی رۆژنامەو گۆڤارو بڵاڤۆکی منداڵانەوە، لە چاو منداڵانی وڵاتانی پێشکەوتوودا هەر هیچی بۆ نەکراوە، دیارە ئەمە حاڵەتێکی زۆر خراپەو جگە لەوەی زادەی ئەو بارە سیاسییە دژوارەیە کە کوردی تیدایە، نیشانەی ئەوەشە کە ئاستی هۆشیاری گەورە سەبارەت بە بایەخ و گرنگی منداڵ زۆر نزم و لاوازە، جا بەندە لە بواری کاری رۆشنبیریی خۆمدا، منداڵم فەرامۆش نەکردووەو زۆر کارم لەو بوارەدا کردووە، چیرۆکی (منداڵە دارینە) یەکێکە لەو کارانەم و وا لێرەدا پێشکەش بە منداڵانی کوردی دەکەم، هیوادارم بە دڵیان بێ.***

# منداڵە دارینە

**نووسینی : کارلۆ کولودی**

**گۆڕینی لە فارسییەوە: حەمە کەریم عارف**

پینۆکیو، منداڵە دارینەیەکی رۆحدار بوو. هەر لەو ساتەوە کە دروستکرا، ئیدی دەستی دایە لاساریی و بێعاری. بابە پیرەکەی زۆر ئازار دەدا. لاساریی و بێعارییەکەی هەر نەیسە، دەچوو دۆستایەتی خەڵکی خراپ و نەزانی دەکرد.

-1-

دەگێڕنەوە دەڵێن، عەیام و سالانێکی زوو، دارتاشێکی بەلەنگازو قەلەندەر، بەنێوی "ژپتو" لە گوندێکدا، لە کەناری دەریادا دەژیا. ئەم دارتاشە، پیرە پیاوێکی کورتە باڵا بوو، بە تەنیا دەژیا. رۆژێك ناسیاوێکی تەختەدارێکی ساف و لوس و بێ گرێی دایێ. "ژپتو" کە چاوی بە تەختەکە کەوت، بیری لەوە کردەوە بۆ خۆی بوکەڵەیەکی لێ دروست بکات. بوکەڵەیەك کە وەکو بنیادەمان رێ بکات، بخەوێ، قسان بکات و بیکات بە کوری خۆی. هەر زوویش لە دڵی خۆیدا ناوی لێ نابوو "پینۆکیو". چ ناوێکی خۆش بوو! لە دڵی خۆیدا وای بیر دەکردەوە کە بێگومان ئەم بوکەڵەیە خێری بۆ دەداتەوەو بەختی دەکرێتەوە. پیرە دارتاش بەو هیواو هومێدەی لەو تەختەیە کورێك بۆ خۆی دروست بکات، دەست بەکار بوو، دەرێ ساردبوو. بارانێکی توند دەباری، دڵۆپە ئاو بە شوشەی پەنجەرەکەدا دەهاتە خوارێ، با، بەگڤ و هۆڕ خۆی بە دوکەڵکێشی سوپاکەدا دەکرد، بەڵام ناو ژوورەکە گەرم بوو. هەموو شتێك هێدی و ئارام بوو. سیسرکێك لە سوچێکی ژوورەکەدا هەر زیکە زیکی دەکرد. پشیلەکەی وەستا پیرەش، گەمەی بەو ئاردە دارانە دەکرد کە وەستا دەی تاشین. وەستا ژپتۆ هەوەڵجار قژی پینوکیو-ی دروست کرد. ئەوجا تەوێڵی تاشی. کاتێك کە چاوەکانی دروست کرد، تەمەشای کرد تەختەکە گیانی کەوتۆتە بەرو زەق زەق سەیری ئەو دەکات. ئەوسا نۆرە هاتە سەر دروستکردنی لووتی منداڵە دارینەکە.

وەستا، لەم قۆناغەدا زۆر بۆ بوکەڵەکە نارەحەت بوو. چونکە هێشتا برین و تاشین و دروستکردنی کەپوی تەواو نەبوو بوو. کە کەپوی کەوتە درێژبوون. وەستا هەر چەند کورتی دەکردەوە، بێفایدە بوو، کەپوکە درێژو درێژتر دەبوو. وەختێ وەستا دەمی بوکەڵەکەی دروست کرد، بوکەڵەکە زمانی دەرهێناو کەوتە گاڵتە کردن بە وەستا. ژیپتو ویستی پێی

بڵێ: "چ شەیتانێکی!" بەڵام هیچی نەگوت، ئەوجا دەستو لاقی بوکەڵەکەی دروست کردن. وەستا ژیپتۆ کە لە کارەکەی بووەوە، پینوکیوی بە پێوە لەسەر عاردەکە دانا. یەکەم کاری قورس ئەوەبوو کە بوکەڵەکە فێر ببێ چۆن لەسەر پێیەکانی بوەستێو رێ بکات. پیرە وەستا رێو رۆیشتنی فێری بوکەڵەکە کرد. ئەویش هەر زوو پێی گرت، ئەوجا وەستا گوتی: "زۆر چاکە!" پینوکیو، پێ گرتو کەوتە رێ کردن بە چوار دەوری ژوورەکەدا. چەند جارێك بە دەوری ژوورەکەدا سوڕایەوەو ئەوجا لە دەرکی ژوورەکەوە وەدەرکەوتو دەستی بە غاردان کرد.

وەستا ژیپتۆ، بەڕاکردن دوای کەوت، هاوار هاوار "بیگرن! بیگرن!" ژیپتۆی بەلەنگاز، ئەو پیرەمێردە میهرەبانە، وەکو کوڕی خۆی مەیلو مەحەبەتی چوو بووە سەر پینوکیو. ژیپتۆ، دەیویست خۆی پێوە بابداو شانازی پێوە بکات، بەڵام بوکەڵەکە دەری خست کە زۆر بەدو بەدخوو ناجسنە، بوکەڵەکە هەر کە لە ماڵ وەدەرکەوت، ئیدی بێکارو بێعار بە نێو شەقامو کۆڵانان کەوت.

پاسەوانێکی کەپۆ درێژ بوکەڵەکەی لە شەقامێکدا گرتو نەی هێشت بڕوات، بوکەڵەکە خۆی لە دەستی دەرباز کردو بەرەو ماڵ کەوتە غاردان، بەڵام کەسی لە ماڵەوە نەبینی، وەستا ژیپتۆی داماو، لە ماڵ وەدەرکەوتبوو، و لە شەقامەکاندا بە دووی بوکەڵەکەیدا دەگەڕا! پینوکیو، چ خەمی ئەو پیرەمێردەی نەبوو کە وێڵو سەرگەردان شەقامەکانی بۆ دەگەڕا، تەنیا بیری لە ئیسراحەتی خۆی دەکردەوەو بەس، بەڵام لە پڕ گوێی لە دەنگێك بوو. دەنگێکی سووك گوتی: "زیك، زیك، زیك!" بوکەڵەکە ترساو خێرا گوتی: "کێیە؟ ئەوە دەنگی کێیە؟" دەنگەکە وەڵامی دایەوە: "منم!" بوکەڵەکە ئاوڕی دایەوە. سیسرکێکی گەورەی بینی کە بە ئەسپایی بە دیوارەکەدا هەڵدەگەڕا. بوکەڵەکە پرسی: "تۆ کێی؟" سیسرکەکە بە هێمنی وەڵامی دایەوە: "من سیسرکی قسە وێژم و سەد ساڵە لەم ماڵەدا دەژیم، رەنگە زیاتریش بێ." بوکەڵەکە هاواری کرد: "بڕۆ گوم بە لەبەر چاوم!" دەنگەکە دیسان گوتی: "نەفرەت لەو منداڵانەی کە لە ماڵی خۆیان هەڵدێن! ئەم جۆرە منداڵانە ئاخیرو ئاقیبەتی باشیان نابێ" بوکەڵەکە بە توندی گوتی: "دەمی خۆت بگرە پیرە! من نامەوێ وەکو هەر منداڵێك بمو بچم بۆ قوتابخانە، ئەمەش پەیوەندی بە تۆوە نییە!" سیسرکەکە گوتی: "بچکۆلەی گەوجو نەفام، چما نازانی ئەگەر نەخوێنی، دەبێ بەکەرێکی تەواو. هەموو کەس گاڵتەت پێ دەکەن! ئەگەر ناتەوێ بچیتە قوتابخانە ئەدی بۆ بەلای کەمەوە کارێك فێر نابی تا ژیانی خۆتی پێ بقەتێنی! چما نابینی ئەوانەی نەخوێندەوارن چەند مایەی نارەحەتیو نیگەرانی خۆیانو خەڵکانی ترن" بوکەڵەکە تورە بوو، چەکوشێکی هەڵگرتو ویستی بیگرێتە سیسرکە قسە وێژەکە. بەڵام سیسرکەکە زوو فریای خۆی کەوتو لە پەنجەرەکەوە وەدەر کەوت.

شەو داهات. هەموو جێیەك لە تاریکیو بێدەنگیدا نقوم بوو. بوکەڵەکە برسی بوو. بە کونو کەلەبەری ژوورەکەدا کەوتە گەڕان تا شتێ پەیدا بکاتو بیخوات. چەکمەجەکان گەڕا، ئەملاو ئەولا گەڕا، بەڵام بێفایدە بوو، تەنانەت تیکە نانێکی رەقو وشکی نەدۆزییەوە. هەر

هیچ شتێك لە ماڵەكەدا نەبوو. برسێتی خەریك بوو زەیفی لێ دەسەند، دیسان كەوتەوە گەڕان، بەڵام هیچی پەیدا نەكرد. ئیدی كەوتە گریان و بەخۆی گوت: "ئۆف! ئەگەر من منداڵێكی باش بوایەم و لە ماڵ رام نەكردبایە، ئێستا بابە گیان لێرە دەبوو و شتێكی بۆ پەیدا دەكردم. بەڕاستی برسێتی ترسناكە!" رێك لەم كاتەدا، شتێكی خڕی سپی بەرچاوكەوت. هێلكەی مریشك بوو! بوكەڵەكە زۆر كەیف خۆش بوو. چەند جارێك هێلكەكەی لە نێو دەستیدا هەڵسوڕاندو ماچی كرد. لەبەر خۆیەوە گوتی: "چۆن بیكولێنم؟ هێلكەو رۆن دروست بكەم؟... نا! باشترە بیخەمە تاوەكەوە... باشترین چارە ئەمەیە، حەز دەكەم بە زووترین كات پێ بگات تا بیخۆم". تۆزێ ئاوی لە تاوەكە كرد. ئەوجا نایە سەر ئاگر، كە ئاوەكە هاتە كوڵ، هێلكەكە شكا بەڵام لەبری سپێنەو زەردێنە، جوجەڵەیەكی چكۆڵەی لێ هاتە دەرێ. جوجەڵەكە زۆر بە ئەدەب بوو. سەری بۆ پینوكیو دانەواندو گوتی: "قوربان، زۆر زۆر سوپاس كە لەو تاریكییە دەرت هێنام. خوا حافیز!"و لە پەنجەرەكەوە هەڵات. بوكەڵەكە، هەوەڵجار سەرسام بوو، نەیدەزانی ئەمە چ بونەوەرێكە، بەڵام پاشان كە دیتی خواردنەكەی لە دەست چوو، كەوتە گریان و دادو بێداد، چەندین جار پێی بە زەویدا كوتا، چونكە ئەمجارەیان لە هەموو جارەكانی دی برسی تری بوو بوو. لە ماڵ وەدەركەوت، بە نێو گوندی كەوت. درەنگ بوو. تاریكی هەموو شوێنێكی داگرتبوو. پینوكیو، بە هیواو ئاواتێكی زۆرەوە لە یەكەم ماڵ نزیك بووەوە. لە زەنگی ماڵەكەیدا، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "خۆ هەر نەبێ كەسێك بە دەنگمەوە دێت".

وەهاش دەرچوو، پیرەمێردێكی چكۆلەی كڵاو لەسەر هاتە بەر پەنجەرەكەو بە تووڕەیی و بێزاری لێی پرسی كە چی دەوێ.

بوكەڵەكە پاڕایەوەو گوتی: "دەتوانی، ئەگەر زەحمەت نەبێ، پارچە نانێكم وێدەی؟"

پیرەمێردە بچكۆلەكە، وایزانی پینوكیوش یەكێكە لەو منداڵە بێ تەربێت و بێكارو بێعارانەی كە بۆ كەیفی دڵو رابواردن و ئازاردانی خەڵكی، لە زەنگی ماڵان دەدەن، گوتی: "لەوێندەر بوەستە، ئێستا دەگەڕێمەوە!"

پیرەمێردەكە پاش تۆزێك گەڕایەوە. پەنجەرەكەی كردەوەو هاواری كرد: "وەرە بن پەنجەرەكە!" بوكەڵەی نەفام چووە بن پەنجەرەكە، بەڵام لە پڕ هەستی كرد كەوتۆتە ژێر تاڤگەیەكی گەورەوە، تومەز پیرەمێردەكە دەفرێكی پڕ لە ئاوی بەسەریدا كردبوو.

بوكەڵەكە، سەراپای تەڕبوو، كاتێك كە بۆ ماڵ گەڕایەوە، تەڕو شەكەت و ماندوو لە سوچێكدا كەوت، بەڵام دوای كەمێك هەستاو چوو لە پاڵ ئاگری كوانوەكەدا دانیشت و لاقەكانی روو لە پشكۆی ئاگرەكە درێژ كرد، بەیانی كە رۆژ بووەوە وەستا پیرە بەو قاوەڵتیەوە كە كڕی بووی، گەڕایەوە، هیلاك و ماندوو و تووڕە بوو. بەڵام كە چاوی بە بوكەڵە چكۆلەكەی كەوت، روناكی یەك كەوتە دڵی و كەمێك بوژایەوە، بەڵام وای! پێی بوكەڵەكە سوتابوو.

کە بوکەڵەکە هەستا، زۆر گریا، کاتێك کە گوێی لە دەنگی پیرەمێردەکە بوو بوو، رای کردبوو دەرگای لێ بکاتەوە، بەڵام پاش ئەوەی دوو– سێ سەرەسمی دابوو، لەسەر زەوی تەخت بوو بوو.

کە وەستای پیر، ئەوی بینی، هەستی کرد کە گەڕانەکەی بێ سوود نەبووە! بوکەڵەکەی هەڵگرتەوەو ماچی کرد. بوکەڵەکە پێی گوت کە چۆن بێ ئەوەی پێ بزانێ، پێیەکانی سووتاندووە.

ژپیتۆی پیر گوتی: "من دەتوانم، پێی تازەت بۆ دروست بکەم، بەڵام دەترسم دیسان هەڵێی"

ئەگەر قەولم بدەیێ کە ئاقڵ و بە تەربیێت بی و بە تەنیا لە ماڵ وەدەرنەکەوی، جوتێك پێی چاکت بۆ دروست دەکەم کە لە هینەکانی پێشووت باشتر بن." بوکەڵەکە بە خۆشحاڵییەوە قەولیدا کە: "نا، هەڵنایەم. ئیدی ئاقڵ دەبمو بەبێ ئیزنی تۆ لە ماڵ ناچمە دەرێ" ژپیتو پیر بە زەردەخەنەوە گوتی: "دەچیتەی قوتابخانەش؟".

بوکەڵەکە، بەڵێنی ئەوەشیدا. ژپیتو، کەرەستەی کاری دەرهێناو دوو پارچە تەختەی هێناو کەوتە کارکردن، لە ماوەی کەمتر لە سەعاتێك لاقەکانی ئامادەکرد. ژپیتۆ بە بوکەڵەکەی گوت: "چاو بنوقێنەو بخەوە!".

بوکەڵەکە، چاوەکانی نانە سەریەك و وای نواند کە خەوتووە، پیرەمێردەکە، هەندێ غەرەی کردەنێو قەپێلکە هێلکەیەکەوەو لاقە تازەکانی بە بەدەنی بوکەڵەکەوە چەسپاند.

کاتێك کە بوکەڵەکە زانی، لاقەکانی بۆ دروست کرانەوە، لە جێی خۆی هەستاو, وەکو شێت و دینان بەنێو هۆدەکەدا کەوتە رەقسین و هاواری کرد: "مەمنونم، بابە! لەبری هەق دەست و ئەو زەحمەتەی کێشات، یەکسەر دەچمە قوتابخانە".

بەڵام پاشان فرمێسك و روندکان لەچاوانی قەتیس ماو گوتی: "باشە کە جلکم نەبێ چۆن بۆ قوتابخانە بچم؟"

ژپیتو گوتی: "راست دەکەی ئەمەم هەر لەبیر نەبوو!"

بوکەڵەکە کە ئەمەی بیست هێندەی دی خۆی سەرگران کردو پرسی: "جلکم بۆ دروست دەکەی؟"

پیرەمێردەکە گوتی: "ئەگەر بەڵێن بدەی کە باش دەرس بخوێنی، بێگومان بۆت دروست دەکەم!"

بوکەڵەکە بەڵێنیدا. پیرەمێردەکە، جلکی بۆ دروست کرد. بۆکەڵەکە غاریدا تا لە نێو دەفرە ئاوەکەدا تەماشای خۆی بکات. کە دیمەنی خۆی بەو سەروسیمایەوە بینی، کەیف خۆش بوو. پیرەمێردەکە بە هێمنی گوتی: "خراپ نییە. هەر چەندە جلکێکی ئاغایانە نییە، بەڵام خراپ نییە!".

بوکەڵەی ناشوکور گوتی: "بەڵام تا شتێکی دیکەم نەبێ ناتوانم بۆ قوتابخانە بڕۆم!"

پیرەمێردەکە پرسی: "چ شتێك؟". بوکەڵەکە گوتی: "کتێبێکی ئەلف و بێ."

ژپیتو گوتی: "ڕاست دەکەی، ئەویشت بۆ دەکڕم."

بوکەڵەکە خێرا گوتی: "دەبێ بچیت بۆ کتێبخانەو بیکڕی".

ژپیتـوی پـیر، دەسـتی بـە بەڕکیـدا کـرد. بـەڵام چ پارەیـەکی تێیـدا نـەبوو. ئـەوجا لـە مـاڵ وەدەرکەوت.

کاتێ گەڕایەوە، بەفر دەباری. کزەو سەرمایەکی بەتروەف بوو، بەو سۆزی سەرمایە پاڵتۆی لەبەر نەبوو، چونکە پیرەمێردەکە پاڵتۆکەی فرۆشتبوو. تا بە پارەکەی کتێبێکی ئـەلف و بـێ بۆ بوکەڵەکەی بکڕێ.

ژپیتـو، بـۆ ئـەوەی هەنجـەتێك بـۆ فرۆشـتنی پاڵتۆکـەی بێنێتـەوە، گـوتی: "پاڵتۆکـەم زۆر ئەستوورو گەرم بوو!" بەڵام بە لەنگازە خەریك بوو لە سەرما هەڵدەلەرزی.

بوکەڵەکـە، لـەنکاودا خـۆی لـە هـەمێزی ژپیتـو هاویشـتو ماچـی کـرد. شـەوێ نوسـتن، سبەینێ کە ڕۆژ بووەوە, بوکەڵەکە چوو بۆ قوتابخانە، لێبڕابوو ببێ بە منداڵێکی باش و گوێ ڕایەڵ.

–2–

هێشتا پێی لە ماڵ نەنابووە دەرێ کە لە مەیدانی شارەوە دەنگی دەهۆڵ و کـەڕەنا هەسـتا، بوکەڵەکـە بەسەرسـامی لـە خـۆی پرسـی: "دەبـێ چ شـتێك ڕوویـدابێ؟ وا چاکە بچم تاقیبێك بکەم!".

ڕۆیی. چادرێك هەڵدرابوو. تابلۆیەکی گەورەی بەسەرەوە هەڵواسرابوو، دەنگی پێکەنین لە نێو چادرەکەوە دەهات. بوکەڵەکە نەیدەزانی تابلۆکە بخوێنێتەوە. لە کوڕێکی پرسی.

کوڕەکـە گـوتی: "بوکەڵـەبازی! پـارەت پێیـە بلیـت بکـڕی؟". بوکەڵەکـە پـارەی پـێ نـەبوو. دێوەرەیەك لەوێندەر بوو، پێی گوت: "بۆچی کتێبەکەت بە من نافرۆشیت؟".

پینوکیـو، گـوێی لـە دەنگـی بوکەڵـەکان بـوو. حـەزی کـرد ماوەیـەکی زۆر بـە دیاریانـەوە بوەستێ. بۆیە کتێبەکەی بە دێوەرەکە فرۆشت و بلیتێکی کڕی و خێرا خۆی بە هۆڵی "بوکەڵە بازییەکدا" کردو کە بینی ئـەمیش لـە هـەمان ڕەگـەزی ئەوانـە، بـێ دوو دڵـی چـووە ناوەنـدی شانۆکەو بوکەڵەکان.

هەرکە وازییەکە تەواو بوو. کابرای وازیگێڕ کە نێوی ئاگر خۆر بوو خۆی بە ئاشـخانەکەدا کرد. بڕیار بوو لەوێ مەڕێك بکوژنەوەو بیبرژێنن.

چـونکە دارو چـیلکەی تـەواویان بـۆ برژانـدنی گۆشـتی مەڕەکـە نـەبوو، ئـاگر خـۆر، ئاشچییەکەی گـازکردو گـوتی: "ئـەو منداڵـە دارینـە بـۆ ئێـرە بێنـە. وابـزانم لـە تەختـەدارێکی وشکی چاك دروست کراوە، دڵنیام ئەگەر بیخەینـە نێـو ئاگرەکـەوە، پشـکۆیەکی باشـمان لێـی دەست دەکەوێ بۆ برژاندنی ئەم گۆشتە".

زۆری نەبرد کە ئاشچییەکە، بە راکێش راکێش منداڵە دارینەکەی وەژوور خست بۆ لای ئاگر خۆر، ئاگر خۆر، پیاوێکی خراپ نەبوو. کە چاوی بەگریانی بوکەڵەکە کەوت، زۆر دڵی پێی سووتاو کەوتە گریان، بگرە لە بوکەڵەکە پتر گریا. وەختێ هەردووکیان لە گریان بوونەوە، بوکەڵە باسی وەستا ژپیتۆی پیری بۆ ئاگرخۆر کرد. باسی ئەوەی بۆ کرد کە چۆن پاڵتۆی خۆی فرۆشتوە تا کتێبی ئەلف و بێ بۆ ئەم بکڕێ. قسەکانی بوکەڵەکە هێندەی دی ئاگر خۆریان هێنایە گریان. چونکە زۆر زۆری خەم بۆ ژپیتۆش خوارد: ئەگەر تۆم بخستایەتە کوانوەکەوە، ئەوسا بابت چەند غەمگین دەبوو، پیرە مێردی بەلەنگاز! زۆر دڵم بە حاڵی دەسوتێ!" سێ جار لەسەریەك پژمی. بوکەڵەکە گوتی: "خێرا". ئاگرخۆر گوتی: "خێر بێتەرێت!" پژمەکان نیشانەی ئەوەبوو کە ئاگر خۆر بەراستی غەمگینە. دیسانەوە پژمی. پاشان دەستی بە بەرکیدا کردو (5) لیرەی زێریدا بە بوکەڵەکە تا بیباتەوە بۆ ماڵی و گوتی کە بەم پارەیە دەتوانی کتێبێکی ئەلف و بێ بۆ خۆی و پاڵتۆیەك بۆ ژپیتۆ-ی پیر بکڕێ.

ئاگر خۆر، چوار- پێنج جاری دی پژمی و بە بوکەڵەکەی گوت: "تۆ کوڕێکی باش و ئازای! وەرە ئێرەو ماچم بکە!".

بوکەڵەکە، دەست بە جێ غاریداو وەکو سمۆرە بەردێنی ئاگرخۆردا هەڵگەڕاو ماچێکی تەڕو بڕی سەری کەپوی کردو هەزارجار بۆ ئەو پێنج لیرەیە سوپاسی کردو، خوا حافیزی کرد لە هەموو خەڵکەکەو بوکەڵەکان کە دیسان هاتبوونەوە سەر شانۆو نمایشیان دەکرد. ئەوجا لە کاتێکدا دەستەکانی لە بەرکی نابوون و زڕە زڕی بە پارەکانی گیرفانی دەکردو بەرەو ماڵ وەڕێ کەوت. ڕێوییەکی شەل و پشیلەیەکی چاو بەستراو ڕووبەڕووی دەهاتن. پشیلەکە رێك وەك کوێرەکان وابوو. ڕێوییەکە گوتی: "ڕۆژباش پینوکیو!". بوکەڵەکە پرسی: "تۆ لە کوێ ناوی من دەزانی؟". ڕێوییەکە گوتی: چونکە ژپیتوی باوکتمان بینی کە بە دواتا دەگەڕا.

قەلەندەری بەلەنگازە! بەم توف و سەرمایەو بەبێ پاڵتۆ بە دووی تۆدا دەگەڕێ؟".

بوکەڵەکە گوتی: "ئەوەندەم پارە هەیە کە بتوانم پاڵتۆیەکی تازەی بۆ بکڕم". ئەوجا لیرەکانی لە بەرکی دەرهێناو نیشانیدا. ڕێوییەکە کە چاوی بە لیرەکان کەوت. شەلی لاقی لەبیر چووەوە, پشیلەکەش کوێرییەکەی خۆی لە بیر چووەوە. ڕێوییەکە گوتی: "بێگومان برسیتە. حەز دەکەی لەگەڵ ئێمەدا بێی و لە میوانخانە نانێك بخۆیت؟".

لەم کاتەدا دەنگێك لە نێو پوش و پەلاشی قەراخ جادەکەوە هەستا: "زیك، زیك! هەرگیز باوەڕ بە قسەی ئەم نارەسەنانە مەکە!" بوکەڵەکە هەر کە گوێی لە دەنگەکە بوو، یەکسەر زانی کە ئەم دەنگە دەنگی سیسرکە قسە وێژەکەیە، بەلاَم حەزی نەدەکرد گوێ لە قسەی ئەو بگرێ. پێشنیازی دۆستە تازەکانی بە جۆرێ لە خشتەیان بردبوو، کە باوکی و پاڵتۆی تازەو کتێبی ئەلف و بێ و هەموو نەخشەکانی تری لە بیر بردەوەو بە پشیلەو ڕێوییەکەی گوت:

"وەرن با خێرا بۆ ئەوێندەر بڕۆین، منیش لەگەڵ ئێوەدا دێم!". لەگەڵ ڕێوی و پشیلەکەدا چوو بۆ میوانخانە.

ڕێوییەکە کە بابی کەروێشک و پشیلەکە، ماسی سوورەوەکراوی خواردو هەر زوو لێ بوونەوە. بوکەڵەکە هێشتا نیوەی ماکەرۆنییەکەی نەخواردبوو کە کەوتە وەنەوزدان.

کاتێ کە هەموو لە نان خواردن بوونەوە، ڕێوییەکە دەستوریدا کە دوو ژووریان بۆ ئامادە بکەن. هۆدەیەك بۆ بوکەڵەکەو یەکێکیش بۆ خۆی و پشیلەکە.

بوکەڵەکە، هەر کە چووە نێو جێگە، پاش تۆزێ خەو بردییەوە، لەخەوندا بینی کە لیرە زێڕەکانی لەسەر دارێك لە بیاباندا ڕوابوون، بەڵام هەرکە دەستی برد تا لە درەختەکەیان بکاتەوە، لە خەو ڕاپەڕی. میوانخانەچییەکە پێی گوت: "وەخت لە نیوە شەو بوریوە".

ڕێوی و پشیلەکە ڕۆیشتبوون. میوانخانەچییەکە، هەقی خواردنەکەو هۆدەکە، یەك لیرەی لە بوکەڵەکە وەرگرت.

بوکەڵەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: قەیدی نییە. هێشتا چوار لیرەی تری هەیە. بەنێو جادە تاریکەکە بەرێ کەوت بەرەو ماڵەوە، بەڵام لە پڕ دەنگی پێی لە پشتەوە بەرگوێ کەوت.

لەبەر تریفەی کزی هەیڤدا، دوو تارمایی بینی کە بە دووی ئەودا غاریان دەدا. هەردووکیان ڕۆپۆشی ڕەشیان بە خۆدا دابوو. جگە لە چاویان چ شوێنێکیان بە دەرەوە نەبوو بوکەڵەکە هەر کە ئەوانی بینی، دەستی بە غاردان کرد، ئەوانیش پێیان وەغارەوەنا، تا لە ئەنجامدا گەیشتنە بوکەڵەکەو توند دەستیان گرت و بە دەنگی نزم پێیانگوت: "ڕوت بەرەوە، پارەکانت بێنە!" بوکەڵەکە، پارەکانی خستبوونە دەمییەوە، بەڵام لە ترساندا کەوتە لەرزین و دەنگی زرەی پارەکانی بەرز بووەوە. لەم کاتەدا هەردوو ڕێگرەکە لێی هاتنە دەست. یەکێکیان کەپوی گرت و ئەوی تریان جلەکانی، بەدوو قۆڵی هێندەیان ڕاکێشا تا ناچاریان کرد کە دەمی بکاتەوە. ئەوجا دەستی توکنی پشیلەیەك کرا بە دەمیدا تا لیرەکان دەربێنێ. بوکەڵەکە بە توندی گازی لە دەستی گرت. ئەوجا خۆی لە دەستیان ڕاپسکاندو لە کاتێکدا هێشتا لیرەکان لە دەمیا بوو پێی وەغارێوەنا. دوو تارماییەکە چەند کیلومەترێك دوای کەوتن. بوکەڵەکە شەکەت بوو، و ئیدی نەیتوانی غار بدات. لەبەر ئەوە خۆی گەیاندە سەر درەختێك. ئەم کارەی گەلەك چاك بوو. چونکە دوو تارماییەکە نەیاندەتوانی بە ڕوپۆشەکانیانەوە بە درەختەکەدا سەربکەون. بەڵام هەر کۆڵیان نەدا. هەرچی دارو چیلکەی ئەو ناوە هەبوو لەبن درەختەکە کۆیان کردەوەو پاشان ئاگریان پێوەنا. کۆمەڵە چیلکەو دارەکە بەرەبەرە ئاگری گرت و گڕو شولە بەرز بووەوە. ئاگرەکە سات بە سات زیاتر دەبوو و، گەییە ژێر پێی بوکەڵەکە. بوکەڵەکە هەستی کرد کە مانەوەی لەسەر دارەکە، کارێکی بێهودەیە.

لە درەختەکە هاتە خوارێ و پێی وەغارێوەنا. دوو ڕەشپۆشەکە دوای کەوتن. لەپڕ بوکەڵەکە گەییە ڕوبارێك. ئێ، ئێستا چی بکات؟ ناچار خۆی بەدەم ئاوەکەوە داو کاتێ گەییە ئەوبەری ڕووبارەکە، دوو تارماییە ڕەشەکەش چاویان لەو کردو خۆیان بەدەم ئاوەکەوەدا،

بەڵام چونكە لەبەر روپۆشەكانیان نەیاندەتوانی بە باشی بجوڵێن، ئازای لەشیان تەڕ تەڕ بوو، وەكو مشكی نێو ئاویان لێهات. بوكەڵەكە، كە ئەوانی بەو حاڵەوە بینی، لەزگ بوو لەبەر پێكەنین بپسێ، بەڵام ئەم كەیف و شادییە زۆری نەخایاند، چونكە دوو تارماییەكە سەرەڕای ئەوەش كە ئاو لە سەراپایان دەچۆڕا، خۆیان گەیاندە كەناری رووبارەكەو كەوتنەوە دووی بوكەڵەكە. "بوكەڵەكە نەیدەزانی كە ئەو دوو تارماییە، پشیلە كوێرەكەو رێوییە شەڕ خوازەكەن". دنیا خەریك بوو روناك دەبووەوەو سپێدە لە ئەنگاوتندا بوو. بوكەڵەكە بەدەم غاردانەوە بەنێو دارستانێكدا دەچووە پێشێ. لەپڕ گەییە خانوویەكی. بچكۆلەی سپی. پەرییەكی قژشین لەبەر پەنجەرەی خانووەكەدا دانیشتبوو. بوكەڵەكە لەشەكەتیدا خەریك بوو دەمرد. لە دەرگایدا. پەرییەكە بردییە ژوورەوە. لێی پرسی: "چیت لێ قەوماوە؟". بوكەڵەكە سەر بورو واریقاتی دوو تارماییەكەی لە سیری تا پیازی، بۆ گێڕایەوە. بەسەر هاتی خۆی لە ماڵی ژپیتۆە تا ئێرە بۆ باسكرد. پەرییەكە پرسی: "باشە كوا لیرەكانت؟"

بوكەڵەكە بە مینگە مینگەوە گوتی: "من، من، گومم كردن. بەڵام راستی نەدەكردو لیرەكان لە گیرفانیدا بوون. بوكەڵەكە هەر كە ئەو درۆییەی كرد، لووتە درێژەكەی، درێژتر بوو.

پەری دیسان پرسی: ((لیرەكانت لە كوێ گوم كرد؟)) پینوكیو، دیسان بە درۆ گوتی: (لە دارستان!) هەركە درۆی دووەمی كرد، كەپوی زیاتر درێژ بوو.

پەری بە دڵسۆزییەوە گوتی: (كەواتە دەیدۆزینەوە).

بوكەڵەكە پەشۆكاو گوتی: (نە، من، من لیرەكانم قووت دان!) لەگەڵ درۆی سێیەمدا دفنی بێ ئەندازە درێژ بوو، بە رادەیەك كە ئیدی نەیدەتوانی لە دەرگاكەوە وەدەربكەوێ. پەری دەیزوانییە رەفتاری منداڵانەی بوكەڵەكە، ئەنجام وەختێ پەری هەستی كرد كەبوكەڵەكە بە سزای خۆی گەییوە، دڵی پێی سووتاو پۆلێك داركونكەرەی بانگ كرد.

داركونكەرەكان، لە پەنجەرە وازەكەوە وەژوور كەوتن و بە دەنووك بەربوونە كەپوی، هێندەیان دەنووك پێدا كێشا تا وەكو هەوەڵجاری لێهاتەوە! بوكەڵەكە بە پەری گوت: (تۆ چەند پەرییەكی میهرەبانی! ئێستا دەمەوێ بڕۆمەوە بۆ زێدی خۆم و بۆ لای بابە ژپیتۆ).

پەرییەكە گوتی: (باشە، بڕۆ، دیارە دەتەوێ ببی بە كوڕێكی باش) تا بەر دەرگا بەڕێی كردو بە ماچێك خوا حافیزی لێكرد.

–3–

بوكەڵەكە، شادو بە كەیف، بە دەم فیكە كێشانەوە وەرێ كەوت. بەدەم خەیاڵەوە گەییە دووریانێك. گوێی لە دەنگێك بوو كە دەیگوت: (تۆ پینۆكیو)یت؟ دەنگەكە، دەنگی كوترێك بوو، كۆترێكی زۆر زۆر گەورە. بوكەڵەكە وەڵامی دایەوە.

(بەڵێ خۆمم، ئەری ژپیتۆی بابمت نەدیتوە؟) کۆترەکە گوتی: (بەڵێ، لەنێو بەلەمێکی قەراخی دەریادا بینم کە بە شوێن تۆدا دەگەڕا).

بوکەڵەکە پرسی: (باشە لە کەنار زۆر دوورین؟) کۆترەکە گوتی: (هێندە دوورین ناتوانی هەر خەیاڵیشی لێ بکەیەوە. وەرە بزانم زۆر قورسی؟) بوکەڵەکە گوتی: "زۆر قورس نیم، چونکە من لە تەختەیەکی زۆر سوک دروست کراوم" کۆترەکە گوتی: "کەواتە دەتوانم تۆ بخەمە سەر پشتمو لە شەقەی باڵ بدەمو بتگەیەنمە لای بابت" ئەوسا باڵەکانی تەواو کرووە. بوکەڵەکە بەسەر باڵەکانیدا سەرکەوتو سواری پشتی بوو. کۆترەکە لە شەقەی باڵی داو ئەوەندەی نەبرد کە گەیشتە کەنارەکە.

کوترەکە تا نزیکی زەوی داکشا، بە رادەیەك لە زەوی نزیك بووەوە کە بوکەڵەکە بتوانێ خۆی هەڵداتە خوارێو دەستو لاقیشی نەشکێ، ئەو خەڵکەی کە لە کەنارەکە دابوون، هەموو هاواریان دەکردو ئاماژەیان بۆ ئەو بەلەمە چکۆلەیەی سەر ئاوەکە، دەکرد.

بوکەڵەکە پرسی: (ئەوە چییە؟) ژنێك گوتی: (پیرەمێردێکی بەلەنگاز لە نێو هۆو بەلەمەدایە، لەو بەرەوە هاتووەو عەودالی کوڕەکەیەتی، ئەوەتا گەیووەتە ناوەڕاستی دەریاکەو دەترسم بخنکێ، چونکە خەریکە لافاو هەڵدەستێ)

بوکەڵەکە، بە چاوی خۆی بینی کە چۆن شەپۆلان بەگژ بەلەمەکەدا دەچنو بەملاو بەولای دادەبەن، ئەوسا یەکێك کە زۆر لە ژپیتۆ دەچوو، لە نێو بەلەمەکەوە هەستاو کلاوەکەی بۆی هەڵتەکان. بوکەڵەکە هاواری کرد: (باوکە! من هام لێرە) ڕێك لەم ساتەدا شەپۆلێکی گەورە، بەلەمەکەی برد بە حەواداو بەلەمەکە لە نێو شەپۆلە تورەکاندا ون بوو، خەڵکی گوتیان: (ئەو پیرەمێردە بەلەنگازە دەیگوت مەلە نازانێ، تۆ بزانە چۆن گیانی خۆی لە پێناوی منداڵەکەیدا لە دەستدا).

بوکەڵەکە هاواری کرد: (من رزگاری دەکەم! هەر دەبێ رزگاری بکەم! دەبێ باوکە قەلەندەرەکەم رزگار بکەم!)و خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە. لەم کاتەدا بۆی دەرکەت کە زۆر چاك دەتوانێ مەلە بکاتو کاتێك کە بازووەکانی ماندوو دەبن، بە دەقی خۆیەوە بەسەر ئاوەکەدا دەمێنێتەوە. هەر چەندە بوکەڵەکە بە درێژایی ئەو رۆژە بە شەوەکەشییەوە، بە بەر باراندا مەلەی کرد، بەڵام نەیتوانی پیرەمێردەکە یان بەلای کەمەوە بەلەمەکەی بدۆزێتەوە. کە دنیا روناك بووەوە، لە دوورەوە دورگەیەکی جوانو دڵگیری بینی. وایدەزانی هەرگیز ناگاتە ئەو دورگەیە. بەڵام سەرەنجام گەییە ئەوێندەر. زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە بە سەلامەتی گەییوەتە دورگەکە! هێشتا هەر بە هیوا بوو کە بتوانێ وەستا ژپیتو بدۆزێتەوە. بەڵام گەڕانەکەی بێ فایدە بوو، و تەڕ تەڕ بوو بوو.

دوای ماوەیەك، هەتاو بەرز بووەوە، بوکەڵەکەی وشك کردەوە. دەیویست بزانێ لە کوێیە. بەڵام چ کەسێك لەو بەرەوە دیار نەبوو.

تەنیا ماسییەکی گەورە دیار بوو کە لە نزیکی کەنارەکەدا مەلەی دەکرد. ماسییەکی زەردباو بوو.

بوکەڵەکە، ماسییەکەی گازکردو پرسی کە ئایا لەو دورگەیەدا شوێنێك هەیە بۆ نان خواردن. ماسییەکە زۆر بە نەزاکەتەوە وەڵامی دایەوە کە: (بەڵێ) ئەوجا رێی پیشان دا کە لە کوێوە بڕوات.

بوکەڵەکە پرسی: (بێ زەحمەت پرسیارێکی دی؟ باوکی منت بە سواری بەلەمێك نەدیوە؟)

ماسییەکە گوتی: (مەخابن، جگە لە تۆو نەهەنگێکی بێ رەزا چ کەسێکی ترم نەدیتوە).

بوکەڵەکە، کە گوێی لەم قسانە بوو، ترسی لێ نیشت. پاش سوپاس و خوا حافیزی لە ماسییە زەردباوەکە، وەرێ کەوت و تا هێز لە لاقیا بوو، پێی وەغارێوە نا. چونکە دەترسا لەوەی کە نەهەنگەکە بەرەو کەنار بێت. رووی کردە ئەو شوێنەی کە ماسییەکە پێی نیشان دابوو. گەییە گوندێکی قەرەباڵغ، ئێستا دەبوو نان بخوات. دەستی بە بەرکیدا کرد، بەڵام لیرەکانی نەدۆزییەوە، ونی کردبوون! ئێستا تەگبیری چییە؟ دەیتوانی بە کارکردن یان بە دەرۆزە پارەی خواردنەکەی پەیدا بکات. بەڵام ژپیتو پێی گوتبوو: (کەسێك کە ساغڵەم بێ و نوقستان نەبێ، نابێ دەرۆزە بکات. خۆ ئەگەر ساغڵەمیش نەبێ، دەتوانێ کارێ، پیشەیەك فێر بێ و بە رەنجی شانی خۆی بژیی و بژێوی خۆی پەیدا بکات).

بوکەڵەکە، لەم بیرانەدا بوو کە لە پڕ چاوی بە پیاوێك کەوت عەرەبانەیەکی پڕ لە سێوی بە دوی خۆیدا رادەکێشا، لە کابرای پرسی: (ئەرێ شتێکم دەدەیێ بیخۆم؟).

پیاوەکە گوتی: (بەڵێ، بەڵام بە مەرجێك بێی یارمەتیم بدەیت و عەرەبانەکەم لەگەڵدا راکێشیت!) بوکەڵەکە گوتی: (چما من وڵاغم کە بار بکێشم!) و رووی وەرگێڕا. پیاوەکەش تۆزێ بۆڵاندی و بە دەنگی بەرز گوتی: (چەند مرۆڤێکی خۆپەرستە، دەیەوێ لە خۆڕایی و بە هەوەنتە دەستی بە ماڵ و نیعمەتان بگات) بەرێی خۆیدا رۆیی.

دوای تۆزێك، باغەوانێك کە سەبەتەیەك سەوزەی لەسەر شان بوو، نزیك بووەوە. بوکەڵەکە لێی پاڕایەوەو گوتی: (ئەرێ پێنج فلسم دەدەیێ نانێکی پێ بخۆم؟) باخەوانەکە گوتی: (بەڵێ، بەسەرچاو. بە مەرجێك ئەم سەبەتەیەم بۆ بێنی. ئەگەر ئەم کارەم بۆ بکەی لە بری پێنج فلس، دە فلست وێدەدەم)

بوکەڵەکە گوتی: (ئاخر سەبەتەکە قورسە! ماندوو دەبم) باغەوانەکە گوتی: (کەواتە نابێ برسیت ببێ. چونکە کەسێك کە نەیەوێ لە پێناوی بژێوی خۆیدا کار بکات، دیارە سکی تێرە) و رۆیی.

تا دەمەو ئێواریێ خەڵکێکی زۆر بە وێندەرا رەت بوون و بوکەڵە تەمەڵەکەش، داوای پارەی لە یەك بەیەکیان کردو هەموویان لە وەڵامدا گوتیان: (شەرم لە خۆت بکە، ئەم کارە قۆڕە چییە؟ بۆچی دەرۆزە دەکەی؟ چما لەشت داوەشاوە کە کار بکەیت و پارە پەیدا بکەی؟)

لە ئەنجامدا بوکەڵەکە، ئافرەتێکی گەنجی بینی کە دوو سەتڵ ئاوی پێ بوو. بوکەڵەکە لێی پاڕایەوەو گوتی: (بێ زەحمەت دەتوانی تۆزێ ئاوم بدەیتێ؟)

ئافرەتەکە گوتی: (بە مەرجێ کە یەکێك لە سەتڵەکانم بۆ بگەیەنیتە ماڵەوە).

بوکەڵەکە، لە هەوەڵەوە نەیدەویست ئەم کارە بکات، بەلاّم کە تینویّتی زۆری بۆ هێنا، دوای ئافرەتەکە کەوتو یەکێك لە سەتڵەکانی بۆ گەیاندەوە ماڵیٚ. بۆنی شیرینی و کێکی تازە ئاشخانەی ماڵی ئافرەتەکەی پڕ کردبوو. بوکەڵەکە بە ئافرەتەکەی گوت: (زۆر برسیمە!) ئافرەتەکە داینیشاندو شیویٚکی چاکی بۆ هێنا.

کاتی شیو، ئافرەتەکە سەر پۆشەکەی لەسەر خۆی لابرد، بوکەڵەکە بەسەر سامییەکی زۆرەوە ئافرەتەکەی ناسییەوەو بۆی دەرکەوت کە هەمان پەری قژشینی خۆشەویستە، هێندە خۆشحاڵ بوو، لە شادیدا دڵی پڕ بوو.

بوکەڵەکە، سەر بوری خۆی بۆ گێڕایەوە. ئەوجا گوتی: (تاقەتم لەم حاڵە چووە، لە بوکەڵە بوون وەرز بووم، دەمەویٚ مرۆڤێکی زیندوی راستەقینە بم!) پەری گوتی: (جا ئەمە ئاسانە، ئەگەر بچیتە قوتابخانەو دەرس بخوێنی و منداڵێکی ئاقڵ و سەلار بی. زۆر زوو گیانت دەکەویٚتە بەرو دەبی بەو شتەی کە ئیٚستا خۆزیای پیٚ دەخوازی. دەبی بە مرۆڤی راستەقینە).

بوکەڵەکە، کە لیٚبڕا ئەم کارە بکات. بە پەری گوت: (بە چاوان ئەم کارە دەکەم، بەلاّم تۆ پیٚت وایە باوکم بتوانیٚ بمدۆزێتەوە؟)

پەرییەکە گوتی: "ئەگەر ئەو تۆ نەدۆزێتەوە ئەوا تۆ ئەو دەدۆزیتەوە. بەلاّم ئەگەر دەتەویٚ ببی بە مرۆڤی راستەقینە، پێویستە سبەینیٚ بچیت بۆ قوتابخانەو زۆر شت فێر ببی."

-4-

سبەینێی ئەو رۆژە، بوکەڵەکە بەو کتێبەوە کە پەری پیٚی دابوو، لەگەڵ منداڵانی گوندا بۆ قوتابخانە چوو. بوکەڵەکە نەك هەر هەموو رۆژێك بۆ قوتابخانە دەچوو، بەڵکو دەرسەکانیشی بە چاکی فێر دەبوو. منداڵەکانیش خۆشیان دەویستو گاڵتەو سوعبەتو شوخییان دەگەڵ دەکرد. منداڵەکان، پەتیان بە لاقە دارینەکانییەوە دەبەستو ناچاریان دەکرد بە هەڵقون هەڵقون بڕوات. بەلاّم کە بیٚ تاقەت دەبوو، بە جۆریٚ بەر لەقەی دەدان کە ئیدی خۆیان پیٚ نەدەگیراو وازیان لیٚ دێنا. بوکەڵەکە، ئەم ژیانەی پیٚ خۆشبوو پەری جێی دایکی بۆ گرتبووەوە. ئەویش وەزیفەو ئەرکی قوتابخانەی بە باشی ئەنجام دەدا. تەنیا یەك عەیبی هەبوو ئەویش ئەوە بوو کە دۆستایەتی لەگەڵ چەند منداڵێکی ناجسنی خراپدا گرتبوو کە هەمیشە لە قوتابخانە هەڵدەهاتن.

رۆژێك چەند منداڵێك لەمانە هاتن و گوتیان: "بوکەڵە، تۆ تا ئیٚستا نەهەنگت دیتوە" وەرە با بڕۆین سەیری نەهەنگ بکەین دەڵێن نەهەنگێك هاتۆتە نزیکی کەنار!".

شنە بایەکی هێدی لە دەریاوە دەهات. کاتێك بوکەڵەکە دەنگێکی هێواشی گویٚ لیٚ بوو کە دەیگوت: "زیك، زیك، زیك، ئاگاداربە! لە دۆستی بەدو خراپ دوور بکەوە؟ لە بیرت بیٚ کە

چ قەولێکت بە پەری دا". ناچار بۆ ئەوەی ئەم دەنگ نەژنەوێ، بە دەست هەردوو گوێی خۆی گرت.

بوکەڵەکە، لە هاوڕێکانی پرسی: "ئەدی قوتابخانە؟"

هاوڕێکانی گوتیان: "ئاه. با ڕۆژێك نەچی بۆ قوتابخانە! چونکە لەوەیە جارێکی دی ڕێك نەکەوێ نەهەنگ ببینی!". بوکەڵەکە گوتی: "کەواتە با بڕۆین!" و خۆی یەکەم کەس بوو کە گەیشتە کەنارەکە، بەڵام کە گەیشتنە ئەوێندەر، نە نەهەنگی لێ بوو، و نە هیچ. تومەز ئەو هاوڕێ خراپانە، بوکەڵەکەیان خەڵەتاند بوو. دوای تۆزێك لێیان بوو بە شەڕ. یەکێك لە منداڵەکان کتێبە ئەستوورو قورسەکەی "ژمارە"ی سرەواندە بوکەڵەی بێ تاوان. بەڵام کتێبەکە سەری کردو بەر سەری کوڕێکی دی کەوت. کوڕەکە وەکو جەنازە لەسەر زەوییەکە تەخت بوو. ڕێك لەو کاتەدا پاسەوانان گەیینە سەریو بوکەڵەی بێ تاوانیان گرت کە بە دیارییەوە وەستا بوو. بوکەڵەکە لە دەستیان هەڵات. ئەوانیش سەگەکەی خۆیان تێ بەردا. بوکەڵەکە گەییە سەر تاوێرێك و لەوێوە خۆی هەڵدایە دەریاکەوە. سەگەکەش خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە، بەڵام کەوتە شڵپە شڵپ و لەزگ بوو بخنکێ. سەگەکە هاواری کرد: "بوکەڵە گیان، رزگارم بکە!".

بوکەڵە وەڵامی دایەوە: "بۆ خۆت بخنکێ، من هەقم چییە! خۆت هەڵنەدایەتە ئاوەکەوە!". بەڵام پینوکیو، بوکەڵەیەکی دڵناسك بوو. حەزی نەدەکرد سەگەکە بە بەرچاوییەوە بخنکێ. بۆیە گوتی: "ئەگەر ڕزگارت بکەم قەولم دەدەیێ کە وازم لێ بێنی؟" سەگەکە لەو کاتەدا کە لە دوا هەناسەدا بوو، بەڵێنیدا. بوکەڵەکە بە مەلە شوێنی کەوت، کلکی گرتو بە سەلامەتی لە دەریاکەی دەرهێنا، و ئەوجا خوا حافیزی لێکرد. سەگەکە گوتی: "خوا حافیز. مەمنون کە ڕزگارت کردم. خۆزگە ڕۆژێك بهاتایەو بم توانیایە ئەم چاکەیەت بدەمەوە. من قەت ئەم چاکەو دڵسۆزییە لە بیر ناکەم. بوکەڵەکە،دیسان خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە. بەڵام هەستی کرد کە کەتۆتە تۆڕێکی ماسی گرتنەوە. بەڕاستیش وابوو. خۆی لە نێو تۆڕێکی گەورەی پڕ لە ماسیدا بینییەوە. زۆری هەوڵدا خۆی لە تۆڕەکە دەرباز بکات، بەڵام بێفایدە بوو. تەنیا ئەوەندە حاڵی بوو کە ماسیگرێك لە ئاوەکەی دەرکێشاو بۆ ئەشکەوتێکی نێو شاخانی برد.

ماسیگرەکە، تاوەیەکی لەسەر کوانوو دانابوو.

بۆنی ئەو خواردنەی کە لە نێو تاوەکەدا سوور دەبووەوە، ئاوی زایاندە دەمی بوکەڵەکە. بەڵام پاشان کابرای ماسی گر، دەستی بە تۆڕەکەدا کردو ماسییەکی گەورەی دەرکێشاو بە عاردیدا دا.

ئەمجارەش دەستی بردو ماسییەکی گەورەتری دەرهێناو بەم جۆرە چەندین جار ئەم کارەی دووبارە کردەوەو هەموو جارێکیش ماسییەکەی بە عاردی دا دەدا. بوکەڵەکە لە ترساندالەرزی لێهاتبوو. ئاقیبەت کابرای ماسیگر دەستی بە تۆڕەکەدا کردو بوکەڵەکەی دەرکێشایە دەرێ.

بەڵام کە چاوی بە بوکەڵە دارینەکە کەوت، بە سەرسامی لە خۆی پرسی: "ئەمە چ جۆرە ماسییەکە!" بوکەڵەکە، بە ترسەوە هاواری کرد: "من ماسی نیم. لە زەوی دام بنێ،باوەڕ بکە من ماسی نیم.". بەڵام کابرای ماسیگر، ئەوی وەکو ماسییەکانی دی فڕێ نەدایە سەر زەوی! بەڵکە دەیویست بیخاتە تاوەکەوە کە لە پڕ ئەو سەگەی کە کاتی خۆی بوکەڵەکە رزگاری کردبوو، پەیدا بوو. بەدەم بۆن کردنەوە خۆی وە ئەشکەوتەکەدا کرد. بوکەڵەکە هەر کە چاوی بە سەگەکە کەوت هاواری کرد: "هاوار هاوار!" سەگەکە هەر کە گوێی لە دەنگی بوکەڵەکە بوو. پەلاماری داو لەگەڵ خۆیدا بردییە دەرەوە. کاتێ کە بە ئەندازەی پێویست لە ئەشکەوتە کە دوور کەوتنەوە، بوکەڵەکەی لە زەوی داناو دەستی گوشیو دوعا خوازی لێکرد. بوکەڵەکە پێی گوت: "ئێمە پێویستە هەمیشە یارمەتی یەکدی بدەین!". سەگەکەش بەمە قاییل بوو، و بە ڕێی خۆیدا ڕۆیی. بوکەڵەکە بە تەنیا بوو، لە کەنارەکەدا پیرەمێردێکی بینیو لێی پرسی: "هیچ دەربارەی ئەو کوڕە دەزانی کە لە شەڕەکەی ئەم بەیانییەدا برینداربوو بوو؟" پیرەمێردەکە گوتی: "حاڵی باشەو چۆتەوە بۆ ماڵی خۆیان. دەڵێن گوایە کوڕێك بە نێوی پینوکیو، کتێبێکی بەسەریدا داوە".

بوکەڵەکە گوتی: "نەخێر وانییە. من پینوکیو باش دەناسم. پینوکیو منداڵێکی سەلارە. دەچێتە قوتابخانە. بە قسەی بابی دەکات. قەت لەم کارە خراپانە ناکات". هەر کە ئەم درۆیە لە دەمی پینوکیو هاتە دەرێ، یەکسەر لوتی درێژ بوو.

کە زانی درۆکەی چی بە دوادا هات، یەکسەر ژێوان بووەوەو گوتی: "باوەڕ بەو قسانە مەکە کە بۆم کردیت! پینوکیو کوڕێکی خراوە، تەمەڵە، بە کەڵکی هیچ کارێك نایەت" کە پینوکیو ئەم قسە ڕاستانەی گوت ئیدی کەپوی بچوك بووەوەو چووەوە دۆخی جارانی خۆی.

ئەوجا لە پیرەمێردەکە جیا بووەوەو بە ڕێی خۆیدا ڕۆیی.

بوو بە شەو، باران دەباری. کاتێ بوکەڵەکە گەییە ماڵی پەری دڵسۆزو میهرەبان، زۆری سەرمابوو بوو. پاش ئەوەی لە دەرکەیدا، ناچار بوو، چاوەڕوانی ئەو هێلکە شەیتانۆکەیە بکات کە خزمەتکاری پەری بوو, تا لە قاڵدرمەکان بێتە خوارەوەو دەرگا بکاتەوە. نزیکی بەیانی، کە تاقەتی چوو، تا هێز لە لاقیدا بوو، لە قەیەکی بە دەرکەکەدا کێشا. پێی بە دەرگاکەدا چوو و گیربوو. ناچار بوو تاکو بەیانی بەو حاڵەوە بمێنێتەوە! کە ڕۆژ بووەوە، ئیدی ئەو ئەو بوکەڵە پەشیمانە بوو کە هەمیشە لەسەر قاوەڵتی، گوێی لە ئامۆژگارییەکانی پەری دەگرتو بەڵێنی دەدا کە ئیدی لاساریو بێعاری نەکاتو لەوە بە دواوە ببێ بە کوڕێکی باشتر!.

-5-

بوکەڵەکە، ئەمجارەیان وادەو بەڵێنی خۆی بردە سەر، کاتێك کە ساڵی خوێندن تەواو بوو، ئەو باشترینو بەرزترین نمرەی وەرگرتبوو. پەری قژشین، ئەوەندە خۆشحاڵ بوو، و گوتی:

"سـبەینێ، گـەورەترین ئـاواتی تـۆ دێتـە دیو گیانـت دەکەوتێتـە بـەرو دەبـی بـە مرۆڤێکـی ماقوڵ!". پینوکیو، بەم قسەیە گەلەك كەیف خۆش بوو!

بـەڵام رۆژێـك، رووداوێك قەوما کـە هـەموو شـتێکی تێکدا: پینوکیـو، هـاو پـۆلێکی هـەبوو کەقەت دەرسەکانی فێر نەدەبوو. منداڵان ئەم کوڕەیان بە "پلێتە مۆم: گاز دەکرد، چونکە زۆر باریـك‌و بنـێس بـوو. ئـەو رۆژە پینوکیـو پلێتـە مـۆمی لـە نێـو دەوەنـە جـاڕی کـەنار جادەکـەدا دۆزییەوەو بۆی دەرکەوت کە نەخشەو پلانی هەڵاتن دادەڕێژێ.

پلێتە مۆم دەمی وەپـەنا گـوێی بوکەڵەکە نـاو گـوتی: "ئـەو شـوێنەی کـە مـن دەمـەوێ بـۆی بچم قوتابخانەی لێ نییە لـەم سـەری ساڵەوە تـا ئـەو سـەری سـاڵ هـەمووی پشـووە. پینوکیـو وەرە با پێکەوە بڕۆین!".

هەر چەندە بوکەڵەکە دەیویست، کوڕێکی بـاش بـێ‌و لاسـاری‌و سەرپێچـی نـەکات، کەچـی ئەم قسانە کاریان تێکردو پرسی: "ئەو شوێنە کوێیە؟". پلێتە مۆم بە مکوڕی گـوتی: "وەرەو بە چاوی خۆت بیدینە!".

دنیـا خـەریك بـوو تاریـك دەبـوو.بوکەڵەکـە تروسـکاییەکی کـزی بـینی. تروسـکاییەکە، تروسکایی سیسرکە قسەوێژەکە بوو کـە دەیگـوت: "پینوکیـو، بگـەڕێوە!". بـەڵام لـەو کاتـەدا گالیسـکەیەك کـە شـەش جـووت ولاغـی لـە ژێـردا بـوو، گەییـە ئەوێنـدەر. بوکەڵەکـە گـوتی: "پێویستە بۆ ماڵ بگەرێمەوە". بەڵام پێی رێی دانەگرت. پلێتـە مۆم پاڕایـەوە: "راوەسـتە، تـا من بەڕێ دەکەی. بزانە چەند منداڵ بۆ ئەوێندەر دەڕۆن!". گالیسکەچییەکە گوتی: "سـوارب‌ە، سـواربە کـوڕم، سـواربە!" بـەڵام جێـی بوکەڵەکـە نەبووەوە،تـەنیا پلێتـە مۆم تـوانی بچێتە نێـو گالیسکەکەوە. پینوکیو، لە حاڵێکدا کە خۆیشی سەرسام بوو، هاواری کرد: "سـەبرکە!"و لـە چـاوتروکانێکدا خـۆی هەڵدایـە سـەر پشـتی یـەکێك لـە ولاغـەکان. کـە گالیسـکەکە دەڕۆیـی، بوکەڵەکە لەبەر خۆیەوە تێدە فکری: "چەند باشە. رۆژ تا ئێواریێ هـەر گەمـەو یارییـە! چونکە قوتابخانە نەبێ، ئیدی چوونە قوتابخانە چییە؟!".

لـە پـڕ ولاخەکـە هەسـتایە سـەر پاشـوو بوکەڵەکـەی بـە عاردیـدادا. پینوکیـو، خێـرا هەستایەوەو خۆی هەڵدایەوە سەر پشتی ولاخەکە، بەڵام ئەمجارەیان ولاخەکە تەنیا ئـاوڕێکی دایـەوەو ورتـە ورتێکـی کـرد: "ئـەی گـەجی بەلـەنگاز، بێگومـان کەللـەت لـە تەختـە دروسـت کراوەو پوکە!". بوکەڵەکە زۆری پـێ سـەیر بـوو کـە بینی گـوێ درێژەکە پێڵاوی لە پێدایـەو فرمێسك لە چاوانی قەتیس ماوە. زۆر سـەیر بـوو! ئـەوان زۆر خێـرا دەڕۆیشتن‌و زۆری نـەبرد کە رۆژ بووەوەو گەیشتە جێیەك کە نووسراوێك بەسـەر دەروازەکەیـەوە بـوو: "سـەر زەمینـی تەمەڵان!".

ئـەوان گەیبوونـە جێـی مەبەسـت! کـاری لەمـەودوایان بـریتی بـوو لـە دیـتنی شـانۆنامەو خواردنی شیرینی‌و وازی کردن. هەر یەکێکیان بەیداخێکی بە دەستەوە بوو کە ئەمەی لەسەر نووسرابوو: "قوتابخانە نا، وازی‌و تەمەڵی ئا."

ئەوانـە قـەت دەسـتو دەموچـاویان نەدەشـت، سەریشـیان هـەرگیز شـانە نـەدەکردو زۆر کەمیش دەخەوتن.

رۆژان تێپەڕین، بوکەڵەکە لە ئیسراحەت بێ تاقەت بوو بوو. رۆژێـك دەمـەو ئێـوارە وێنـەی خۆی لە گۆلێکدا بینی و زۆری پێ سەیر بوو کە بینی گوێچکەی وەکـو هـی کـەر درێـژ بـووە! زۆر شکایەوەو شەرمی بە خۆی هاتو پارچەیەکی بە دەوری سـەریدا بەست. رۆژێك پاشتر دیسان روانییە گوێچکەکانی، بەڵێ وەکو گوێی کەر درێژ بوو بوون! سەیری کرد پلێتـە مـۆم-یش گوێچکەکانی وەکو هـی کـەر درێـژ بـوون. ئـەویش پارچە پەڕۆیـەکی لەسـەرییەوە ئالانـد بوو. پلێتە مۆم لە بوکەڵەکەی پرسی: "ئەوە چییە لەسەرتەوە ئالاندووە؟". بوکەڵەکە گوتی: "سەرم ئاوساوە، تۆ ئامادەی ئەو پارچە پەڕۆیە لەسەرت بکەیەوە؟"

پلێتە مۆم بە دوو دڵییەوە گوتی: "تۆ یەکـەمجار لای بـدە تـا منـیش لای بـدەم". دەسـتیان بۆ سەریان بردو گوتیان: "یاڵڵا با هەردوکمان پێکەوە!". بوکەڵەکە هـەر کـە گـوێی هاوڕێکـەی بینی، لە قاقای پێکەنینیدا. پلێتـە مـۆم-ش کـە چـاوی بـە گـوێی بوکەڵەکـە کـەوت لـەو زیـاترو قایمتر پێکەنی.

کـاتێ کـە سـەرقاڵی گاڵتـە کـردن بـوون بـە یەکـدی، شـتێکی سـەیرتریان بەرچـاو کـەوت. ئەویش ئەوەبوو کە لە جیاتی پێ سمیان هەبوو، و کلکیان لێ رواوبوو. دەمیان هەڵێنا تا قسـە بکەن، کەچی لە بری قسە، کەوتنە زەڕین. بوکەڵەکە ویستی بڵێ: "من نامـەوێ ببـم بـە کـەر"، بەڵام سەدای زەڕین لە دەمییەوە دەرهاتو نەیدەتوانی لەسەر پێیەکانی بوەستێو ناچار بـوو بە چوار چنگۆڵە بڕوات. لە پڕ سەرنجیان لەسەر شتێکی تازەتر گیرسایەوە. گالیسکەچییەکە بە دوو لغاوەوە لەوێندەر ئامادە بوو. لغاوەکانی لە دەمیان کرد. ئـەوجا رنـەکێکی لـە گیرفـانی دەرهێناو هێندەی بە پشتیاندا گێڕا تا تەواو رەونەقیان هەڵهێنایەوە. ئەوجا بردنـی بـۆ بـازاڕ، پلێتە مۆمی بە کابرایەکی وەرزێرو پینوکیوی بە کابرایەکی سێرکباز فرۆشت.

خاوەنەکـەی پینوکیـو، کـە فێڵـەکانی نمایشـی فێـری حـەیوانات دەکـرد، پینوکیـوی بـردە تەویڵەیەکـەوەو ئاخوڕەکـەی پـڕ لـە وێنجـە کـرد. پینوکیـو قـەپێکی خـوارد، بـەڵام ئیشـتیای نەچووە سەریو دڵی نەیبرد، بەڵام کە رۆژ بووەوە، چونکە زۆری برسی بـوو، زۆری کـەیف بـە خواردنی جۆ هات. دوای تۆزێك دەستی بە مەشقکردنەکەی کرد. کابرای سێرکباز گوتی: "کەرێکی زرینگە. دەتوانم فێری بکەم کە چۆنی بەنێو ئەڵقەکەدا باز بدات".

پینوکیو، هەر بە خەیاڵیشیدا نەدەهات کە رۆژی بەم رۆژگارە بکات. هەمیشـە برسـی بـوو، چونکە تا مەشقەکانی تـەواو نەکردبایـە هـیچ خواردنێکیـان نـەدەدایێ. بـۆ خـۆی بـوو بـوو بـە جاشەکەرێك لەو گۆڕەی. ئەنجام وەختێك دەورەی مەشـقکردنی تـەواو بـوو، ئامـادەی نمـایش بوو، خەڵکی لە مەیدانی سێرکەکە خڕبوونەوە، هەموو ئامادە بـوو بـوون تـا "پینوکیـو، کـەری ناسراو!" لە "یەکەمین نمایشدا" تەماشا بکەن.

گلۆپەکان داگیرسابوونو دەنگی ئاهەنگ لە هەموو لایەکەوە دەهات. پینوکیـو، چاکەتێکـی کورتی سوری لەبەر کردبوو. ملوانکەیەکی گوڵیان لـە ملـی کردبـوو. سـێرکبازەکە، پینوکیـوی

هێنایە سەر شانۆ، هەر کە گەیشتە ناوەندی شانۆکە، دەنگی هاڕەی چەپڵە بەرز بووەوە، ئەویش چەند جارێك سەری ڕێزی بۆ جەماوەرەکە دانەواند. ئەوجا قامچییەکی بە ئەژنۆی کەرە بچکۆلەکەدا کێشاو دەستووری دایێ: "کڕنۆش بەرە!" پینوکیو، هەردوو چۆکی ئەوەندە نوشتاندنەوە تا گەییە سەر زەوی.

کاتێ کە سێرکبازەکە فەرمانیدا: "هەستە ئێستا کاتی حەرەکەتە". ئەو لە جێی خۆی هەستاو هەوەڵجار کەوتە ڕێ، پاشان کەوتە لۆقەو دواتر کەوتە چوار ناڵە. لەو کاتەدا کە بە چوار ناڵە بە دەوری سێرکەکەدا دەسڕایەوە، سێرکبازەکە گوللەیەکی تەقاندو، پینوکیو کەوت و وای نواند کە مردووە. ئەمە یەکێك بوو لەو فێڵانەی کەفێریان کردبوو.

کاتێ کە هەستایەوە، لە ناو ئاپۆرای خەڵکەکەدا، پەری قژشینی بینی. پەری زۆر خەمین دەهاتە بەرچاو. پینوکیو، ویستی بانگی بکات و خۆی پێ بناسێنێتەوە، بەڵام تەنیا دەنگی زەڕە زەڕ لە دەمییەوە دەرهات.

ئامادەبوان پێکەنین، بەڵام کابرای سێرکباز قامچییەکی بە دەمیا کێشا. چینوکیو، لە تاو ئازار دەستی بە گریان کردو روندك بەری چاوانی گرت.کاتێ بەری چاوی روناك بووەوە، سەیری کرد پەری ڕۆیشت بوو!

ئەمجارەیان، ئاهەنگێکی تایبەتی دەستی پێکرد.

پینوکیو، دەبوایە لەم قوناغەدا، بە نێو ئەڵقەکەدا باز بدات! دەستی کرد بە غاردان بە دەوری شانۆکەدا، بۆ ئەوەی گوڕ بسەنێتەوە. بەڵام سێرکبازەکە، ئەڵقەکەی زۆر لە بەرزی گرتبوو، کەرە چکۆلە کە نەیتوانی بە ناوی دا بازا بدات و بە ژێر ئەڵقەکەدا تێپەڕی. چەندین جار ئەمەی دوبارە کردەوەو هەر نەیتوانی –ئامادە بووان– پێدەکەنین و چەپڵەیان لێدەداو وایاندەزانی سوعبەت و گاڵتە دەکات. بەڵام کابرای سێرکباز، بە تورەیی قامچییەکەی لێ بادا.

پینوکیو، دەیزانی کە ئەگەر بە نێو ئەڵقەکەدا باز نەدات، ئەوا چاوی بە شیو ناکەوێت. جارێکی دیکەش بە دەوری شانۆکەدا سوڕایەوە، لاقەکانی هێنانەوە یەك و خۆی بۆ بازدان ئامادەکرد، بەڵام سمێکی لە ئەڵقە ئاسنەکە گیر بوو، و بەسەر سەرا کەوت. کابرای سێرکباز کە چاوی بە زامی قاچی کەوت ئیدی لێبڕا وازی لێ بێنێ، بۆیە داوای لە مەیتەرەکە کرد کە پینوکیو ببات.

ڕۆژێکی دی، مەیتەرەکە، پینوکیوی فرۆشت. ئەو پیاوەی کە پینوکیوی کڕی لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئویف کە پێستی ئەستورە، خۆیەتی، ئەمە ڕێك ئەو شتەیە کە بۆ تەپڵی تیپی مۆسیقای گوند پێویستمە". ئەوجا لە خۆی پرسی: "ئێستا ئاسانترین ڕێ کامەیە، چی بکەم باشە؟".

بڕیاریدا، بەر لەوەی کە پێستی پینوکیو بگروێ، لە ئاودا نقومی بکات، بۆیە بەرەو کەناری برد، پینوکیوی بەلەنگازو ژار بە پێی ترساو و لەرزاوەوە بە دوی کابرا کەوت، کاتێ گەیشتنە کەنار، پەتێکی بەلاقییەوە بەست و سەرێکی پەتەکەی بەدەستی خۆیەوە گرت.

ئـەوجا بـەردێکی بـە پەتەکـەی ملـی پینوکیـو–وە بەسـت و لەسـەر تاوێرەکـەوە پینوکیـوی هەڵداشتە خوارێ.

لە کاتێکدا کەرە چکۆلەکە، بەرەو قولایی دەریا ڕۆدەچوو، و هـەوڵی دەدا هەناسـە بدات. لـەپڕو بـۆ سـاتەوەختێك وای هاتـە بەرچـاو کـە "پـەری" داردەسـتە ئەفسـوناوییەکەی بەسـەر سـەری ئەمـەوە تـەکان دەدات. ئـەوجا تـاریکی چـوار دەوری پینوکیـو–ی گـرت و.. هـەر لەگـەڵ ئەمەدا، هەستی بەوەش کرد کە عەینی منداڵە دارینەیەك، بۆ سەرێی ئاوەکە سەر دەکەوێت.

ئەوجا بەوپەڕی سەرسامی بۆی دەرکەوت کە دووبارە بوەتـەوە بـە بوکەڵەکـەی جاران! زۆر سەیر بوو. هێندەی پێ عاجباتی بوو باوەڕی نەدەکرد کە ڕزگاری بووبێ. خاوەنەکەشـی ئـەم حەقیقەتەی پێ قبوڵ نەدەکرا. تـۆ بیهێنـە بەرچـاوی خـۆت کابرایـەك لـە بـری کـەرێکی تۆپیـو، چاوی بە بووکەڵەیەك کەوتبێ، چـەند حەپەسـاوە! هـەوەڵجار وایزانـی خـەون دەبینـێ. ئـەوجا پینوکیو پێکەنی و گوتی: "من هەمان جاشولکەکەی لەمەڕ تۆم! پەتەکە لە لاقم بکەوە تا بـۆت بگێڕمـەوە." کـابرا پەتەکـەی کـردەوەو بوکەڵەکـە، سـەربوردەی خـۆی بـۆ گێڕایـەوە، کـابرا پرسی: "باشە ئێستا لە ئاوەکەدا چی ڕوویدا، خۆ کـاتێ خستمیتە ئاوەکەوە، تـۆ جاشـەکەر بووی، کەچی ئێستا وا لە ئاوەکە هاتوویە دەرێ و بووی بە بوکەڵە".

بوکەڵەکە گوتی: "هەوڵدەدەم هەموو شتەکان وەبیر خۆم بێنمـەوەو بـۆتی بـاس بکـەم: ڕێـك بەر لەوەی دەوروبەرم تاریك بـێ، کۆمـەڵێك ماسـیم بیـنی کـە بـەرەو لای مـن دەهـاتن. بێگومـان پەرییـە دڵسـۆزەکە نـاردبوونی. دەسـتیان بـە خـواردنی مـن کـرد. لـە ماوەیـەکی کەمـدا گوێچکەکانیان لـە کـۆڵ کردمـەوە. ئـەوجا کلکم، هێنـدەیان لـە پێسـت و گۆشـتەکەم خـوارد تـا گەیاندیانە سەر تەختەکە. ئەوجا ماندوو بوون، هەندێ دەمیان لە تەختەکـە کوتـا، ئـەوسا بـێ تاقەت بوون و دوور کەوتنەوە. بۆیە کاتێك کە منت لە ئاوەکە دەرکێشا، لەبری جاشـولکەیەك، بوکەڵەکەیەکت بینی". کابرا وەختێ بۆ دەرکەوت کە پارەکـەی بـە خـۆڕایی چـووە، زۆر تـوڕە بوو. گەڤۆ هەڕەشەی لە بوکەڵەکە کرد کە بۆ بازاڕی دەبات و وەکو پارچە تەختەیەك یان وەکو چیلەکەی سـوتاندن دەیفرۆشـێت، بـەڵام بوکەڵەکـە بـە خۆشـییەوە پێکـەنی و خـۆی هەڵدایـە ئاوەکەوەو بە مەلە کردن دووکەوتەوە.



بوکەڵەکـە، لـە دڵـی خۆیـدا بـە تـەما بـوو ژیپیتـۆی پـیر بدۆزێتـەوە. هـەر بـەم هیوایـەوە بـە درێژایی ڕۆژەکە مەلەی کرد. نزیکی زەردەپەڕ شتێکی بیـنی کـە لـە دوورەوە لـە دوورگەیـەکی چکۆڵە یان تاوێرێکی گـەورە دەچـوو، و بـەدەم شـەپۆلانەوە بـە ئـارامی هەڵدەکشـاو دادەکشـا، بـەڵام لـە نکـاودا تاوێرەکـە وەکـو ئەشـکەوتێك دەمـی کـردەوەو وەکـو گێـژەنگێکی گـەورە بوکەڵەکەی هەڵلوشی. بوکەڵەکە، ناچار لەگەڵ دەستەیەك ماسـی سـاردیندا، یەکراسـت بـەرەو بنـەبانی ئەشـکەوتەکە کشـا. ئـەوجا ڕووداوێکـی سـامناك قـەوما! هەرکـە ئـەو وەژوور کـەوت،

زارکی ئەشکەوتەکە هاتەوە یەك و داخرا. تومەز ئەمە ئەشکەوت نەبوو، بەڵکو دەمی نەهەنگ بوو! هێندە تاریك بوو هێندە تاریك بوو کە بوکەڵەکە هیچی نەدەبینی. ئەم رووداوە، لە تێکرای ئەم رووداوانەی کە تا ئێستا بەسەری هاتبوون، سامناکتر دەهاتە بەرچاو.

دەنگێك لە پشتییەوە گوتی: "مەترسە!".

خاوەنی دەنگەکە، ماسییەکی گەورە بوو: "ئایا دەزانی ئەم نەفرەجایە ددانی نییە" خۆ ئەگەر ددانیشی هەبێ، گرینگ نییە!".

راست بوو! پاشان پینوکیو تووشی شتێکی سەیر بوو! لە دوورەوە، لە ناو سکی نەهەنگەکەدا، تروسکاییەك بەدی دەکرا، رووناکی لاوازی مۆمێك بوو کە بۆ رێ دۆزینەوە لە تاریکیدا گەلەك بەسوود بوو. پینوکیو، بە نێو گەرووی نەهەنگەکەدا بەرەو رۆشناییەکە داگەڕاو سەیری کرد مۆمەکە کراوە بە بوتڵێکداو بوتڵێکیش لەسەر کورسی بەلەمێك دانراوە. پیرەمێردێکی کورتە بنەش لە نێو بەلەمەکەدا دانیشتبوو، ئەو پیرەمێردە، ژپیتۆ بوو. زۆر غەمگین دەهاتە بەرچاو. پینوکیو هاواری کرد: "بابە ژپیتو!"و هەردوو دەستی لە قەدی پیرەمێرەکە ئالاند:

"ئەمە خۆتی!"

ژپیتو، بەدەم چاوتروکاندنەوە گوتی: "تۆ پینوکیو-ی منی؟"و دەمو چاوی بوکەڵەکەی ماچ باران کرد. بە دیتنی یەکدی هێندە خۆشحاڵ بوون هێندە خۆشحاڵ بوون کە دەستیان بە گریان کرد. پینوکیو گوتی: "ئۆی، باوکە گیان، تۆ چەند پیاوێکی باشیت و منیش چەند کوڕێکی خراپ بووم!، بەلام خۆ لێم تورەو نارەحەت نیت، وا نییە؟ ئەگەر دەزانی چ بەلایەکم بەسەردا هات!". ئەوسا هەرچییەکی بەسەردا هاتبوو، لە نوکەوە بۆی گێڕایەوە.

– "باوکە، من تۆم لە بەلەمە چکۆلەکەتدا بینی و دەستم لێت هەڵتەکاند"

ژپینو گوتی: "بەڵێ، منیش دەستم بۆ هەڵبڕیت، بەلام بایەکە هێندە توند بوو، نەمتوانی بەلەمەکە بەرەو کەنار بگێڕمەوە. ئەوجا شەپۆلێکی بەرزو گەورە، بەلەمەکەی هەڵداو من کەوتمە ئاوەکەوە، ئەم نەهەنگە سەیرەم تووش بوو، و قووتی دام. جا وەرە حیسابی خۆت بکە پینوکیو، من نزیکەی دوو ساڵە لەم شوێنەدا زیندانیم!" بوکەڵەکە هاواری کرد: "ئەدی چۆن ماویت" پیرەمێردەکە ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی کە نەهەنگەکە، باری کەشتییەکی غەرق بووی قووت دابوو.

بەلام ئەو چۆن چۆنی خواردنی قوتو، مۆمو شەرابو تەنانەت چەند پەتۆیەکی بۆ خۆی پەیدا کردبوو، مەعلوم نەبوو! ئێستا ئیدی ژپیتو هیچی نەبوو کە بیخوات، جگە لەو ماسییە زنوانەی کە نەهەنگەکە بەزندویتی قووتی دەدان و کاتێك کە ئەم لەتە مۆمە دەکوژایەوەو لەبەین دەچوو، ئەوان لە تاریکیدا غەرق دەبوون، بوکەڵەکە گوتی: "کەواتە نابێ کاتەکە بە فیرۆ بدەین. دەبێ لە هەمان شوێنەوە کە وەژوور کەوتووین، بچینە دەرێ". ژپیتو-ی پیر نالاندی: "قەیدی نییە، کوڕەکەم خۆ من ناتوانم مەلە بکەم". بوکەڵەکە گوتی: "قەیدی نییە، من دەتوانم بە ئەندازەی دوو کەس مەلە بکەم. تۆ بە دوای خۆمدا رادەکێشم".

ماسییە گەورەکە گوتی: "راستە، من دەزانم. هەر جارێ کە ئەم نەفرەجایە دەریاییە دەمی دەکاتەوەو بە کراوەیی رای دەگرێ، پۆلێك ماسی ساردین یان شتی دی لەم رێیەوە دێنە ناو دەمییەوە. دەبێ چاوەڕوانی دەرفەت بین!".

هەر کە نەهەنگەکە کەوتە کردنەوەی دەمی، بوکەڵەکە گوتی: "ئێستا بە دووی مندا وەرن!. شەپۆلێکی گەورە هاتە دەمی نەهەنگەکەوەو هەر کە ویستی بەرەو پاش بگەڕێتەوە، بوکەڵەکە زۆر بەلەز کەوتە مەلەکردن. ئەو ژپیتۆی پیری خستبووە سەر پشتی خۆیو ماسییە گەورەکەش بە دوایو ئەوەوە بوو. بەر لەوەی ئەو شەویلاگە زلانە دووبارە بێنەوە یەكو دابخرێنەوە، بوکەڵەکە، کە ژپیتۆی پیری بەسەر پشتەوە بوو، بە هەموو توانایەوە دەستی بە مەلە کرد. دڵی بوکەڵەکە بە توندیو ترسەوە دەستی بەلێدان کرد، بەڵام توانی لە کاتی خۆیدا لە دەمی نەهەنگەکە وەدەرکەوێ تا شەوێ هەر مەلەیان کرد. شەویشیان هەر بە مەلەکردن بردەسەر. وا دەهاتە بەرچاو کە هەرگیز نەتوانن بگەنەوە کەنار. بوکەڵەکە خەریك بوو نەترەی بەردەدا.

ئەنجام، ماسییەکە هاتە قسان: "باشە ئێوە بۆچی هەردووکتان نایەنە سەر پشتی من؟ من هەرگیز ماندوو نابم!". ئەوسا هەردووکیان سواری پشتی ماسییەکە بوون. کە رۆژ بووەوە، بە ئاسانی گەییشتنە وشکایی. کاتێ گەیشتنە کەنار، بوکەڵەکە پێی نایە قەراخەکەو یارمەتی ژپیتویدا کە ئەویش بێتە وشکاییەکە. ئەوجا تکای لە ماسییەکە کرد کە جار جار سەریان بدات. بەڵام ماسییەکە نەیدەتوانی تکای ئەوان قەبوڵ بکات. چونکە نەیدەتوانی لە ئاو بچێتە دەرێ.

ئەوجا خوا حافیزیان لەیەکدی کردو ژپیتوو و بوکەڵەکە ملی رێیان گرت.

ژپیتو، هێندە ماندوو بوو کە خۆی بە پێوە نەدەگرت. بوکەڵەکە، کە ئەمەی بینی گوتی: "باوکە، خۆت بە منەوە بگرە. هەرکە گەیشتینەماڵێك, دەچم لێیان دەپاڕێمەوە کە تۆزێ خواردنمان بدەنێو شوێنێك بۆ حەوانەوەی ئەمشەومان پەیدا دەکەم!".

ئەمان هێشتا رێیەکی زۆریان نەبڕی بوو کە دیتیان پشیلەو رێوی ناجسن لە قەراخ جادەکەدا سەرقاڵی دەرۆزەکردنن. هێندە بێ توكو بێ حاڵ بوو بوون، هەر کەسێك بیدیتبان، دڵی بە حاڵیان دەسووتا. بەڵام ئەمجارەیان هەر بە راستی یەکێکیان کوێر بوو بوو، و ئەوی تریان شەل بوو بوو. رێوییەکە هاواری کرد: ئۆو، بوکەڵە! رەحمێك بە حاڵی ئێمەی بەدبەختدا بکە!" بوکەڵەکە وەڵامی دایەوە: "نا، ئێوە جارێکتان هەڵخەڵەتاندم خوا بتانگرێ، ئەگەر ئەمجارە هەڵ بخەڵەتێم خوا بمگرێ! من دەزانم ئێوە هەمان ئەو دوو جانەوەرەن کە دەتانویست لیرەکانم بدزنو بمکوژن!"، رێوییەکە گوتی: "بەڵام ئەمجارەیان راست دەکەین، باوەڕ بکە ئێستا زۆر بێ حاڵو بەدبەختین!" بوکەڵەکە گوتی: "بڕۆن هەر ئەوە حاڵتان بێ!" ئەوسا بوکەڵەکەو ژپیتۆ، بەدوو قۆڵی وەرێ کەوتن.

زۆری نەبرد گەیشتنە کەوێڵێکی بچکۆڵەو پاكو خاوێن، پێنەدچوو ئاوەدانی تێدابێ. بەڵام کاتێ وەژوورکەوتنو روانیانە دەوروبەریان، چاویان بەدۆستە کۆنەکەیان، واتا بە

سیسرکە قسەویژەکە کەوت. سیسرکەکە، بوکەڵەکەی لەبەر لاساریو بێعاری سەرکۆنە کرد. بوکەڵەکە گوتی: "هەقی خۆتە، من شایستەی ئەم قسانەم، بەڵام تکات لێدەکەم لەگەڵ بابمدا میهرەبان بە! بڵێ بزانم چۆن ئەم خانووە چاکەت پەیدا کرد". سیسرکەکە گوتی: "پەرییە پرچ شینەکە ئەم خانوووەی دامیێ. ئەو بە گریان ئێرەی بەجێ هێشت. چونکە دڵنیا بوو کە نەهەنگەکە تۆی خواردووە" بوکەڵەکە گوتی: "کەواتە من ئیدی ئەو نابینم؟"و لە هۆڕژنی گریانیدا.

بوکەڵەکە خێرا جێیەکی باشی بۆ باوکی دروست کردو ئەوجا لە سیسرکەکەی پرسی کە لە کوێ پەرداخێك شیر بۆ ژپیتۆ پەیدا بکات. سیسرکەکە پێی گوت کە جوتیارێك لە دووری یەك –دوو کیلۆمەتری ئێرە دەژیو چێڵێکی هەیە. بوکەڵەکە، بەرەو مەزاری جوتیارەکە وەڕێ کەوت، بەڵام چونکە پارەی نەبوو هەقی شیرەکە بدات، پێشنیازی کرد کە لە بری پارەی شیرەکە کار بکاتو ئیدی لەوێ دەستی بەکار کردن کرد. بوکەڵەکە، لە بری هەر پەرداخە شیرێك، سەد سەتڵ ئاوی لە بیر هەڵدەکێشا. رۆژێك، لەو کاتەدا کە بوکەڵەکە خەریکی کارکردن بوو، جووتیارەکە بۆی گێڕایەوە کە کەرێکی هەبووەو ئاوی لە بیرەکە بۆ هەڵکێشاوە، بەڵام ئەو بەستەزمانە وا خەریکە دەتۆپێ.

بوکەڵەکە گوتی: "دەکرێ من ببەیتە دیاری؟".

جووتیارەکە، بوکەڵەکەی بردە دیار کەرەکە، بوکەڵەکە، روانییە کەرەکە کە لەسەر خەرمانە کایەك راکشابوو، یەکسەر ناسییەوە کە هەمان "پڵیتەمۆم"ی لەمەڕ خۆیەتی. کە دیتی کۆنە دۆستەکەی رۆژی بەو رۆژگارە خراپە گەییوە، لە حەژمەتاندا کەوتە گریان.

لەو بەدواوە بۆ ماوەیەکی درێژ، بوکەڵەکە هەموو رۆژێك کاتژمێر پێنجی بەیانی لە خەو رادەبوو، و بەسەتڵ ئاوی بۆ جووتیارەکە هەڵدەکێشا، تا ژپیتۆ بە ئەندازەی پێویست شیر بخواتو ببوژێتەوە. بوکەڵەکە کارێکی دیکەشی دەکرد، هەوڵی دەدا تا دەتوانێ ژیانی باوکی خۆشو ئاسودە بکات. کاتێك کە بە ئەندازەی پێویست پارەی پاشەکەوت کرد، ئیدی لێبڕا کە چەند دەستە جلکێك بۆ خۆی بکڕێ.

رۆژێك، بەیانی زوو بە کەیفو خۆشی, بەدەم فیکە لێدانەوە، رۆیی بۆ موغازەی جلك فرۆشان، لە پڕ گوێی لێ بوو کە یەکێك بانگی دەکات. دەنگەکە، دەنگی هەمان ئەو هێلکە شەیتانۆکەیە بوو کە لەگەڵ پەریدا دەژیا. هەواڵێکی ناخۆشی بە بوکەڵەکەدا.

هێلکە شەیتانۆکەکە گوتی کەپەری حاڵی زۆر خراپەو لە خەستەخانە خەوتووە، ئەوەندە هەژار بووە توانای نییە پارەی دکتۆرو دەواو دەرمان بداتو تێر بەسکی خۆی خواردن بکڕێو بیخوات.

بوکەڵەکە، هەر کە ئەم هەواڵەی بیست، بەدەم گریانەوە گوتی: "وەرە، ئەم پارەیە ببەو بیدە بە پەری. دەرمان بۆ ئەو گرنگترە تا لە جلك بۆ من".

ئێوارەی ئەو رۆژە، بوکەڵەکە پتر لە رۆژان کاری کرد تا بتوانێ پارەی زیاتر بۆ یارمەتی دانی پەری بەدەست بێنێ.

سبەینێی ئەو رۆژە، کاتێ لە خەو رابوو، بە خۆشحاڵییەکی فرەوە بۆی دەرکەوت کە ئیدی منداڵە دارینە نییە، بەڵکو بووە بە کوڕێکی راستەقینە. گەڕایەوە سەیری کرد لە کەنار قەرەوێڵەکەیداو لەسەر دەسکی کورسییەکەی دەستێ جلك‌و کڵاوێك‌و جوتێ پێڵاوی نوێ دانراوە، لە گیرفانی یەکێك لە جلەکاندا جزدانێك‌و کاغەزێك هەبوو. لە کاغەزەکەدا نووسرابوو: "پەری،پارەکان بۆ پینوکیو گیان دەگێڕێتەوەو زۆر مەمنونی دڵپاکی‌و دڵچاکی ئەوە!".

کاتێ کە پینوکیو، روانییە ناو جزدانەکە بینی لە بری چل فلس، چل لیرەی ئاڵتونی تێدایە. غاری دا تا ئەم رووداوە بۆ ژپیتو بگێڕێتەوە. ژپیتو، لە هۆدەیەکی دیدا بوو. لەو هۆدەیەدا شتێکی سەیری بینی، ژپیتو, وەکو جاران ساغ‌و سەلامەت بوو، و سەرگەرمی کارکردن بوو، و بەدەم کارکردنەوە بزە بەسەر لێوییەوە سەمای دەکرد.

ژپیتو، سەرقاڵی تا شینی تەختە بوو،

- باوکە، تەماشاکە بزانە بووم بە کوڕێکی راستەقینە! پینوکیو-ی دارین چی بەسەر هات؟

ژپیتو گوتی: "هۆ وەتا"و ئاماژەی بۆ بوکەڵەیەك کرد کە خۆی گرموڵە کردبوو و لە سوچێکدا کەوتبوو.

لەم کاتەدا پینوکیو، لە فکران راچوو: "کاتێ کە بوکەڵە بووم، چ قەڵافاتێکی ناشیرینم هەبوو، کەچی ئەوەتا بووم بە کوڕی راستەقینە، چەند قەڵافاتێکی جوان‌و لەبەر دڵانم پەیدا کردووە."

پینوکیو هێندە خۆشحاڵ بوو، لەزگ بوو لە کەیفاندا باڵ بگرێ‌و بفڕێ.

1996/2/25

سلێمانی

# فاشیزم چییه...

نووسینی: یەڵماز گۆنەی

منداڵەکە لە دایکی پرسی: دایکە!... فاشیست چییە؟ هێلانەی فاشیستەکان چییە؟
دایکەکە بێدەنگ بوو، ئەویش وەکو منداڵەکەی بە بەردەوامی ئەم وشەیەی لە رادیۆو تەلەفزیۆن و باس و خواسەکاندا بیستبوو، بەڵام ماناکەی نازانی و نەی دەزانی چ وەڵامێکی منداڵەکەی بداتەوە. بۆ ئەوەی ماوەیەك بۆ وەڵامدانەوە پەیدا بکات پرسی:

– ئەم فاشیستەت لە کوێوە بە بیرا هات... بۆ دەپرسیت؟

منداڵەکە گوتی:

– دوێنێ کە لەگەڵ هاورێکەمدا لە قوتابخانە دەگەڕاینەوە خەڵکانێکی زۆر لە کوڕو کیژ کۆبووبوونەوەو پێکەوە هاواریان دەکرد "مردن بۆ فاشیستان"، "دەبێ لانەی فاشیستەکان وێران بکەین"..

دایکە!... فاشیست باڵندەیە. هێلانەکەی چۆنە؟
دایکەکە نەیتوانی وەڵامی منداڵەکە بداتەوە، هەر چەندە هەر جارێ کە دەچووە بازێر خەڵکانێکی زۆری دەبینی و دروشمی وەکو "مردن بۆ فاشیستان"ی گوێ لێ بوو و دەبوو.
منداڵەکە کە هەستی کرد بوو دایکی بە دوای وەڵامدا دەگەڕێ، گوتی: فاشیست باڵندەیە، لەق لەقە، چییە؟
دایکەکە کە گیری خواردبوو و چ وەڵامێکی پێ نەبوو، گوتی:

– با، بابت بێتەوە لەو دەپرسم، ئەو باشتر دەزانێ....

– ئەی تۆ نازانی؟

– دەزانم بەڵام بابت چاکتر دەزانێ...

دایکەکە بیری دەکردەوە کە مانای گەلێ وشەی رۆژانەی وەك: ئیمپریالیزم، سوسیالیزم، کۆمۆنیزم، ئەنارشیزم و.... نازانێ.
پرسیاری منداڵەکە گێژی کردبوو، لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە "هەر رۆژەی شتێك لە کوچەو شەقامەکاندا روو دەدا... هەر رۆژەی بانقێ دەبڕدرێ.. هەر رۆژەی 4–5 کەس دەکوژرێن.. رۆژ بە رۆژ مەسرەف گرانتر دەبێ... بەڵام من سەر لە هیچیان دەرناکەم! "خۆی

به موبەقەکەدا کرد، لە کاتێکدا کە خەریکی پەتاتە پاک کردن بوو لە موبەقەکەدا، قێزی لە خۆی دەکردەوە.

## ناچار.....

باوك. فەڕاشی نووسینگەیەك بوو، ڕۆژانەیەکی کەمی وەردەگرت و ناچار بوو بەو ڕۆژانە کەمەی (5) سەر خێزان بەخێو بکات، قسەی هەوەڵ و ئاخری ئەمە بوو: "بێگاری دەکەم" ڕۆژێك کوڕەکەی چوو بۆ نووسینگەکە کە دیدەنی باوکی بکات. دەمەدەمی نیوەڕۆ بوو. کوڕی خاوەن نووسینگەکە لەوێ بوو و خەریکی نان خواردنی نیوەڕۆ بوو. ئەویش وەکو کوڕی فەڕاشەکە دەساڵان بوو. بەڵام ڕەوشت و ڕەفتاری پیاوی گەورەی هەبوو، خەڵکی باوکیان بە بیر دەهاتەوە، کە قازی خانەنشین بوو.

کوڕی خاوەن نووسینگەکە لە حاڵێکدا کە دەمی پڕ لە خواردن بوو، بێ ئەوەی سەر لەسەر قاپەکەی بەردەمی هەڵبڕێ بە فەڕاشەکەی گوت: – حیلمی بەگ... کەمێ ئاو بێنەه!

فەڕاشەکە ئاوەکەی هێناو گوتی: – فەرموو.

کوڕەکە دیسان گوتی:

– سەبرکە با خواردنەکەم قوت بدەم.... بنیادەم ئەگەر خواردنەکەی باش نەجوێ بۆ گەدەی خەراپە...

خواردنەکەی باش جووی و قووتی دا، ئەوجا بە دەستەسری کاغەز دەمی سڕی، دوای ئەوەی ئاوەکەی وەرگرت و تا نیوەی خواردەوە گوتی:

– پەرداخەکە پاك نییە... پەرداخەکان پاك بشۆ.

کوڕی فەڕاشەکە کە بینی کوڕیژگەیەك بەو جۆرە فەرمان بە باوکی دەدا زۆر نیگەران بوو، کوڕی ئاغا دوای ئەوەی دەست و دەمی بە دەستەسڕی کاغەز سڕی گوتی:

– دەتوانی کۆی بکەیتەوە!..

فەڕاشەکە، پاشماوەی خواردنەکانی کۆکردەوە، کوڕی ئاغا بە پەنجە مێشێکی –کە لەسەر شووشەکە نیشتبووەوە– نیشانداو گوتی:

– حیلمی بەگ.. ئەو مێشە بکوژە.

فەڕاشەکە مێشەکەی کوشت. مێزەکەی پاك کردەوەو ڕۆیی. منداڵەکە کە زۆر لە کوڕی ئاغا تووڕە بوو بوو گوتی:

– لەبەرچی بەم جۆرە ڕەفتار لەگەڵ بابمدا دەکەیت؟

کوڕی خاوەن نووسینگەکە بە کورتی وەڵامی دایەوە: "ناچارە"

– بۆچی ناچارە

- ناچارە...
- لەبەرچی؟

باوکەکە گەڕابۆوەو پارچە پەڕۆیەکی بە دەستەوە بوو، کوڕی خاوەن نووسینگەکە لە جێی خۆی هەستاو گوتی:

- حیلمی بەگ پاڵتۆکەم بۆ بێنە!

منداڵەکە گوتی:

- مەیهێنە باوکە... با خۆی بیهێنێ!....

کوڕیژگەکە گوتی:

- باوکت مەجبوورە.

باوکەکە بێ ئەوەی چ وەڵامێك بداتەوە پاڵتۆکەی هێناو ئەویش وەکو فەرمانبەرێکی پایەبەرزی کارگێڕی پاڵتۆکەی لەبەرکردو لە حاڵێکدا کە لە دەرگا دەچووە دەرێ گوتی:

- تۆ منداڵێکی چەپەڵی بێ تەربێتی، کە باوکم هات پێی دەڵێم.

باوکەکە بە کزییەوە گوتی:

- قوربان لە کورەکەم توڕە مەبە.. تۆ لە جێی برای ئەوی، نابێ لێی زویر ببی.

کوڕیژگەکە گوتی: منداڵەکەتت باش پەروەردە نەکردووە.

ئەم قسەیە زۆری کار لە منداڵەکە کردبوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "چی بووەتە هۆی ئەوەی کە باوکم لە بەردەم منداڵێکی بچکۆلەدا زەلیل ببێ؟"

کوڕی ئاغا رۆیی بوو، باوکەکە دەیگوت:

- کارێکی باشت نەکرد کوڕم ئەگەر ئاغا لێرە بوایە؟

منداڵەکە گوتی: - باوکە، بۆ مەجبوری؟ لەبەرچی؟

باوکەکە ملی کەچ کردو گوتی: ئەگەر بە گوێیان نەکەم، ئەگەر بێگاریان بۆ نەکەم، بێ کار دەمێنمەوەو دەرم دەکەن.

- ئەگەر دەرت بکەن چی دەبێ؟.
- برسی و تینو دەبین، ئێمە مەجبورین کوڕم.

منداڵەکە گوتی:

- چما کاری دی نییە؟

باوکەکە گوتی:

- ئەگەر بچمە سەر کارێکی تریش فەرق ناکات، ئەم ئاغایانە هەموو وەکو یەکن، چ عەلی خواجە، چ خواجە عەلی... ئەمانە تەنیا ناوەکانیان جیاوازە، ئەگینا رەوشت و رەفتاریان هەموو هەر یەکە... هەموویان وەکو یەکن دەنگێکی توڕەو گڕ هاواری کرد:
- حیلمی بەگ!...

باوکەکە 25 فلسی دایە کوڕەکەی و گوتی:

- کوڕم... تۆ بڕۆرەوە بۆ ماڵێ.

منداڵەکە بە هەستێکی وروژاوەوە کە سەراپای داگرتبوو، هەنگاوی دەنا، بەڵام هەوڵی دەدا لە نێو کۆمەڵدا ئەوانەی کە "مەجبوور بوون"و ئەوانەی کە "مەجبوور نەبوون" لە یەکدی جیا بکاتەوەو بیان ناسێت.

## گاڵتە – درۆ

منداڵەکە تازە فێر بوو بوو ناوی خۆی بنووسێت باوکی کە زۆر بەمە خۆشحاڵ بوو گوتی:
سەگبابی بێ شەرەف... چ زوو فێر بوو ناوی خۆی بنووسێت.
خۆشحاڵی باوکەکە کاری لە منداڵەکەش کردو نووسی:
"دەرگا"، "ریحلە"، "قوتابخانە کرایەوە".
باوکی گوتی: – گەوادە زۆر زیرەکە. دەزانم لە دوا رۆژدا بۆ خۆی دەبێ بە پیاو. منداڵەکە لە یەکەوە تا دەی نووسی، باوکەکە لە خۆشیدا نایزانی چی بکات هاواری کرد:
سەگباب... ژمارەش دەنووسێت!
منداڵەکە ئەو وێنانەی بە هێڵی سادە کێشابوونی، نیشانی باوکی دا ریزی خانووەکان... درەختەکانو.. هەتاوێ کە چاوو برۆی هەبوو و پێ دەکەنی. باوکەکە کە بە تەواوی کەوتبوە سەر زەوق گوتی: ئێستا منیش وێنەیەك بۆ کوری خۆم دەکێشم. رێك لە ناوەندی دەفتەر رەسمەکەدا بە قەڵەمی سەوز وێنەی دارێکی گەڵا سەوزی کێشاو بە قەڵەمی سوورو زەرد هەندێ گوڵی بۆ دارەکە کردو لەسەر چڵەکانی هەندێ باڵندەی کلاو زێرینو سوورو وەنەوشەیی دروست کرد.
منداڵەکە گوتی: باوکە ئەمە چ درەختێکە.
باوکی گوتی: – حەز دەکەی چی بێ؟ دارە!
– زۆر چاکە، بەڵام ئەم کەڵەشێرانە بۆچی چوونەتە سەر دارەکە.
– کەڵەشێر؟ کامە کەڵەشێر؟ ئەمانە کەڵەشێر نین، باڵندەن.
– باڵندە؟... ناوی چییە؟
باوکەکە ناوێکی بۆ نەدۆزرایەوە، دایکەکە خۆی تێ هەڵقورتاندو گوتی: کورم!... ئەمانە باڵندەی باوکتن.
ئەمە رۆیی. رۆژێك کە منداڵەکە بۆ قوتابخانە دەچوو لە رێگادا بینی: ژنو پیاو خڕبوونەتەوەو منداڵێکی پێ خاوس خەریکی گریانە و کابرایەکی چەقۆ تیژکەرەوەو پیاوێکی قەڵەوی بێجامە لەبەر دەم بۆڵەیان بوو. پیاوە قەڵەوەکە دەیگوت:
– قسەکەم ناگێڕمەوە... نایگێڕمەوە... دیسان دەڵێم تۆ کابرایەکی سەگبابی بێ شەرەفی.

چەقۆ تیژکەرەکە کە لە تورەییدا دەلەرزیو رەنگی سپی هەڵگەڕا بوو دەیگوت: – قسەکەت بگێڕەوە.

– نایگێڕمەوە

چەقۆ تیژکەرەکە گوتی: – من بێ شەرەف نیم، من بە ئارەقی نێو چەوانم نانی خۆم پەیدا دەکەم... ئەگەر لەم ناوەدا پیاوێکی بێ شەرەف هەبێ ئەوە تۆیت.

کابرای بێجامە لەبەر بە تورەییەوە بەرەو کابرای چەقۆ تیژکەرەوە چوو. چەند کەسێك گرتیان.. کابرای قەڵەو بەدەم دەست راوەشاندنەوە دەیگوت: –سەگ باوك.. دەزانی من کێم؟

– هەر کەسێك هەی هەر بۆ خۆت هەی، هەقی ئەوەت نییە بە من بڵێی بێ شەرەف، بێ شەرەف خۆتی، باوك سەگ خۆتی. کۆمەڵێ ناوبژیکەر دەیانگوت "نەکەن" "وازبێنن" "ناشیرینە". بەڵام ئەم قسانە بەرهەڵستی ئەوەیان نەکرد کە ئەو دووە دەست نەدەنە یەخەی یەکدی. چەقۆ تیژکەرەکە، بە جۆرێ کە لەو نەدەوەشایەوە مەقەسێکی ژەنگاوی کە دەیویست تیژی بکاتەوە بە ورگی کابرای بێجامە لەبەردا کردو کابرا لە خوێنا گەوزا. منداڵەکە سەرسام بوو بوو بە ترس و لەرزە لەوێ دوور کەوتەوە، لە کاتێکدا کە بەرەو قوتابخانە غاری دەدا، بیری دەکردەوە کە "چەقۆ تیژکەرەکە بۆ لەو کابرایەی دا؟"

بێگومان لەسەر ئەوەی پێی گوتبوو بێ شەرەف، باوك سەگ. ئەگەر ئەمانە خەراپە ئەی بۆ باوکم پەیتا پەیتا بە من دەڵێ بێ شەرەف، جاشەکەر، گەواد، باوك سەگ...". نەیتوانی چ وەڵامێك بۆ پرسیارەکەی بدۆزێتەوە.

لە پۆلدا پەنجەی هەڵبڕیو گوتی:

– مامۆستا!

مامۆستاکەی گوتی:

– چییە؟!

منداڵەکە لە جێی خۆی هەستاو گوتی:

– جەنابی مامۆستا، گەواد یانی چی؟

قوتابییەکان پێکەنینو مامۆستاکە بەم پرسیارە غافڵگیر بوو، و دوو دڵ بوو لە وەڵامدانەوەی پرسی:

– بۆ ئەم پرسیارەت کرد؟

منداڵەکە گوتی:

باوکم... باوکم هەمیشە بە من دەڵێ گەواد... منداڵەکان لە قاقای پێکەنینیان داو مامۆستاکەش کە پێکەنین گرتبووی، بە منداڵەکەی گوت:– باوکت لە خۆشەویستیدا وات پێ دەڵێ.

– زۆر چاکە، ئەی بۆ دەڵێ بێ شەرەف؟

– باوکت ئەمەش دەڵێ؟

– بەڵێ!

ماموستاکه گوتی: – گاڵتە دەکات، دیارە زۆری خۆش دەوێی. کاتێ کە ماموستاکە ئەم قسەیەی کرد، کچۆڵەیەك کە لەسەر یەك ریحلەو لە تەك ئەوەوە دانیشتبوو، سەری هێنایە بناگوێی کوڕەکەو بە چپەوە گوتی: "هەی گەوادی بێ شەرەف!".

## دوو هێلکە مریشك

کاتێ کە برایم–ی کرێکاری چنین کاری، لە کارخانە گەڕایەوە ئایشێی ژنی بە خۆشییەوە گوتی: – چاوت روون، مـژدەم پێیە، کوڕەکەمان شەڕی بووە... لێیان داوەو چاوی ئاوساوە!...

برایم خۆشحاڵ بوو، بێ ئەوەی بتوانێ ئەم خۆشحاڵییەی بشارێتەوە گوتی: – لەگەڵ کێدا شەڕی بووە؟

– نازانم... بە هیچ جۆرێ نەمتوانی قسەی لێ دەربێنم... زۆر مەنگە لەوانەیە تۆ بتوانیت.

حەیدەری تاقانەیان حەوت ساڵان بوو، خەریك بوو تازە ئەمساڵ دەچووە قوتابخانە. برایم هەستی بە خۆشحاڵی دەکردو بەڵام لە هەمان کاتدا نیگەرانیش بوو.

ئایشێ گوتی: – خۆزیا باوکت دەما. دەزانی چەند خۆشحاڵ دەبوو.

برایم بیری کردەوە "کوڕەکەی بۆ یەکەمین جار شەڕی کردووە وا دیارە زۆریش مەنگە.."

رۆژی لە دایکبوونی حەیدەری هێنایەوە یاد: ژنەکەی گوتبووی:

"مناڵەکە خەریکە دێتە دنیاوە.. ئاخ دڕام" دەمەدەمی بەیان چوو بوو بە شوێن مامانـدا تەمەن چەند زوو تێدەپەڕێ... دەڵێی دوێنێیە پێیان گوت... "برایم چاوت روون، بووی بە بابی کوڕ". منداڵێك بە دەموچاوێکی وردیلەو چاوانی بەستراوەوە...

باوکیشی لە حاڵێکدا کە دەگریا، بە دەنگی لەرزۆك و پەلمە گریانەوە گوتبووی "خۆتیش کە لە دایك بوویت هەمان شێوەو روخسارت هەبوو"و ئەوجا بە پێکەنینێکی تاڵەوە گوتبووی "کەسێ کە منداڵی نەبێ نازانێ خۆشەویستی منداڵ چی دەگەیەنێ".

ئێستا زۆری حەز دەکرد کە بابی زیندوو بووایە.

ژێر چاوێکی حەیدەر شین بوو بووەوە، هەوڵی دەدا ئەو چاوەی لە باوکی بشارێتەوە. بابی پرسی: – کوڕم!... ئەوە چاوت چی لێهاتووە.

منداڵەکە گوتی: – هیچ!

– بابە گیان، چاوی بنیادەم لە خۆیەوە نا ئاوسێ.

حەیدەر بێ ئەوەی وەڵام بداتەوە سەیری باوکی دەکرد.

– لەگەڵ کێدا شەڕت بووە؟

دیسان حەیدەر وەڵامی نەدایەوە. باوکی گوتی:

- بزانە!... ژێر چاوت شین بووەتەوە؟ پێشی دەموچاویشت گوراوە ئەدی بڕیار نەبوو درۆ لەگەڵ یەکدا نەکەین؟ کوڕەکەی گرتە باوەش و بەرزی کردەوەو ئەوجا خستییە سەر ئەژنۆی و بە خۆشەویستییەوە گوتی:
- دەی بزانم ئێسکەکانی باوکت بشکێنە.

منداڵەکە لە کاتێکا لێوی خۆی دەکرۆشت تا هێزی تێدا بوو بە هەردوو دەست بە باوکیا کێشا. باوکی پڕ بە دڵ باوەشی پێدا کردو گوتی: - باشە دیارە ئەو کەسەی بە چاوتیا کێشاوە لە تۆ گەورە ترە... ناتەوێ بڵێی کێیە؟

منداڵەکە لە حاڵێکدا کە فرمێسك لە چاویا قەتیس مابوو گوتی:

- خۆم سەری دەشکێنم.
- سەریٚ کیٚ؟
- عەلی رەزا.
- کەواتە ئەو لێی داویت.
- بەڵیٚ...

عەلی رەزا، کوڕی ئەو سمایلە بوو کە لە گەڵ برایم دا لە یەك کارخانەدا کاریان دەکرد. عەلی رەزاو حەیدەر پێکەوە ناونووس کرابوون و دەچوونە یەك قوتابخانە.

برایم کەوتە بیری باوکی عەلی رەزاوە. کرێکارێ بوو کە دەموچاوی هەمیشە بۆنی توتنی لیٚ دەهات. کەوتە یادی رۆژانی منداڵی و ئەو هەموو ساڵەوە کە پێکەوە بە سەریان بردبوو. بیری کردەوەو ئەوسا تەماشای چاوی کوڕەکەی کرد، کە ئازارێکی زۆری لیٚ بەدی دەکرا.

منداڵەکە گوتی: - باوکە! دارکاری بکە، ئەو چاوی منی ئاوساندوە، تۆیش سەری بشکێنە.

باوکەکە، گۆناکانی بە گۆناکانی کوڕەکەیەوە نا، لە حاڵێکدا کە منداڵەکەی بە باوەشەوە بوو لەسەر تەختێك دانیشت و گوتی:

- کوڕم! ئێستا چاك گویٚ لە من بگرە.

"رۆژیٚ لە رۆژان، منیش منداڵ بووم، 5- 6 ساڵان بووم... ئەوسا لە گوند دادەنیشتین، رۆژێکیان خەریك بوو لەگەڵ منداڵاندا هەدار هەدارمان دەکرد کە لەگەڵ یەکێك لە منداڵاندا بوو بە شەڕمان. بیرم نەماوە لەسەرچی بوو. بەڵام ئەمەم باش لەبیرە کە لقە دار هەڵوژەیەك بە دەست ئەو منداڵەوە بوو، ئەو لقە دارەی بەسەرما کێشا، سەری شکاندم و رای کرد. من بە گریانەوە چوومەوە بۆماڵەوە. دەزانی دەمویست چی بکەم؟ دەمویست لەلای باوکم شکاتی لیٚ بکەم. دەمویست تێروپڕی دارکاری بکات. کاتیٚ کە بابم سەری منی بینی گوتی: "هیچ نەبووە، هەر کەسیٚ لێی دابی هیواش لێی داوە". لەو دەمەدا کە دایکم خەریك بوو بە پارچەیەك خوێنەکەی سەرمی پاك دەکردەوەو دەی بەست، من هەموو بەسەرهاتەکەم بۆی گێڕایەوە، خۆیشم هەنێکم پێوەنا، وردە وردە دەشگریام. بابم رووی گرژ کردو گوتی: "ئەوە چۆن زاتی کردووە لە کوڕەکەی من بدات، هەر ئێستا پێی نیشان دەدەم،" ئەوجا رووی لە دایکم کردو گوتی: "ئافرەت!... تۆ وەجاخەکەت ئاگردەو تاوەکە بخە سەر ئاگرەکەو من هەر

ئێستا دیمەوە" ئەمەی گوتو لە ماڵ چووە دەرێ. دایکم وازی لە من هێناو چوو ئاگر بکاتەوە. ئەوساکە لە گوندا تەباخی گازو ئەم شتانە نەبوو. لەبەردەم ماڵەکاندا بە قوڕ کوانویان دروست دەکرد. من لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە ئێستا باوکم خەریکە بە تورەییەوە بە دوای ئەو منداڵەدا دەگەڕێ. هەرکە بەر دەستی بکەوێ تێرو پڕی دارکاری دەکاتو لەوانەیە سەریشی بشکێنێو دوای ئەوەی باوکم دارکاری کردو سەری شکاند دایکیشم بە تاوە گەرمەکە دەیبرژێنێتەوە "لەم کاتەدا دەنگی هاواری ئەو منداڵەی کە سەری شکاند بووم، بەر گوێم کەوت، گوتم" چاکە! بێگومان بابم خەریکە دارکاری دەکات بە خۆشییەوە چوومە بەر دەرگای حەوشە، دیتم باوکم بەو هەموو تەمەنەوە شوێن ئەو منداڵە کەوتووەو پەیتا پەیتا هاوار دەکات: "رامەکە، رامەکە هیچت لێ ناکەم" منداڵەکە غاری دەداو باوکم بەدوویدا. ئاقیبەت گرتی، گوتم "هەر ئێستا دەیکوژێ" کەچی بینیم باوکم خەریکە ئەملاو ئەولای ماچ دەکات، واقم وڕما، سەیرێکی دایکم کردو گوتم "ئەوە چییە؟" دایکم پێ ناکەنی، بەڵام بە شادییەوە لەبەر خۆیەوە گۆرانی دەگوت. تاوەکەی خستبووە سەر کوانووەکەو رۆنی تێ دەکرد.

لەبەر خۆمەوە گوتم: "ئەگەر دایکم دەیەوێ ئەو منداڵە لە رۆنەکەدا سوور بکاتەوە ئەدی بۆ گۆرانی دەڵێ، ها! هەڵبەتە بۆیە ئەم کارە دەکات تا منداڵەکە کەوی بێتەوە. بەڵێ، بێگومان باوکم ماچی دەکاتو دایکم گۆرانی دەڵێ تا منداڵەکە هێور بێتەوە". بەڵام کاتێ کە باوکم منداڵەکەی هێنایە ماڵەوە، دایکم بەرەو پیری غاریداو بە باوەشی باوکمەوە ماچی دەکردو دەیگوت: "قوربانی ئەو دەستانەت بم کە سەر دەشکێنێ". بە کورتو کرمانجی بابم لەبری ئەوەی لە منداڵەکە بداتو دایکم لە بری ئەوەی بیخاتە تاوەکەوە، دایکم چوو دوو هێلکە مریشکی هێناو شکاندییە نێو تاوەکە، نانی هێنا، هەنجیری وشکی هێنا، ئەوجا باوكو دایکم منداڵەکەیان دانیشاندو هێلکەکەیان لەبەردەمی دانا، منو منداڵەکە هەردووکمان واقمان وڕما بوو. من دەستم کرد بە گریان "ها... هەم.. سەرم بشکێنێو هەم هێلکەش بخوات، منیش هێلکەم دەوێ، هەنجیرم دەوێ" باوکم لە باوەشی گرتمو گوتی: "بزانە کوڕم! ئەو منداڵە دوژمنی تۆ نییە، ئێوە دۆستی یەکترن، ئەویش منداڵی بابایەکی کرێکاری وەکو منە. لە یاریدا ئەم شتانە هەر دەبێ، ئێمە نەزرێکمان هەیە، نەزرمان کردبوو ئەگەر بووین بە خاوەنی کوڕێكو کوڕەکەمان نەمردو گەورە بوو، و شەڕی کرد، یەکەم کەس کە سەری بشکێنێ دوو هێلکە مریشکی دەرخوارد بدەین. ئێستا سوپاس بۆ خوا تۆ گەورە بوویتو گەیشتی بە تەمەنێ کە دەتوانی شەڕ بکەی. باشە!...

ئێستا کوڕم تۆش گەورە بوویتو دەتوانی شەڕ بکەیتو من ئێستا قسەکانی ئەو رۆژەی بابم باشتر تێ دەگەم، نازانی ئەم بابەتە بۆ دایكو باوکێك چەند خۆشە، تۆش رۆژێ دێ بە خاوەن منداڵ دەبیت، دەبی بە باوك و رەنگە تۆش ئەوساکە قسەکانی من باشتر تێ بگەیت.

کوڕم!.. عەلی رەزا برادەری تۆیە، ئەویش وەکو تۆ منداڵی کرێکارە ئێمەمان دەبێ لەگەڵ یەکدیدا دۆستو ئاشنا بین نەك لەسەر شتی خۆڕایی رق لە یەکدی هەڵگرین. ئێستا ئەگەر بە

دوو قۆڵی بچین بۆ لای مام سمایل و من لێی بپرسم "سمایل تۆ حەیدەری ئێمەت خۆشتر گەرەکە یان عەلی رەزای کوڕت" دەبینی دەڵێ: "هەردووکیانم بە ئەندازەی یەك خۆش گەرەکە". باشە! "منیش عەلی رەزام بەقەد تۆ خۆش گەرەکە". من گوتم "بەڵام باوکە... ئەو دای بە نێو چاومدا" باوکم گوتی: "جا چ قەیدییە کوڕم.. گرنگ نییە... گەورەبی لە بیرت دەچێ". چونکە برادەرتە.

ئایشێ گازی کرد: "برایم!. سمایلو ژنەکەی بۆ ئێرە دێن" برایم هەر بەو دەقەوە کوڕەکەی بە باوەشەوە بوو، گەڕایەوە و لە پەنجەرەکەوە روانی، لە دوورەوە بینی کە چۆن عەلی رەزا دەستی باوکی گرتووەو بە شەرمەزارییەوە دێتو سمایل پێ دەکەنێ.

برایم کەوتە بیری باوکی رووی کردە ژنەکەیو گوتی:

- ئایشێ کوانووەکە ئاگر بدەو دوو هێلکە مریشك بشکێنە ناو تاوەکە.

## واهیمە

منداڵێك وەختێ کە بەتەك کەلاوەیەکی داڕوخادا تێدەپەڕی خۆی بە باوکییەوە چەسپاندو توند دەستی گرت. باوکەکە زانی منداڵەکەی لە شتێك ترساوە. منداڵەکە هەر بەو دەقەوە کە توند دەستی بابی گرتبوو بە ئەسپایی گوتی:

-باوکە! .. لەم خانوودا تارمایی نییە!

باوکەکە لەو ترسەی کە لە دەنگی منداڵەکەیەوە دیار بوو خەمبار بوو و پرسی: تارمایی! تارمایی چییە؟

منداڵەکە گوتی: تارمایی, تارمایی.. مراد دەیگوت.

مراد کوڕی مجێوری مزگەوت بوو. باوکەکە وەستا، لە بێدەنگی خۆرئاوادا پەرەسێلکەکان بەسەر تەلارەکەوە دەفڕین. کابرا بە ئاشکرا دەیبینی ترس وردە وردە لە سیمای کوڕەکەدا پتر دەبێ. بە پێکەنینەوە گوتی: باوەڕ بەم درۆو دەلەسانە مەکە تارمایی و مارمایی لە گۆڕێدا نییە، بیری خۆت نارەحەت مەکە.

- ئاخر بینیویانە باوکە!
- کێ بینیویەتی؟
- باوکی مراد بینیویەتی... دەڵێ "لەلای ئەو کەلاوەیە وازی مەکەن تارمایی هەیە، دێتو دەتان خوات.. قوتتان دەدات.. ئێمەش ئیدی ناچینە ئەوێ".
- باوکی مراد بۆیە ئەم قسانە دەکات تاکو بتان ترسێنێ.

- بۆ دەیەوێ بمان ترسێنێ؟

باوکەکە گوتی: بزانە کوڕم!.. ئەمە خانوویەکی کۆنەو دیوارەکانی روخاون، بایەکی توند دەیروخێنێ... بابی مراد لەوە دەترسێت کە کاتێ ئێوە لەوێ بن و بە وازییەوە بخافڵێن، دیوارەکان بڕوخێن، ئەوساکە چی دەبێ؟ ئاشکرایە! کاتێ بە خۆتان دەزانن کەوتوونەتە ژێر دیوارەکانەوە. ئەگینا تارمایی و جنۆکەو شت لە دنیادا نییە.

کوڕەکە بە نە باوەڕییەوە جارێ سەیری خانووەکەی دەکردو جارێ سەیری باوکی.

- بەڵام مراد-یش بینیویەتی

- مراد درۆی کردووە، لە خۆیەوە وای گوتووە.

- بۆ درۆ بکات... بۆ لە خۆیەوە وا بڵێ؟

- وتەختێ کە شتێ بوونی نەبێ و بڵێ بینیومە، دەکاتە ئەوەی لە خۆیەوە گوتوویەتی.

بۆ ئەوەی ترسی منداڵەکەی دەربکات گوتی: من دەمەوێ بچمە ئەو خانووەوەو هەموو شوێنێکی بگەڕێم، ئەگەر دەتەوێ تۆش وەرە، وەرە بە چاوی خۆت تەماشا بکە کە چ شتێك لەوێدا نییە. منداڵەکە بە ترس و لەرزەوە وەستا بوو. باوکەکە گوتی:

- باوەڕت بە باوکی خۆت نییە؟

- با

- کەواتە وەرە...

منداڵەکە چەند هەنگاوێکی ناو ئەوجا وەستاو گوتی:

- من دەترسم، تۆ خۆت بڕۆ، من لێرە چاوەڕێت دەکەم

باوکەکە گوتی: وەرە، مەترسە.

- منداڵەکە گوتی: زۆر دەترسم.

باوکەکە بە نیگەرانییەوە وەستاو گوتی:

- مرۆڤ نابێ لە شتێ بترسێت کە بوونی نییە، ئەمە شتێکی زۆر خراپە. عەزیزم ئەگەر لەگەڵ مندا بێی دەبینی ئەم قسانە هەمووی درۆو دەلەسەیە، بەڵام ئەگەر نەیەیت ئەم ترسە تا ئاخری ژیان هەر لەگەڵت دا دەمێنێ.

منداڵەکە کە بە گومانەوە وەستا بوو بە ئەسپایی گوتی:

- ئەگەر هەبوایە من پێم نەدەگوتیت؟ تۆ لەگەڵمدا وەرە... تۆ یان دەبێ باوەڕت بە باوکی خۆت هەبێ یان بە باوکی مراد.

- تۆ بڕۆ من لێرە چاوەڕوان دەکەم.

باوکەکە گوتی: - چاکە چۆنت پێ خۆشە.

منداڵەکە بەوپەڕی ترسەوە، سەیری ڕۆیشتنی باوکی دەکرد. کە ئەو گەییە بەرانبەر دیواری خانووە رووخاوەکە، ئەو پەرەسێلکانەی هێلانەیان تێدا کردبوو بە جوکە جوك هەڵفڕین، چووە ژوورەوە. منداڵەکە بە ترسێکی یەکجار زۆرەوە چەند هەنگاوێ کشایەوە، بە ترسێکی

له رادەبەدەرەوە چاوەڕوان بوو. دوای کەمێ بابی لە پشت شووشەی شکاوی پەنجەرەیەکەوە بە پێکەنینەوە گوتی: – باشە. ئەم تارماییەی تۆ کوا.

منداڵەکە تۆزێ ترسی شکاو هێدی هێدی ئارام بووەوە. باوکی گوتی: هێشتا دەترسیت.

منداڵەکە هەوڵی دەدا ترس لە خۆی بڕەوێنێتەوە، بەرەو خانووەکە کەوتە ڕێ، بابی بە پێکەنینەوە تەماشای دەکرد، کاتێ نزیکی دیوارە رووخاوەکە بووەوەو وەستا. باوکەکە گوتی:

- ئەوسا، کە لێرە وازیتان دەکرد، چونکە بیرتان لە تارمایی ناکردەوە ناش ترسان، بە ئارەزووی خۆشت وازیت دەکرد... بەڵام لەوساوە کە بابی مراد ترسی شتێکی نەبووی خستە دڵتەوە دەستت بە ترساندن کرد، ئاخر بنیادەم چۆن لە شتێ دەترسێت کە بوونی نەبێ؟

باوکەکە لە خانووەکە هاتە دەرێ، منداڵەکەی لە باوەشی کردوو دوو جاران بە منداڵەکەیەوە بە نێو خانووەکەدا گەڕا. منداڵەکە لە باوەشی بابی هاتە خوارێ، لە کاتێکدا کە دەستی بابی گرتبوو بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیی. ئازایەتییەك لە سیمایدا بەدی دەکرا کە سات بە سات زیاتر دەبوو.

لە پڕ هاواری کرد، مراد... مراد.... منداڵەکە دەیویست ئازایەتی خۆی بەویش ببەخشێت.

## دژمنەکەت فەرامۆش مەکە

منداڵەکە بە وردی سەیری باوکی دەکرد. باوکەکە وێنەیەکی لە دیوارەکە دەکردەوەو هەوڵی دەدا کە نەدڕێت. وێنەکە، وێنەی پیاوێکی قەڵەوی دەموچاو گۆشتن بوو، ژێر چاوەکانی هەڵتۆقی بوون، سەر سینگی پڕ بوو لە میداڵی جۆراو جۆر، وێنەکە لە ڕۆژنامەیەکەوە دەرهێنرا بوو. باوکەکە تۆزێ کەتیرەی لە پشتی وێنەکەداو سەر لە نوێ بە دیوارەکەی ئەم بەرەوەو لە پاڵ ریزە وێنەیەکدا چەسپاندی.

دیواری ژوورەکە یەك پارچە وێنەی جۆراوجۆر بوو، لەلایەکەوە وێنەی بابە گەورە، مامەکان و باوکی کە لە مانگرتنێکی کرێکاراندا گیرا بوون، هەروەها هەندێ وێنەی دیش بوو، کە خەڵکێکی زۆری ناو خۆپیشاندان و کۆبوونەوەی فراوانی دەنواند، ئەم بەری دیوارەکە وێنەی هەندێ لە سەرۆك دەوڵەتان بوو، وێنەی رابەری حیزبەکان و هونەرمەندە نێودارەکانی سینەما بوو. منداڵەکە کە خاوەنی هەندێ لەم وێنانەی لە ڕۆژنامەو تەلەفزیۆندا بینی بوو دەناسییەوە، پیاوێکی "دەم بە پێکەنینی" نیشان باوکی داو گوتی: باوکە. ئەمە کارتەر نییە؟

باوکەکە کە تازە وێنەکەی لەوبەری دیوارەکەوە هەڵکەندبوو لەتەك وێنەکەی کارتەردا هەڵی واسی بوو، لە نێو ریزی وێنەکاندا وێنەیەك زۆر سەرنجی منداڵەکەی راکێشابوو، وێنەی پیاوێك بوو کە نیشانەیەك بەسەر باڵییەوە بوو، و دەستی بەرز گرتبوو.

پرسی: ئەم پیاوە کێیە؟ ئەوە نیشانەی چییە...

باوکی گوتی: کورِم ئەم پیاوە چاك بناسە، ئەوە بکوژی ملوێنان ئینسانە، ناویشی هیتلەرە، ئەو نیشانەیەی کە بە باڵییەوەیە خاچی شکاوە، نیشانەی نازییەکانە.

- ئەم ئیتلەرە، چ پێوەندییەکی بە ئێمەوە هەیە؟
- ئیتلەر نا کورِم، هیتلەر!... هیتلەر!....
- هیتلەر چی ئێمەیە؟
- هیتلەرو هەموو ئەو کەسانەی وەکو ئەو بیر دەکەنەوە دوژمنی ئێمە و دوژمنی هەموو خەڵکی دنیان.

منداڵەکە بەسەرسامیی گوتی: باشە کە دوژمنی ئێمەیە، بۆ وێنەکەیت لە دیوارەکە داوە کە هەموو رۆژێ فەسالی ببینین.

باوکەکە گوتی: بزانە کورِم! باش سەیری وێنەکان‌و نووسراوەکانی سەر دیوارەکە بکە، ئەم بەر وێنەی بابە گەورەتە، وێنەی مام‌و هاورِێ کرێکارەکانی ئێمەن، کە مانیان گرت، ئەمانەش وێنەی برا جووتیارەکانمانن ئەوانە برا قوتابی‌و خوێندکارەکانمانە، مئەمەش وێنەی برای شەهیدی شۆرِشگێرمانە، ئەمەش وێنەی راپەرِینی چەکدارانەی خەڵکی دلێری ئەفریقان، ئەمانە هەموو دۆستی ئێمەن.

ئێستا لە دیوارەکەی ئەو بەرەوە چی دەبینی؟ ئەوەیان ئەستێرە ناودارەکانە، وێنەی هەندێ لە سەرۆك دەوڵەتان‌و کۆمەڵێك رابەری حیزبەکانە، ئەم زەلامەی خەریکە گوللە بەسەری پێشمەرگەیەکی ڤێتنامییەوە دەنێت، ئەمە وێنەی هیتلەرە، ئەمە موسولینییە، ئەمەش پارەی هەندێ دەوڵەتە.

منداڵەکە پرسی: – ئەمانە هەموویان دوژمنی ئێمەن؟

- کورِم ئەمانە کە دەبینی، خوێنی ئێمە دەمژن، شاعیرێکی چەوساوان دەڵێ:

"ئەوان هەزار پێ....

ئەوانە ماری ژەهردارن"

- ئەی بۆ وێنەکانیانت هەڵواسیوە، بیان درِێنە، یا بیان سوتێنین. یا تەنیا, وێنەی دۆستەکانمان بە دیوارەکەوە بێت.
- من کە وێنەی دوژمنەکانمان بە دیوارەکەوە هەڵدەواسم، لەبەر ئەوە نییە کە خۆشم دەوێن، بەڵکە لە بەر ئەوەیە کە نامەوێ لە بیریان بکەم، چونکە کەسێك کە دوژمنانی, خۆی فەرامۆش بکات رێگای هاورِێکانیشی فەرامۆش دەکات. من ئەمانەم لەبەر چاوم هەڵواسیون بۆ ئەوەی بە نێونەخت لە یادم نەرِۆن. بەیانیان پێش ئەوەی بچم بۆ سەر کار سەیریان دەکەم، ئەم وێنانە بەمن دەڵێن: عەولا... دوژمنانی راستەقینەی تۆ ئێمەین، کە

دەبینی گۆشت گران بووە بۆڵە بۆڵ بەسەر قەسابدا مەکە، کە نان گران دەکرێت لە نانەوا تووڕە مەبە، تەنانەت کاتێ کە لە کارخانەدا لەگەڵ هاوڕێیەکتدا دەم بۆڵەت دەبێ بزانە کە هۆی بنەڕەتی ئەمانەن. لە راستیدا کوڕم کە خەڵکانی هەژار بۆ پاروە نانێ دەمرن خەتای ئەمانەیە. کوڕم فریوی ئەم ئارتێستانە مەخۆ، هیچ کاتێ باوەڕ بە خەندەی شیرینیان مەکە.

منداڵەکە باش لە قسەکانی بابی حاڵی نەبوو بوو، بەڵام خەریك بوو شتی تازەی لە مێشکیدا دروست دەکرد. پرسی:

- ئەو پیاوەی کە میداڵی هەیە، ئەوە کێیە؟ بۆ لەو بەرەوە هەڵت کەندو لەم بەرتدا؟

- کوڕم، بیری مرۆۋ دەگۆڕێ، کامڵتر دەبێ، من تا ئێستا ئەوەم بە دۆست دەزانی، بەڵام دوایی زانیم کە یەکێکە لە دوژمنە سەرەکییەکانی ئێمە. بزانە! ئێمە کرێکارین، چەندین ساڵ بەسەرمانەوە بوون، هەندێ قسانیان دەکرد، وامان دەزانی، راستە، بەڵام کاتێ کە بڕیاماندا، خۆمان بیر بکەینەوەو خۆمان لە راستییەکان تێ بگەین، شتی تازە فێر بووین. هەڵبەتە زۆرم لەم بارەیەوە بیرکردەوە تا توانیم بڕیار بدەم، بیرم کردەوەو بڕیارم دا.

منداڵەکە لە کاتێکدا بە وردی سەیری وێنەکەی دەکرد، پرسی: - باوکە!..... ئەم پیاوە چی کردووە کە ئەم هەموو میداڵەی وەرگرتووە؟!...

------------------

1- ئیت "لە زمانی تورکیدا بە واتای سەگو خەڵکی هیچو پوچ دێت" -لر- نیشانەی کۆیە. ئیتلر بە مەعنای سەگو هیچو پووچەکان دێت.

## عەربانەی دارین

منداڵەکە بە گریانەوە بۆ ماڵەوە هاتەوە. بابی پرسی: - چی بووە کوڕم!

منداڵەکە گوتی: -من عەرەبانەم دەوێ، ئەکرەم عەرەبانەیەکی دارینی هەیە بەڵام نایەڵێ من سواری بم.

باوکی گوتی: -ئێوە هاوڕێی یەکدین، یەك عەرەبانە بۆ هەردووکتان بەسە.

منداڵەکە گوتی: - ئاخر ئەکرەم من سوار ناکات، هەر خۆی سوار دەبێ. من دەیکوژم، دەڵێ "ئەم عەرەبانەیە هی منە، تۆش ئەسپی منی"

- ئێوە دەمێکە هاوڕێی یەکترن، زۆریش یەکتان خۆشەوێ.. ئێستا چی بووە؟

منداڵەکە فرمێسکەکانی سڕیو گوتی: - باوکی عەرەبانەیەکی تەختەی بۆ دروست کردووە، تا عەرەبانەی نەبوو بەینمان خۆش بوو، زۆریش خۆش بوو تا ئەسپە دارینەمان هەبوو پێکەوە سوار دەبووین، بەڵام لەوەتەی باوکی عەرەبانەی بۆ دروست کردووە، ڕەوشتی

گۆڕاوەو بە هیچ جۆرێ من سوار ناکات، خۆی سوار دەبێ‌و من عەرەبانەکە رادەکێشم. هەندێ جار منداڵانی دیش رای دەکێشن...

- باشە تۆ رای مەکێشە.
- من رای نەکێشم، منداڵانی دی رای دەکێشن، من پێی دەڵێم "ئەکرەم با من سوار بمو تۆ رای بکێشە، ئەوجا تۆ سوار بەو من رای دەکێشم" دەڵێ: "نابێ هەموو منداڵان مەمنونن عەرەبانەکەی من رابکێشن" زۆر بە عەرەبانەکەیەوە دەنازێ.. لەوە دەچێ باوکی بۆیەی سەوزو سپی بۆ کرێ بێ‌و دەیەوێ رەنگی بکات.
- بە منداڵەکان بڵێ با ئەوانیش رای نەکێشن. کاتێ هەموو قسەتان بوو بەیەك‌و یەکتان گرت ئەوسا ئەویش ناچارە بێڵێ هەمووتان سوار ببن.
- منالّەکان بە قسەم ناکەن... هەموو بە دوای "ئەکرەم"ەوەن.

بە ئەکرەمم گوت: "من هاورێتم، من سوار بکەو توش تۆزێ من رابکێشە"

گوتی: نە ء. نە من سوار دەکات‌و نە منداڵەکانی دیکە.

باوکەکە کەمی بیری کردەوەو گوتی: - دەبینم لەوساوە ئەم عەرەبانە دارینە پەیدا بووە، ئەکرەم گۆڕاوە.. باشە ئەگەر ئەکرەم عەرەبانەی نەبوایە، من عەرەبانەیەکم بۆ تۆ دروست کردبایە دڵنیایت کە تۆش وەکو ئەکرەم نەدەبویت؟ سواری عەرەبانەکە نابوویت‌و منداڵەکانت دوای خۆت نەدەخست؟ پێوەی نانازیت؟

- من وەکو ئەکرەم نابووم... من... من گشت منداڵەکانم سوار دەکرد.

باوکی بە پێکەنینەوە گوتی: -باشە کوڕم، کەوایە، یەك عەرەبانەی دارینت بۆ دروست دەکەم.

منداڵەکە شاد بوو، و گوتی: - لە عەرەبانەکەی ئەکرەم جوانتر بێ، بە بۆیەی سووریش بۆم رەنگ بکە.

باوکەکە سەر گەرمی دروست کردنی عەرەبانەکە بوو، منداڵەکەش بە خۆشییەوە چاوەڕێی تەواو بوونی بوو. کە عەرەبانەکە تەواو بوو، باوەشی بە باوکیدا کردو ماچی کرد، ئەوجا بەرەو لای منداڵەکان غاریدا. باوکەکە کە چاوی بڕیە بووە کوڕەکەی، سەیری کرد کە یەکێك لە منداڵەکان ویستی سواری عەرەبانەکەی ببێ، کوڕەکەی بە توورەییەوە پاڵی پێوەناو هاواری کرد:

- عەرەبانەی خۆمە!....

دوای کەمێکی تر، لە حاڵێکدا کە با چوو بووە کەوڵییەوە لە ئەکرەم نزیك بووەوە و بێ ئەوەی لەو جیا بێتەوە، منداڵەکانی یەك یەك ناچار دەکرد کە عەرەبانەکەی رابکێشن.

ئەکرەم گوتی: - عەرەبانەکەی من باشترە.

منداڵەکە گوتی: - نەخێر هینەکەی من باشترە.

ئەکرەم گوتی: - وەرە پێشبڕکێ بکەین.

- باشە، پێشبڕکێ دەکەین.

هەردووکیان بە لووت بەرزییەوە لە نێوان منداڵەکاندا ئەسپیان هەڵبژارد... باوکیشی بە ناڕەحەتییەوە پێکەنی.. ژنەکەی کە بینی مێردەکەی بەبێ هۆ پێ دەکەنێ پرسی: -خێربێ، بەچی پێ دەکەنی. پیاوەکە گوتی: -بە عەرەبانە.

ژنەکە ڕوانییە لای منداڵەکان، عەرەبانەی ئەکرەمو کوڕەکەی ئامادەی پێشبڕکێ بوون! "یەك.. دوو.. سێ" سێیەم تەواو نەبوو بوو عەرەبانەکان کەوتنە ڕێ. ئەکرەمو کوڕەکەی بەدەست لاسایی قەمچی ڕاوەشاندنیان دەکردەوەو هاواریان دەکرد "هێ.. هێ..." منداڵەکانی دی سەرگەرمی پێشبڕکێیەکە بوونو بە دوای عەرەبانەکاندا غاریان دەداو منداڵێك کە کەوتبوو خەریك بوو لە دوای عەرەبانەکانەوە دەگریا.

## کوڕم لە ژیانا تەماشاکەر مەبە

تازە خەریك بوو فێری پاسکیل دەبوو... چونکە نایتوانی سەنگی خۆی ڕابگرێ، هەمیشە بە زەویدا دەکەوت، هەرکە دەشکەوت دەستوپێی برینداردەبوو، و ئازاری دەگەیشتێ. منداڵەکە گوێی بە ئازاری ئەژنۆو باسکی نادا، بەڵام کە منداڵەکان گاڵتەیان پێ دەکرد سات بە سات زاتی خۆی لە دەست دەداو بە خۆی دەگوت: "تۆ بڵێی فێری پاسکیل ببم؟" ئەو خۆی لە نێو ئەو منداڵانەدا کە لە نێو تەپو تۆزداو بە پاسکیلی کرێو بێ ئیستاپ خۆیان فێر دەکرد، لە هەموویان بە کەمتر دەزانی، هەستی بە جۆرە بێ متمانەییەك دەکرد. ماتو خەمبار لە کاتێکدا کە دەستو پێی ئازاریان پێ گەیی بوو، پانتۆڵەکەی لە سەر ئەژنۆیەوە درابوو، قۆڵی کراسەکەی هەڵدڕابوو بۆ ماڵێ گەڕایەوە. دایکی بە توڕەییەوە هاواری کرد:

- دیسان پاسکیل؟ هەر ڕۆژەی شوێنێکی جلەکانت دەدڕێت. لە دەستت بێزار بووم، ڕۆژێکیش مێشکت داغان دەکەیت. ئەوساکە لە دەستت ڕزگار دەبم.

منداڵەکە گوتی: -ئیدی سواری پاسکیل نابم.

دایکی گوتی: سوپاس بۆ خوا کە ئاقیبەت ئەقڵت هاتەوە بەر.

منداڵەکە مات بوو، بەڵام نایتوانی ئەو کەسەرانەی دڵی فەرامۆش بکات.

دایکی دیسانەوە پرسی: -هەر چەندم پێ گوتیت نەمتوانی حاڵیت بکەم کە سواری ئەو شڕە پاسکیلە مەبە، چویت هەموو پارەکانت کردە مشتی ئەو پاسکیلچییە کەچەڵەوە!... باشە... چۆن بوو کە ئیدی ناتەوێ سواری پاسکیل ببی؟

منداڵەکە گوتی: پێم وایە ناتوانم فێر ببم... منداڵەکان پێم پێ دەکەنن، گاڵتەم پێ دەکەن، من ئیدی ناچمە لای ئەوان.

دایکەکە گوتی: کارێکی چاك دەکەیت.. بە پارەکەت خواردن بۆ خۆت بکڕە، نوقوڵ، نۆك... ئاخری شوێنێکی خۆت سەقەت دەکرد، باش بوو، وەرە ماچت بکەم.

عەسر کاتێ کە باوکەکە گەڕایەوە، دایکەکە گوتی:

- ئاگات لێیە؟... کوڕەکەت ئیدی سواری پاسکیل نابێ.

باوکەکە پرسی: بۆ؟

گوایە منداڵان پێی پێ دەکەنن، کاتێ کە دەکەوێ گاڵتەی پێ دەکەن،

باوکەکە گوتی: ئاوها؟.... هەر لەبەر ئەمە؟

- بەڵێ.... هەموویان پێم پێ دەکەنن.. کاتێ کە دەکەوم فیکە دەکێشن هۆیها دەکەن... خەریکە دەترسم کە ئیدی سواری پاسکیل بم.

باوکەکە کە بێ باوەڕی و بەزینی لە سیمای منداڵەکەیدا دەبینی.

گوتی: حەز بەم کارەت ناکەم. ئەم کارە جۆرە ترسنۆکییەکە، بەم کارە دەگوترێ بەزین و هەڵاتن. ترسنۆکی.

- بۆچی هەڵاتن؟

- ها... بۆ؟

- من کە ترسنۆك نیم... هێندە کەوتم هەموو دەستو پام ئازاریان گەیشتێ، بەڵام هیچ نەگریام. بەسەر سەردا کەوتمو نەگریام، من لە کەوتن ناترسم...

- لە کەوتن ناترسیت، بەڵام لە پێکەنینو گاڵتەی منداڵان دەترسیتو وازت لە پاسکیل سواری هێناو هەڵاتیت؟ کوڕەکەم... ئەمە جۆرە ترسانێکە، جۆرە هەڵاتنێکە... ئەمەش خراپترین شتە.

منداڵەکە خەریك بوو لە مەبەستی بابی حاڵی دەبوو، بەڵام زاتی ڕووبەڕووبوونەوەی پێکەنینو تەوسی منداڵانی لە خۆیدا نابینی.

باوکەکە گوتی: - هەموو کارێك لە هەوڵەوە وایە.. وەستاترین بەرگ دروو لە هەوەڵەوە دەرزی گرتن شارەزا نەبووە، باشترین مەلەوانی دنیا وەختێ یەکەم جار ویستویەتی بچێتە نێو ئاوەوە ڕەنگە ترسابێ. زۆر نمونەی تری لەم بابەتە هەیە.

باوکەکە، ماوەیەك دیقەتی دەموچاوی منداڵەکەی دا تا ببینێ کە قسەکانی کاریان تێ کردووە یان نا، ئەوجا گوتی:

- سبەینێ یەکەم کارت ئەمە بێ بچیتەوە لای هەمان پاسکیل چی... وەرە... ئەمەش پارە... بزانە، منداڵان پێت پێ دەکەنن، گاڵتەت پێ دەکەن، هۆیهات لێ دەکەن، بەڵام بە هیچ جۆرێ گوێیان مەدەرێو لە قینی ئەوان فێری پاسکیل ببە. هەموو کارێك بەو جۆرەیە.. هەموو کارێك لە هەوەڵەوە زەحمەت دێتە پێش چاو... حاڵی عەرزم بوویت؟ 3- 4 ڕۆژ پێت پێ دەکەنن، 4-5 ڕۆژ فیکە دەکێشن، دوایی چی؟ خۆ ژیان تەنیا پاسکیل نییە، ڕەنگە گەلێ کاری ترت بێتە پێش.. تەنیا هەوڵ بدە گاڵتەو شۆخی ئەوان نەت ترسێنێ... هەوڵ بدە.

دایکەکە گوتی: – شتی چاك فێری منداڵەکە دەکەی!..

باوکەکە منداڵەکەی کردە باوەشی، لە کاتێکدا کە دەستی بەسەریدا دەهێنا گوتی: –گوێ بگرە!.. دایکی منیش وەکو دایکی تۆ بوو. منی زۆر خۆشەویست، بیری هەر لە لای من بوو ئاخر تاقانەی ئەو خێزانە بووم، دەترسا شتێکم بەسەر بێ، هەمیشە دەیگوت: "مەچۆ سەر درەختان دەکەوی، مەچۆ نێو ئاوەوە دەخنکێی، هێندەی گوتەوە تا منی وەکو تەماشاکەرێك پەروەردە کرد. بەڵام کورم تەماشاکەری لە ژیاندا کارێکی گەلێ خراپە.. لە ژیاندا بنیادەمێکی شکست خواردوو هەزار جاران لە یەکێکی تەماشاکەر چاکترە. لە دنیای بوکسێندا، بوکس وەشێنێکی مام ناوەنجی بە باشترە لەوەی کە تەماشاکەرێکی باشی بوکسێن بیت.

کوڕەکە لە بیری ئەو منداڵانەدا بوو کە گاڵتەیان پێ کردبوو. باوکی گوتی: –نەیەڵی ئەو منداڵانە بت ترسێنن کوڕم؟

## من شۆڕشم ناوێ، هەڵوژەم دەوێ

منداڵەکە گوتی: –من ناڕۆم بۆ لای دکتۆر!

بابی گوتی: –بۆچی؟

منداڵەکە گوتی: – لە دەرزی دەترسم.

باوکی گوتی: – بزانە کوری نازدارم! باش گوێ لە قسەکانم بگرە، تۆ نەخۆشیت، بۆ ئەوەی چا ببیتەوە، پێویستە بۆ لای دکتۆر بچیت، دکتۆر چارەسەرت بکاتو بزانێ چیتە... دەبێ راچێتەت بۆ بنووسێت.

منداڵەکە گوتی: –من دەرمان ناخۆم، دەرمان تاڵە.

دایکی گوتی: –کەواتە لە نێو جێدا بکەوە تا بمریت!

باوکی گوتی: –هەندێ کەس وێرای ئەوەی گەورەشن، دەترسن بچنە لای دکتۆر، دەزانن کە نەخۆشن بەڵام دەترسن بزانن کە چ نەخۆشییەکیانە. خۆیان لەگەڵ نەخۆشییەکەدا دەسازێنن، بەڵام بۆ لای دکتۆر ناچن، نابێ لە دکتۆر، لە شرینقەو لە ناوی نەخۆشییەکە بترسین. ئێمە ئەگەر نەخۆشی لە نێو نەبەین، ئەو ئێمە لە نێو دەبات. منداڵەکە گوتی: – من ناتوانم نەخۆشی لە نێو بەرم!

باوکەکە دەستی بەسەر نێوچەوانی منداڵەکەیدا هێناو گوتی:

– تۆ دەڵێی لە نێو ئاگردایت.

منداڵەکە گوتی: – من دەرمان ناخۆم

دایکی گوتی: –دەرد بخۆی.

باوکی گوتی: –بزانە کوڕی شیرینم! منجڕ مەبە، منجڕی کارێکی خراپە، ئەگەر بۆ لای دکتۆر نەچیت نەخۆشییەکەت زیاد دەکات... هەموو شتێ لە سەرەتاوە بچووك دیارە بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر دەبێ، گەشە دەکات. ئەگەر ڕوباری بچکۆلە نەبن ڕوباری گەورە دروست نابن، ئەگەر ڕوباری گەورە یەك نەگرن، دەریای گەورە دروست نابن. درۆی بچکۆلە ڕێ بۆ کاری خەراپ خۆش دەکات و کارە خراپە بچووکەکان دوایی دەبن بە کاری خراپی گەورە.

منداڵەکە گوتی: –من بۆ لای دکتور ناچم، من هەڵوژەم دەوێ.

باوکی گوتی: – بەم زستانە هەڵوژە کوانێ؟!

دایکی گوتی: –ئەگەر بۆ لای دکتور بچیت هەڵوژەت بۆ دەکرم.

منداڵەکە گوتی: –نە بۆ لای دکتۆر دەچم! نە هەڵوژەم دەوێ.

باوکی گوتی: پێویستە ئازا بیت. ئەگەر شرینقە لە خۆ بدەی یان دەرمان بخۆیت مانای وایە بەسەر ترسدا زاڵ دەبیت، بەڵام ئەگەر ئەم کارە نەکەیت هەمیشە هەر نەخۆش دەبیت، ئێستا بڵێ بزانم تۆ لایەنگری خۆتی یان لایەنگری نەخۆشی؟

منداڵکە گوتی: –من لایەنگری هەڵوژەم

دایکی تووڕە بوو گوتی: خەتای خۆتە کە ڕووت بەم منداڵە داوە... لە بری ئەم چەنەبازییە بیکە باوەشت با بڕۆین بۆ لای دکتور، دەگری بە ڤیروسیا.

منداڵەکە دەستی بە گریان کرد: من بۆ لای دکتور ناڕۆم.

باوکی گوتی: –مەگری... گوێ بگرە: تۆ منداڵیت و من و دایکت گەورەین، ئەگەر بمانەوێ بە دوو قۆڵی دەتکەینە باوەش و بۆ لای دکتورت دەبەین و دەرەقەتیشمان نایەی. بەڵام ڕاست نییە بە زۆر کارێکت بەسەردا بسەپێنین کە قازانجەکەی بۆ خۆتە، وانییە؟ من دەمەوێ کە باوەڕمان پێ بکەیت کە ئەگەر بۆ لای دکتۆر بچی قازانجی خۆتە. باشە ئێستا دێی بۆ لای دکتۆر بڕۆین؟

منداڵەکە گوتی: –ناڕۆم!

باوکی نەیتوانی جڵەوی پێکەنینەکەی بگرێ.

منداڵەکە گوتی: –بۆ پێدەکەنی

باوکی گوتی: – وەکو تۆ چۆن لە دکتور دەترسیت، هەندێکیش هەن لە شۆڕش دەترسن. لە بەدبەختی، دەست کورتی، زوڵم و زۆرداریدا دەناڵێنن و هاوار دەکەن، بەڵام لە شۆڕش کە دەتوانێ ڕزگاریان بکات دەترسن، بەوانە پێدەکەنم.

منداڵەکە گوتی: – شۆڕش چییە؟

باوکی بیری کردەوە گوتی: –ئەگەر بتوانی باوەڕ بە من بکەیت و بۆ لای دکتۆر بچیت، ئەمە بۆ تۆ جۆرە شۆڕشێکە.

منداڵەکە لە حاڵێك دا کە بە دەنگی بەرز دەگریا گوتی:

– من شۆڕشم ناوێ... من هەڵوژەم دەوێ.

## ئەگەر شەڕ نەبێ ئاشتیش نابێ

منداڵێك بە بابی گوت:

- بابە!.... لە پۆلەکەماندا کوڕێکی بەرەڵڵا هەیە هەمیشە قەڵەمەکەی دەردێنێ و بەپشتی سەرمیا دەکێشێت....
- بۆچی؟
- نازانم... لە پشت منەوە دانیشتووە. باوکی سەرۆکی پۆلیسە لە کاتی دەرسدا هەمیشە قژم دەردێنێ...

دایکی گوتی:

- ئەوە چ منداڵێکە.. چما مامۆستاتان نییە؟ چما نابینێ، ئەگەر نایبینێ بۆ خۆت زمانت نییە شکات بکەی. بڵێ وا نەکات... بڵێ: "مامۆستا گیان ئەم کوڕە تەمێ بکەن، لێم دەدا" منداڵەکە دوو دڵ وەستابوو. باوکی گوتی:
- کوڕم، ئەوە هاوڕێی تۆیە، شکات مەکە... ئەم چەشنە شکاتە یەکەم دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەمیشە پشت بە کەسانی دی ببەستیتو باوەڕت بە خۆت نەبێ، دووەم: ئەگەر شکات بکەیت دەڵێن دوو زمانەو، ئەمەش گەلێك خراپە... ئەوسا نێوت دەنێن دوو زمان.
- باشە باشە... لە منداڵەکە بدەنو بێدەنگ بێ...
- باوکەکە تۆزێ بیری کردەوەو گوتی:
- سبەی بڕۆ ڕێك و ڕەوان لەگەڵ ئەو هاوڕێیەتدا قسان بکە، پێی بڵێ "بزانە هاوڕێ!... ئێمە هەردووکمان هاوپۆلینو چ دوژمنایەتییەکمان لە نێواندا نییە" بڵێ "ئەو کارەی تۆ دەیکەیت ڕاست نییە... چیدی بەسەرما مەکێشە" ئەگەر قایل نەبوو، جارێکی دیش لێی دایت هەر تووڕە مەبە... هێدی بەو دیسان تێی بگەیەنەوە کە لێت نەدات... ئەگەر ئەمجارەش بە قسەی نەکردیت ئەوا پێش ئەوەی بچنە پۆلەوە بە دەنگی بەرز بڵێ هاوڕێیان!... ئەم برادەرەمان بەبێ هۆ دەکێشێت بەسەرما چەند جارێ پێم گوتووە کە ئەم کارە مەکە، کەچی گوێی نەدامێ، ئەگەر ئەمجارە دووبارەی بکاتەوە لێی دەدەم.

خۆ ئەگەر دەست بەردار نەبوو، ئەوە تۆش بەڕاستی لێی بدە، بەڵام نەك بچیت لێی بدەیتو ڕا بکەیت، چونکە کارێ کە دەستت پێوەدا دەبێ تەواوی بکەیت، هەڵبەتە ئەویش دەتوانی لە تۆ بدات بەڵام مەترسە.. ئەگەر پیاو لە خەبات بترسێ هەرگیز سەرکەوتوو نابێ "بەبێ ڕەچاو کردنی شەڕ، ئاشتی نابێت". منداڵەکە بە وردی گوێی بۆ قسەکانی بابی شل دەکردو هەوڵی دەدا لە مەبەستەکانی بابی تێ بگات.

باوکەکە گوتی:

- حاڵی بوویت کە دەمەوێ چی بڵێم؟

منداڵەکە گوتی:

- حاڵی بووم، بەڵام ئەگەر نەتوانم لێی بدەم؟
- ئەگەر نەتوانی لێی بدەیت، تێ دەگات کە ئەگەر ئەو لە تۆ بدات تۆش لەو دەدەیت، بەلای کەمەوە تێ دەگات کە بەرگری لە خۆت دەکەیت و لەبەر ئەمە سڵت لێ دەکاتەوە... وانییە! منداڵەکە پێکەنی و باوکی لەسەری رۆیی.
- لەوانەشە بتوانی لێی بدەیت و لەبەر ئەمە رەنگە منداڵەکانی تریش لێت بترسن و شەرت پێ نەفرۆشن و تۆش سوود لەم مەسەلەیە وەربگری تا ئەگەر شتێ بوو دەست نەپارێزی. بەڵام ماڤ ئەوەت نییە شەر بە چ کەسێك بفرۆشیت، بەڵکو ئەگەر یەکێك شەڕی بە یەکێك فرۆشت نەیەڵیت. ئەگەر یەکێك شەڕی فرۆشت و تۆ بینیت و بە بێدەنگی مایتەوە، ئەوا تۆش شەریکی ئەو شەڕ فرۆشەیت... حاڵی بوویت کوڕم؟

منداڵەکە هەوڵی دەدا لە مانای قسەکانی بابی تێ بگات.

## ناوکە شێلانە

منداڵێکی بچکۆلانە زۆری لە خۆی دەکرد کە ناوکە شێلانە بە ددان بشکێنێ. باوکی گوتی:

-کوڕم!... ناوکە شێلانە بە ددان ناشکێنرێ.

منداڵەکە دیسان گازی لە ناوکە شێلانەکە گرت، ناوکە شێلانەکە جیڕەی دەهات و ددانی منداڵەکەش جیڕەی دەهات. منداڵەکە دەستی بۆ ددانی برد کە دەیەشا.

باوکی گوتی: - ناوکی شێلانە زۆر قایمە، ددانەکانت خراپ دەبن، منداڵەکە چوو بوو بەقینا، ئیلان و بیلان دەیویست ناوکە شێلانەکە بشکێنێ، ناوکەکەی لەسەر زەوییەکە دانا، بەناو لەپی زۆری لێ کرد، ناوکەکە نەشکا.

منداڵەکە گوتی: -ئەگەر تۆ منجڕیت، ئەوا من لە تۆ منجڕترم. ئەمجارەیان بەردێکی هەڵگرت و ویستی ناوکەکەی پێی بشکێنێ، بەڵام ناوکەکە هەر جارەی بە لایەکدا دەردەپەڕی.

باوکی گوتی: -کوڕم!.. ناوکی شێلانە زۆر قایمە، بەو بەردە بچووکە ناشکێت.

منداڵەکە لە داخا شەقێکی لە ناوکەکە هەڵدا، ناوکەکە لە نزیکی بۆڕی ئاوەکەوە کەوتە سەر زەوی، ئەویش بە تووڕەیی پێی خستە سەر ناوکەکەو بە تەواوی لە ئەرزەکەدا نوقمی کرد. رۆژان تێ پەڕین، منداڵەکە ناوکە شێلانەکەی بیر نەما. رۆژێك کە لەگەڵ منداڵانی گەرەکەکەیاندا خەریکی وازی کردن بوو باوکی بانگی کردو گوتی: ئەمە چییە کوڕم.

منداڵەکە سەیری ئەو شوێنەی کرد کە باوکی ئیشارەتی بۆ کردبوو. دوو گەڵای سەوزی بچکۆڵە لە ئەرزەکەوە سەریان دەرهێنا بوو، منداڵەکە گوتی:

- ئەمە گیایە.

باوکی گوتی: - نەخێر گیا نییە، ئەمە درەختێکە کە چرۆی کردووە، لەو ناوکەوە هاتووەتە دەرێ کە تۆ نەتتوانی بە ددان یان بە بەرد بیشکێنی.

ناوکە قایمەکە هاتەوە یادی منداڵەکە. ئەو ناوکەی کە نەیتوانی نەبە ددان و نە بە بەرد بیشکێنی. ئێستا چرۆی دەرکردبوو، تا دوایی ببێ بە درەخت، شکۆفە بکات و شێڵانە بگرێ.

سەری سورما.

باوکی پێی گوتی: - هەمیشە لە کاتی تەنگانەدا ناوکە شێڵانەکەت لە یاد بێ. ناوکێ کە نەتتوانی بە ددان یان بە بەرد بیشکێنی، کاتێ کەوتە سەر زەویەکی لە بارو وەختی هات توێکڵە سفت و قایمەکەی شەقی برد، بە ناخی زەویدا چوو، و سەوز بوو، کوڕی نازدارم! چی ئەم توانایەی بەو ناوکە بەخشی. ناوکەکە ئەو هێزو توانایەی لە ناوەوەی خۆی وەرگرتووە. هەموو شتێك لە ناخی خۆیدا دژی خۆیشی پێیە کە دەتوانێ بیگۆڕێت و شتێکی تری لێ دروست بکات.

منداڵەکە بە وردی گوێی لە باوکی دەگرت و باوکی لە حاڵێکدا کە پێدەکەنی گوتی:

- کوڕم! هەمیشە ناوکە شێڵانەکە بێنەوە یادی خۆت و باوەڕ بە توانای خۆت بکە.

--------

1- شێڵانە: قەیسی.

## فریو نەخۆی

منداڵەکە گوتی:

- منیش دێم بۆ لای خاڵم

خاڵی لە زیندان بوو. باوکی گوتی: - باشە. دایکی ئەو خواردنانەی ئامادەکرد کە خاڵە حەزی لێ بوون، لەگەڵ هەنێ جلی شۆراوو پاك و تەمیزدا خستییە ناو جانتایەکی نایلۆنی گوڵدارەوەو لە منداڵەکەی پرسی: - تۆ چی بۆ خاڵت دەبەی؟

منداڵەکە گوتی: مێوژ دەبەم.

باوك و کوڕەکەی کەوتنە رێ. لە رێگا مێوژ، نۆك، جگەرەو هەندێ سەوزەو خواردنیان کڕی.

منداڵەکە گوتی:

- خاڵۆ حەز لە کەرەوزیش دەکات.

کەرەوزیانیش کڕی.

بەردەم زیندان قەرەباڵغ بوو، بۆ دیدەنی ریزیان بەستبوو. ئەوانیش ریزیان گرت، منداڵەکە کە یەکەمجار بوو زیندانی دەبینی بەسەرسامی سەیری هەموو شتێکی دەکرد. هەموو شتێکی بەلاوە تازە بوو. یەکێك لە ئاشنایان کە تازە خەریك بوو لە دیدەنی دەگەڕایەوە بە باوکەکەی گوت: –رەزای ئێوەشم بینی. جووتێ پێڵاوی دەویست، گوتی نمرە چل بێ. رەزا ناوی خاڵە بوو. باوکەکە بە منداڵەکەی گوت: – تۆ لێرە دانیشە ئاگاداری شتەکان بە با من برۆم جووتێ پێڵاو بۆ خاڵت بکرم.

منداڵەکە لەو شوێنەدا کە بابی بۆی دەست نیشان کردبوو، دانیشت، باوکەکە گوتی: – ئاگاداربە نەیەڵی دز شتەکان بدزێ. منداڵەکە گوتی: نایەڵم.

بۆ ئەوەی شتەکان نەدزن بە وردی ئاگاداری دەکردن‌و دەستێکی لەسەر جانتای جلەکان‌و دەستەکەی تریشی لەسەر زەمیلە سەوزەکە دانا بوو. چوار چاوو بە وریاییەوە ئاگای لە هەموو کەسێك بوو. باوکی گوتبووی "ئاگاداربە" کەواتە دیار بوو لە نێو ئەم قەرەباڵغییەدا کەسێك دەیتوانی دزی بکات. بەڵام دیار نەبوو لە نێو ئەم هەموو خەڵکەدا کێ دز بێ، لەم بیرانەدا بوو کە پیرەمێردێکی دەم بە پێکەنین لێی نزیك بووەوەو گوتی: – بچکۆل گیان!... چاوەڕوانی کێی؟

منداڵەکە گوتی: – چاوەڕێی باوکم.

– تۆ کوڕی کێیت؟

– کوڕی یوسف.

– ئە... ها... بڵێ تۆ کوڕی یوسفی خۆمانی.. ئەی باشە باوکت کوانێ؟

– چووە پێڵاو بۆ خاڵم بکڕێ منیش لای شتەکانم

– باشە وریابە لێتی نەدزن.

– منیش لەبەر ئەمە لێرەم... تەماشاکە دەستێکم لەسەر ئەم جانتایەیەو دەستێکم لەسەر ئەویان.

– ئافەرین بۆ تۆ.. ئافەرین.. وریابە.

منداڵەکە گوتی: – ئەمانە بۆ خاڵە رەزان... دەی ناسیت؟

– ئەدی چۆن.

منداڵەکە بە زەردەخەوە سەری لەقاند. پیاوەکە گوتی: "خاڵە رەزات زۆر چاك دەناسم"و لە کاتێکدا کە بە خۆشەویستییەوە دەستی بەسەر منداڵەکەدا دەهێنا، لە تەکیا دانیشت.

منداڵەکە گوتی: – تۆش بۆ لای خاڵەم هاتوویت.

پیاوەکە گوتی: – بەڵێ، جوابی ناردبوو کە بێم.

منداڵەکە گوتی: – تۆش کوڕت هەیە.

پیاوەکە گوتی: – هەمە.

منداڵەکە گوتی: – دوو ددانم کەوتوون.

پیاوەکە گوتی: – کوا بی بینم.

منداڵەکە دەمی کردەوە پیاوەکە گوتی: منیش سێ ددانم کەوتوون پیاوەکە دەمی کردەوەو جێگای ددانە کەوتووەکانی بە منداڵەکە نیشاندا ئەوجا بە دەم ئەندازە گرتنی جانتاکەوە پرسی: "چیت بۆ خاڵت کڕیوە".

– هەموو شتێ. کەرەوزیشم بۆی کڕیوە، حەزی لێ دەکات.

پیاوەکە گوتی: – دەزانم، دەزانم. خاڵت لە هەموو شتێ پتر حەزی لە سەوزەو کاستەرە کاستەریشت بۆی کڕیوە؟

منداڵەکە گوتی: نەء. ئەگەر باوکم بێتەوە کاستەریشی بۆ دەکڕین.

پیاوەکە گوتی: – ئەمە نابێ، خاڵت زۆری حەز لە کاستەرە، دەبێ کاستەریش بکڕین.

منداڵەکە گوتی: – منیش حەز لە کاستەر دەکەم.

– کەوایە منیش هەم بۆ تۆو هەم بۆ خاڵت کاستەر دەکڕم. چوار دانە بکڕە، یەکی بۆ خۆت یەکی بۆ خاڵت یەکێ بۆ منو یەکێ بۆ باوکت. پیرەمێرەدەکە (5) لیرەی بە منداڵەکەدا، کاستەر فرۆشێك کە بە عەرەبانە کاستەری دەفرۆشت لەو ناوە بوو. منداڵەکە پارەکەی وەرگرتو بەرەو لای کاستەر فرۆشەکە غاریدا. کاستەرەکانی کڕیو گەڕایەوە. کە گەڕایەوە بینی نە پیرەمێردەکە ماوەو نە شتەکان. دەستی بە گریان کرد.

باوکەکە بینی کوڕەکەی دەگریو کاستەرەکان بە دەستییەوە شل بوونەتەوە، پرسی: چی بووە؟ بۆ دەگریت؟

منداڵەکە شتەکەی بۆ گێڕایەوە. باوکی بە هەراسانی بەڕاستو چەپدا دەیڕوانی، بەڵام کابرا دیار نەبوو.

باوکی گوتی: – مەگری.. چار نییە... خۆت سەلامەت بی.

کاتی دیدەنی، وەختێ کە خاڵە ڕەزا مەسەلەکەی زانی گوتی:

– خوارزا... دەزانی چۆن ماسی دەگرن؟

منداڵەکە گوتی: – نا، نازانم.

خالێ پێکەنیو گوتی: –چەشەیەك بە سەری قولاپەکەوە دەکەنو هەڵی دەدەنە نێو ئاوەکەوە، ماسی ساویلەکەو خۆش باوەڕ دێتو دەیەوێ چەشەی سەری قولاپەکە بخوات، خێرا قولاپەکە قوت دەدا، ئەوجا لێی گیر دەبێ. خێرا خێرا خۆی تەکان دەدات، تەقەلاّ دەدات، بەڵام بێ سوودە چونکە قولاپەکەی قوت داوە، خالە گیان کاتێ کەسێك نەناسیتو ویستی شتێکت بداتێ، ماسیت بیر بێتەوەو لە خۆت بپرسە کە ئەم کابرایە بۆ ئەم شتە بە من دەدات! ئەم کارە چ سوودێکی بۆ ئەو هەیە، ئەم بیرە دەبێتە هۆی ئەوەی کە قولاپەکە قوت نەدەی، چونکە خوارزای نازدارم لەم دەورو زەمانەیەدا بەبێ سوود کەس شت بە کەس نا بەخشێت.

# شوانە بچکۆلەکە

نووسینی: هواشان

گۆڕینی بۆ فارسی: پرویز دستمالچی

### سەرتیپی منداڵەکان

لە سەرەتای دەست پێکردنی چیرۆکەکەدا "های وا" چواردە ساڵانە، شەش ساڵە کە شوانی دەکات. لە سەرەتادا باوکی های وا کە شوانی ئاغا بوو, زۆر جاران "های وا"ی لەگەڵ خۆدا دەبرد، دوای هێرشی ژاپۆنییەکان بۆ سەر چین، باوکی های وا پێوەندی بە ریزی ئەو پارتیزان و پێشمەرگانەوە کرد کە دژی ژاپۆنییەکان دەجەنگین. های وا جێگای بابی گرتەوە. "های وا"ش خەباتی دەکرد. لە گوندەکەیاندا تیپێکی منداڵان بۆ بەرەنگار بوونەوەی ژاپۆنییەکان و لە پێناوی ئازادی وڵاتدا دروست بوو بوو. های وا سەرتیپیان بوو.

های وا هەموو رۆژێك دەچووە سەر گردی "لونگ من". لە پاڵ مەر لەوەڕاندنەوە ئێشکیشی دەگرت، لە کاتی ئێشك گرتندا هەمیشە نێزەیەکی پێ بوو کە گوڵینکەیەکی سووری پێوە بوو، دایکی بۆی دروست کردبوو.

شەوێك دایکی گوتی: لە کاتی ئێشك گرتندا ئاگاداربە! ژاپۆنییە دەست درێژەکەرەکان لەو ناوەن، رەنگە لە پڕێکا هێرش بکەن! خۆ لە بیرتە کە جارەکەی پێشوو دانەوێڵەکانیان تاڵان کردین و خانووەکانیان سووتاندین، زۆری نەما بوو کە منیش بسووتێم. ئەو بێ شەرەفانە هەموو ئەو کەسانەیان کوشت کە نەیان توانی بوو لە کاتی خۆیدا رابکەن.

– دایکە تۆ خەمی منت نەبێ! ئاخر من سەرتیپی منداڵەکانم! "های وا" ئەمەی گوت و خەوت.
سبەی بەیانی کە لە خەو هەستا، دایکی بینی کە لەتەك سۆپاکەوە دانیشتووە و دەزوو دەڕێسێ.

- دایکە! بۆ دیسان لێرە بمێنینەوە و دەزوو بڕێسین؟ چاکتر نییە کە خۆمان لە کێوەکاندا حەشار بدەین؟
- کوڕە شیرینەکەم ئەی بە چی بژین؟ تۆ تەنیا ئێشك گرتنەکەت بە چاکی ئەنجام بدەو ئاگاداربە لەگەڵ کەسدا شەڕ نەکەی، من نارەحەت نیم کە لە ماڵەوە بمێنم و دەزوو بڕێسم.

های کە خەریك بوو جلەکانی لەبەر دەکرد، بە دەنگی بەرز گوتی:

- سەرتیپی منداڵان هەرگیز شەڕ ناکات! کاتێ کە منداڵ بووم، هەندێ جاران شەڕم دەکرد، بەڵام ئێستا بەینم لەگەڵ ئەو شوانە چکۆلانەی کە لە دەشتەوە دێن خۆشە. ئێمە هەرگیز شەڕ ناکەین. من فێری سرودی "نێزەی سوور"م کردوون. ئەوەم بۆ باس کردوون کە چۆن "دەستەی پڵنگانی شەوانە"ی ئێمە قەڵای دوژمنیان روخاند. کوڕێکی

شوان کە لە گوندی "هودچو"وە دەهات، پێی گوتم کە ئاغاکەی ئەو دەوڵەمەندێکی بەدڕەوشتو بابایەکی خاینە، ژاپۆنییەکان کردوویانە بە کوێخای گوند. پێری عەسر ئاغاکەی زۆری لێ کردبوو کە بە سکی برسی بە دەور گوندەکەدا غار بداتو ئەسپی شوانەکانی گرتبوو, و بۆ ژاپۆنییە بێ شەرەفەکانی بردبوو. لە راستیدا دوژمن بە مەبەستی تاڵان کردن نیازی وایە جارێکی دی هێرش بکات.

دایکی "های وا" بە تورەیی هاواری کرد: – دەبوایە تۆ بە زووترین کات ئەمەت بگوتبا! زوو غاردەو بڕۆ خەبەر بە کوێخا بدە!

- ئەم کارەم کرد، هەر دوێنێ عەسر. هەر بەم بۆنەیەوەش کوێخا دەستووری بە تەواوی خێزانەکان دا تا گەنمو دانەوێڵەکانیان قایم بکەن.

های وا زۆری شانازی بەو کارەیەوە دەکرد، مەڕەکانی لە پەچەکە دەرهێناو لە چاو تروکانێکدا ون بوو.

هەموو خەڵکی گوند لە هەوڵ و تەقەلادا بوون. خەرمانەکانیان دەکوتا، گەنمەکانیان دەهاڕیو ئەوجا بە پەلە ئاردەکانیان لە کیسە دەکرد. تەنانەت منداڵانیش یارمەتی گەورەکانیان دەدا بۆ گەیاندنی دانەوێڵە بە کێوەکانو شاردنەوەی. های وا قامچییەکەی باداو تێی چریکاند:

تازە ئەم بێ شەرەفانە لێرە بوونو هەموو شتێکیان وێران کرد.

جا چییان نەکرد؟ خواردنەکانیان خواردین، گەنمەکانیان بۆ خۆ بردین، خانووەکانیان سووتاندینو تەنیا سەبیلەکەی باوە گەورەم مابوو ئەویشیان شکاند...

لە پڕ دەنگی زەنگێك کە بەسەر پیرە دار چنارێکی بەردەم گوندەوە هەڵواسرا بوو بەرز بووەوە. کوێخای گوندەکە بوو هاواری دەکرد:

- ئەو بێ شەرەفانە دیانەوێ بێن! ئەی قارەمانانی بەرگری میللی چەکەکانتان هەڵگرن! مینو نارنجۆکەکانتان بێنن! هەمووتان لە سێبەری دار چنارەکە کۆببنەوە! پیرو منداڵ و نەساغەکان بچن بۆ کێوان! خەرەكو جەنجەڕەکانتان بەجێ بهێڵن، هەر بە دەقی خۆیانەوە وازیان لێ بهێننو خۆتان ئامادەی هەرەکەت بکەن!.

لە چاو تروکانێکدا هەموو پێشمەرگەکانی بەرگری میللی لە سێبەری دار چنارەکەدا کۆبوونەوە، کوێخاش "های وای" بۆ سەر کێوەکان نارد تا ئێشك بگرێ: – تۆ چاو ساغی گوندەکەی! ئاگادار بە، نەیەڵی دوژمنان هەستت پێ بکەن، وەرە ئەم نارنجۆکەش لەگەڵ خۆتدا بەرە!

"های وا" نارنجۆکەکەی خستە باخەڵی و تێی چریکاند: گەر ئەم بێ شەرەفانە دووبارە بێن کە هەموو شتێ وێران بکەن.. چ شتێکیان لێرەدا دەست دەکەوێ؟ دەکرێین بە حەوادا؟ بە حەوادا؟

لە عەماری شەکردا نارنجۆكو لە ژێر زەمینەکاندا مین دەتەقێتەوەو ئەگەر بە خەیاڵی جاران بڕۆن ئەوا دوایان دەبڕێتەوە.

"های وا" بەشادیو بە دەم گۆرانییەوە خۆی گەیاندە گردی "لونگ من" کە کەوتبووە پشت گوندەکەوە.

## داری نیشانەی خەتەر

های وا دوای ئەوەی گەیشتە سەر گردەکە قەمچییەکی کرد بە بەر پشتینەکەیداو لە ژێر درەختێکدا خۆی مەڵاسدا. ئەم درەختە چ گەڵایەکی پێوە نەبوو. هەموو گەنمەکان دروێنە کرابوون، هەرزن وەکو زێڕی بێ خەوش دەدرەوشایەوە. بەڵام ئەم درەختە تەنانەت تاقە چرۆیەکیشی دەرنەکردبوو. نە بەری هەتاوی دەگرت نە بەری باران. بەم حاڵەوە "های وا" تەواوی ئەو رۆژە لە ژێر درەختەکەدا مایەوە. لەوێدا خۆی مەڵاس دابوو و بە دەستەکانی سێبەری بۆ چاوەکانی کردبوو و بە وردی دەیڕوانییە دەشتەکە.
روبارێك لە دوورەوە وەکو مارێکی زیوین دەبریقایەوە. لە پشتی رووبارەکەوە هێڵی ئاسن هەبوو. های وا پتر زەینی دایە دەشتەکە. بە درێژایی هێڵی ئاسنەکە هەندێ خاڵی رەشی بەرچاو کەوت. لە دوورەوە وەکو تاشەبەرد دەیان نواند. بابی پێی گوتبوو کە ئەو خاڵانە قوللەو قەڵای دوژمنن. هەر یەکێك لەو قولانە هێندە گەورە بوون کە جێگای ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی دوژمنی تێدا دەبووەوە. بابی چەندین جار هێرشی بۆ سەر ئەو قولانە کردبوو.
"های وا" مەجبوور بوو کە هەمیشە لە گوندا بمێنێتەوە. ئەم مەسەلەیە زۆری نارەحەت دەکرد.
لە پشت گردەکەوەو بە دەستی رۆژئاوادا، تاكو تەرا دەنگی تۆپ دەگەییە گوێ.
"دوژمن لە دەوروبەری بنکەکانی ئێمە، لە چیاکانی –تای هانگ–دا سەرگەرمی تالانە. بێ شەرەفانە! هێرشیان بۆ پشتو ناوجەرگەی بنکەی ئێمە کردووە! دەیانەوێ دانەوێڵەی ئێمە بدزن! بەڵام هەرگیز ناگەڕێنەوە! هەموویان لە نێو دەبەین! بەڵام ئێرە هێشتا هەر ئارامە. چ دەنگێك نایەت. کوڕە شوانەکەی گوندی "هودچو" لە کوێیە؟ شوانەکانی دی لە کوێن؟ بۆ نەهاتوون بۆ ئێرە؟!"
"های وا" نانەکەی خواردو لەبەر خۆیەوە هەندێ سرودی گوتەوە. هێشتاش چ دەنگێك لە دەشتەکەوە ناگەییە گوێ.
دیسانەوە خۆی لە ژێر درەختەکەدا ماتداو دەشتەکەی دایە بەر زەین. لە پڕ سەرنجی بە زنجیرە خاڵێکی رەشەوە گیرسایەوە کە لە پشت گردەکانەوە دەخزینە دەرێ.
"ئەمە چی بێت باشە؟!"
"های وا" چاوەکانی هەڵگلۆفت. بە چاکی زنجیرە خاڵە رەشەکەی دەبینی کە وەکو مێروستان بەرەو گردی "لونگ من" دەهاتە پێشەوە.
"باشە کەواتە ئەو بێ شەرەفانە دەیانەوێ لە حەشارگاکانیان بێنە دەرێو بۆ ئێرە بێن! لەولاوە رێچکەیەك... لەم لاوە رێچکەیەکی دیو لەولاشەوە رێچکەیەکی دی!".

"های وا" ناو قەدی درەختەکەی گرتو تا هێزی تێدا بوو بەرەو زەوییەکە رایکێشا.
ئەم درەختە، درەختی راستەقینە نەبوو، بەڵکە دارێکی وشك بوو، لە سەر گردەکە چەقاندبوویان. خەڵکی گوند بەو دارەیان دەگوت نیشانەی خەتەر.
سەر گردەکە شوێنێکی چاك بوو، بۆ چەقاندنی دارەکە، چونکە هەم لە گوندەوە چاك دەبینراو هەم لە گردەکەی رۆژئاواوە. هەر کە دارەکە بکەوتایە، هەموو کەسێك حاڵی دەبوو کە دوژمن نزیك بووەتەوە.
زەنگی گوندی "لونگ من" دیسان دەستی بە لێدان کردەوە. خەڵکی گوند، چییان توانی لەگەڵ خۆدا هەڵیان گرتو بەرەو چیا رۆیشتن. هەروەها پێشمەرگەکانی بەرگری میللیش بە خۆیانو چەکەکانیانەوە بەرەو چیا بوونەوە. هەموو شتێك بە پەلە ئەنجام درا. زەنگەکە لە لێدان کەوت گوندەکە بە ماتیو چۆڵی مایەوە.

## نامەیەکی سێ پەڕ

های وا پیاوێکی بینی، پیاوێك کە چاوی بڕی بووە گردەکەو بەرەو ئەو سەردەکەوت. خەڵکانی گوند بە دەگمەن ئەم باریکە رێیەیان بەکار دەهێنا. ئەم رێگایە تەنیا بۆ مەڕ لەوەڕاندنو دارهێنان بەکار دەهێنرا.
"های وا" بیری کردەوە کە هەبێو نەبێ ئەو پیاوە بابایەکی خایەنە. دەمو دەست مەڕەکانی بەرەو بێشەکە رانی، خۆشی لە نێوان دەوەنەکانەوە خزایە پاڵ تاوێرە بەردێك و بە وردی کابرای خستە ژێر نیگا. زامنی نارنجۆکەکەی هەڵکێشا. وەختێ کە پیاوەکە گەییە نزیکی سەر گردەکە گازی کرد: – های وا! هۆو های وا!
بەڵام های وا وەڵامی نەدایەوە. پیاوەکە دیسان گازی کرد: –های وا! های وا!
های وا دەنگی بابی ناسییەوە. بەڵێ، باوکی لە دەشت گەڕابووەوە تفەنگەکەشی لە شانی بوو. های وا بە شادییەکی زۆرەوە هاواری کرد: – باوکە!
- ئەوە لە کوێ خۆت شاردۆتەوە؟
- لێرە، لەم ناوە!

هـای وا لـه حاڵێکـدا کـه گـەڵای وشـکەوە بـووی دنیـا کـەوتبووە سـەر سـەری. لـە نێـوان دەوەنەکانەوە هەستا. وەختێ کە باوکی بەو شێوەیە بینی بە تووڕەییەوە هاواری کرد: – تـۆ بەمە دەڵێی ئێشك گرتن؟ بێ شەرەفانە وا خەریکە دێن و تۆش ئەم پەناو ئەو پەنا دەکەی؟

- من دەمێکە بینیومن و دارە کەوتووەکەی نیشاندا.
- تەماشاکە! ئەگەر زۆر وریا نەبم، دەمتوانی نیشانەی خەتەر بدەم؟
- ئەی کەواتە بۆ خۆتت قایم کردووە؟

هـای وا بـە پەسـتییەوە سـەیری کـرد. زامـنی نارنجۆکەکـەی خسـتەوە جێـی خـۆی و بـە نارەحەتییەوە گوتی: – لە کوێ بزانم کە کێ دەیەوێ بێت؟ لەوانە بوو لـە بـری تـۆ خایـەنێك بهاتبایە! ئەی ئەوساکە چی دەبوو؟

بابی بە پێکەنینەوە گوتی: – زۆر چاکە! بەڵام تۆ چۆن دەتوانی نارنجۆکەکەت هەڵبـدەیت لـە کاتێکدا لـە نێـو دەوەنـەکانا خـۆت شاردۆتەوە؟ چۆن دەتوانی بە پەلە بێیتـەوە دەرەوە تاکو بتـوانی دژمـن دەسـگیر بکـەی؟ چۆن دەتـوانی بـە پەلـە خـۆت بشـاریتەوە بـێ ئـەوەی چ شـوێن پێیەك لە دوای خۆتەوە جێ بهێڵی؟ ها؟

هـەردووکیان پێکـەنین. زۆر دۆسـتانە دەسـتی بـە پشـتی کوڕەکەیـدا داو گـوتی: –لـە کـاتی خەبات کردن دژ بەم بێ شـەرەفانە پێویسـتە بیر لـە هـەموو شـتێك بکەیتـەوە. شـتی نیـوە چڵ کاڤ نییە.

بـاوکی نامەیـەکی لـە گیرفـانی دەرهێنـا. هـای وا لـە خۆشـیاندا هـاواری کـردو چـاوەکانی بریسکانەوە، نامەیەکی پەڕدار!

ئەوە لە راستیدا نامەیەکی پەڕدار بوو. سێ پەڕە مریشك بە پشتی زەرفەکەیـەوە بـوو، بـاوکی ئەم نامەیـەی لـەلای پێشـمەرگەکانی دەشـتەوە هێنـا بـوو. "هـای وا" دەیزانـی کـە یـەك پـەڕ بـە واتای "بێ ماتەڵ بوون" دێت دوو پەڕ بە واتای "بە پەلە" دێت و سێ پـەڕ بـە واتـای "زۆر بـە پەلە" دێت. بەم پێیە دەبێت ئەم نامەیە زۆر گـرنگ بێـت. "هـای وا" دەیویسـت زووتـر نامەکـە وەربگرێ، بەڵام باوکی لەویش پەلە تری بوو، وەختێ "های وا" دەستی درێژ کرد، گوتی: – خێرا خۆت بگەیەنە بنکەی سەرکردایەتی لە گوندی "زان وانگ" و ئەم نامەیە بدە بە هـاوڕێ "چانگ"ی سەرتیپ.

- هاوڕێ "چانگ"؟! سەرتیپی "پڵینگی شەوانە" نییە؟
- بۆ نە ء، ئەو کەسەیە کە رابەری شەڕەکەی کردو توانیمان بنکەی ئەم بێ شەرەفانە داغـان بکەین، وێستگای هێڵی ئاسنەکەیان بسووتێنین.
- چ شـتێکی بەپەلـە لـەم نامەیەدایـە؟ شـەڕێکی دی بـە دەسـتەوەیە؟ بـاوکی سـەری لەقانـدو گوتی: – نابێ کەس ئاگای لە نهێنی سوپایی هەبێت.

ئەوجا بە چاو داگرتنـەوە لەسـەری رۆیـی: – بـە هـەر حاڵ گـرنگ ئەمەیـە کـە نهێنـی سـوپایی نابێت گوم بێت، یان بە دەستی دوژمن بکەوێ یان گەییشتنەکەی دوا بکەوێ.

- پێویست ناکات ئەم قسانە بە من بڵێی!

"های وا" تەمەنایەکی سوپایی کردو گوتی: – بە هەر حاڵ وەختێ کە تیپی پڵینگی شەوانە دەستی بە شەڕەکەی کرد، وریا بە.

"های وا" بە فیکەیەك مەڕەکانی کۆکردەوەو قەمچییەکەی بەرەو بابی، درێژ کردو گوتی: – وەرە، ئێستا تۆ مەڕەکان وەردەگریت و ئێشك گرتنەکەش لە ئەستۆی تۆدایە!

بەڵام باوکی وەڵامی دایەوە: – مەڕەکانیش لەگەڵ خۆتا بەرە. دەبێ زۆر وریا بی. دوژمن لە گشت ئەم ناوانەدا هەیە. لە ڕێگای جۆر بە جۆرەوە بەرەو چیا دێن. بردنی نامەکە بۆ ئەوێ. ڕەنگە زۆر زەحمەت بێ. ئەگەر تووشی ئەوان بوویت، بڵێ شوانیت و لە دەشتەوە دێی.

- "زۆر چاکە! بە دەم مەڕ لەوەڕاندنەوە نامەکە دەبەم".

ئەمە یەکەمین نامە نەبوو دەبوا بۆ ئەوێی بەرێ بەڵام جاران تەنیا نێزەکەی و گوڵینگە سوورەکەی پێ بوو، تا دەیتوانی توند غاری دەدا، بەڵام ئێستا دەبوایە بە دەم مەڕ لەوەڕاندنەوە نامەکە بەرێ. "های وا" لە خۆی پرسی داخوا کەی دەگاتە جێ.

- دەبێ بۆ سبەینێ پێش ڕۆژ ئاوا نامەکەیان پێ بگات. سبەینێ! حاڵی بوویت؟

باوکی بە دڵنیاییەوە قسانی دەکرد: – نامەکە گوم نەکەی!

- بۆ گومی دەکەم؟ باوکە، تۆ نیگەران مەبە. ئەگەر خۆم کوشتبێ، لە کاتی خۆیدا دەی گەیەنم!

لەم کاتەدا هارەی دەستڕێژی ڕەشاشەکانی دژمن دەستی پێکرد، گوللەکان بەسەر سەری ئەمانەوە گیزەی دەکرد.

- بێ شەرەفانە، ئێمەیان کردووە بە نیشانە، وا خەریکە دێن، دەبێ بڕۆین.

باوکی ئەمەی گوت و بنە گوزروانێکی لە گیرفانی دەرهێنا.

- ها، ئەمەش بۆ ڕێگات. باش بیر بکەرەوە، بزانە هیچت ناوێ؟

- هەموو شتێك تەواوە.

"های وا" مەڕەکانی دایە پێش، بەڵام بابی دیسانەوە ڕایگرت: ئەمە چییە؟

ئەوسا کڵاوەکەی، کە تایبەت بوو بە ئەندامانی سوپای سوور، لەسەر داکەند، بەم کڵاوو نارنجۆکەوە هیچ کەسێك باوەڕ ناکات کە تۆ تەنیا شوانێکی سادەیت!

ئەوجا پێکەنی و لەسەری ڕۆیی: – کاتێ کە دژی دوژمن دەجەنگی پێویستە هێمن و لەسەرخۆ بیت. دەبێ چاوەڕێی گشت ڕووداوێك ببی. ئەمجارەیان هەروا بە هاسانی ناگەیتە "زان وانگ" مەگەر.....

- تێ گەیشتم چی دەڵێی!

"های وا" ئەمەی گوت و مەردانە کەوتە ڕێ. باوکی کڵاوو نارنجۆکەکەی ئەوی هەڵگرت و بە پەلە بەرەو لێرەوار ڕۆیی. ئەوسا تەنیا گوڵینگە سوورەکەی های وا دیار بوو کە ئەویش بە زوویی ون بوو.

## دوگی بەرانە پیرەکە

"های وا" مەڕەکانی لە باریکە ڕێگایەکەوە دەبردە خوارێ. لە چیاکانی "لـونگ مـن"ەوە تـا " زان وانگ" لە جادەوە پانزە کیلۆمەتـەر ڕێگا بـوو. بـەڵام لـە باریکـە ڕێگاکانـەوە کـە "هـای وا" چەند جارێ لەوە پێش نامەی پێدا بردبوو بۆ مەڵبەندی سەرکردایەتی، تەنیا (10) کیلۆمـەتر بوو. لەسەر گردەکەی ڕۆژهەڵاتەوە داری خەتەر دەبینرا. هەتاو لـە ئـاوا بوونـدا بـوو ڕەنگێکـی سـووری تـۆخی بـە هـەورەکان بەخشـی بـوو. دارەکـە هـەر لـە جێـی خـۆی بـوو. نیشـانەکە دڵنیایی و هێزی بە های وا دەبەخشی.

"های وا" کە خەریك بوو بە گردەکەدا هەڵدەگەڕا، لە پڕ دارەکە ون بوو.

"بە نەفرەت بن! بێگومان دەبێ ژاپۆنییەکان لەو دیو گردەکەوە بن. خۆ من کەر نیم. ئەگەر لەم ڕێیەوە بڕۆم بێگومان دەکەومە دەستیان!"

بە پەلە مەڕەکانی کۆ کردەوەو بەرەو گردی "داچوانکۆ"دای گەڕاندن.

"ئەگەر نەتوانم لەم باریکە ڕێگایانەوە بـڕۆم، پێویسـتە سـوود لـە جادەکـە وەربگـرم. ئەگـەر لـە دۆڵەکە دەربچم و بـەرەو سـەرێ بـڕۆم. دەکەومـە پشـت دوژمنـەوە، بـەم شـێوەیە بـڕۆن و منـیش دوور بە دوور لە پشتیانەوە دێم و بەم جۆرە تووشیان نابین".

"های وا" دوو جاران لە دۆڵەکەوە سەری دەرهێناو لە نزیکی گەلی "داچوانکۆ" بوو کـە ڕیـزە خەڵك و ئەسپێکی بینی، لەو دیوی گەلییەکەوە بە گردەکەدا هەڵدەگەڕان.

"تۆ بڵێی ئەندامانی سوپای سوور بن؟ ناشێت!"

تەواو گـوێ قـولاغ بـوو، لـە دوورەوە ڕەوە ئەسـپێکی بینـی کـە چ بارێکیـان بـە سـەرەوە نـەبوو. ئەمـە خـۆی لـە خۆیـدا نیشـانەیەکی دڵنیـایی بـوو: ئـەو ڕەوە ئەسـپە، ژاپۆنییـەکان تالانیـان کردبوو.

"باشە چی بکـەم؟ ژاپۆنییـەکان لـە گردەکـانی "لـونگ مـن" لـە گردەکـانی ڕۆژئـاواداو لـە گـەلی "داچوانکۆ"دا هەن. چۆن دەتوانم لە دەستیان دەربچم؟".

بەڵام لە دوولاوە، تاشە بەردی گـەورەو تیـژ هـەبوو. نـەی دەتـوانی بـە مەڕەکانـەوە بەسـەریاندا سەر بکەوێ.

"باشە دەکرێت بەم شێوەیە درێژە بە ڕێگا بدەم؟ بەڵام چ لە نامەی پێشمەرگەکان بکەم؟ فڕێـی بدەم؟ نە ء هەرگیز! ئەگەر نامەکە بە دەستی پێشمەرگاکان نەگات، تەواوی نەخشەو پلانـەکان دەشێوێ!".

بـە پەلـە نامەکـەی لـە ژێـر بەردێکـدا شـاردەوە. دووبـارە دەری هێنایـەوە "نـا، نـابێ ئـەم کـارە بکەم، ئێرە هەر بەردە. کە دنیا تاریك بوو ئیدی بۆم نادۆزرێتەوە".

ژاپۆنییەکان نزیك‌و نزیك تر دەبوونەوەو دەنگی پۆستاڵەکانیان بەرزترو ئاشکراتر دەهاتنە گوێ. "های وا" نەیدەزانی چی بکات. مەڕەکان بێ سڵ کردنەوە ئەملاو ئەولایان دەکرد، گیایان دەخواردو دوگیان با دەدا.

"خۆیەتی، دۆزیمەوە!"

دەمو دەست شاخی بەرانە پیرەکەی گرت‌و چەند تیسکە خورییەکی لێ هەڵکەندو بایداو نامەکەی لە ژێر دوگی بەرانەکە، پێ بەست.

"های وا" هەستی کرد کە باری سەر شانی کەمێ سووك بوو. نامەکە دەگاتە جێی مەبەست. بەرانە پیرەکە، بە نارەحەتییەوە دەرپەڕی‌و دوگی دادایەوە. بەم جۆرە نامەکە لە شوێنێکی قایمدا جێگیر بوو. هەر چەندە بەرانە پیرەکە خێراتر دەڕۆیی، نامەکە توندتر دەبوو.

"های وا" ئێستا چ ترسێکی نەبوو. "های وا" قەمچییەکەی باداو یەکڕاست مەڕەکانی بەرەو لای دژمن هاژۆت.

- زەلام کێی؟ بوەستە!

ئەمە دەنگی تێخۆڕینی یەکێك لە سەربازە ژاپۆنییەکان بوو کە تفەنگەکەی دەهێنایە سەرپێ. رووی تفەنگەکەی کردە "های وا" و ڕێگاکەی لێ گرت "باش بوو. دەوەستم. هەلێکی چاکە، ئێستا دەتوانم بە چاکی هێزی دوژمن هەڵسەنگێنم، ژمارەی ئەفسەران، سەربازەکانیان‌و تفەنگەکانیان هەموو شتێك بە هاورێ –جانگ–ی سەرتیپ دەڵێم".

"های وا" چاوی لە دوژمن نەدەگواستەوە. مەڕەکانیش وەستان‌و لە دەوری پیرە بەرانەکە خڕ بوو بوونەوە.

## بنە گۆزروان

سەربازێکی بەکرێ گیراو، بە جلی رەشەوە سەرکەوت، یەخەی "های وای گرت‌و کەشان کەشان بردی بۆ لای ئەفسەرێکی ژاپۆنی کە جلێکی زەردباوی لەبەردا بوو. ژاپۆنییەکە کە قەمەیەکی بە پشتەوە بوو، لووتێ باریك‌و سمێڵێکی بچووکی هەبوو، هاواری کرد: – تۆ.... جاسوس.... سوپای سوور؟ و بە قینەوە لە "های وا"ی روانی. ددانە زێڕەکانی دەبریقانەوەو لێوە ئەستورەکانیشی ئەم قەڵافەتە دێو ئاساییەی تەواو دەکرد.

بەڵام های وا نە دەترسا. بە ئانقەست سەری داخست بوو و بە دەمی بەشەوە نیگای ئەفسەرە ژاپۆنییەکەی دەکرد، وا خۆی دەنواند کە لە هیچ حاڵی نییە. یەکێك لە سەربازە خۆفرۆشەکان بە قەپۆزە خوارەکەیەوە هاواری کرد:

- ده قسه بکه، هەی حەرام زادەی زۆڵ. جەنابی ئەفسەر دەڵێ کە ئاخۆ تۆ جاسوسی سوپای سووریت؟

ئەوجا قۆناغە تفەنگێکی مەحکەمی بە پشتی "های وا" داکێشا.

"ئەم نامەردە چەپەڵە کە خۆی بە ژاپۆنییەکان فرۆشتووە دەڵێی دڕندەیە. چەند بێ ئابڕوانە مەرایی لەبەر دژمن دەکات!".

های وا زۆری حەز دەکرد ئەم خاینە مەراییکەرە تەمێ خواردوو بکات بەڵام بیری هەر لە لای نامەکە بوو. تۆزێ بیری کردەوەو گوتی: نا! نا من بابایەکی شوانم. ئەفسەرەکە قەمەکەی دەرهێناو بە پشتی ملی "های وا"ی داهێناو بە ساردییەوە گوتی: – تۆ ئەگەر... ڕاست نەڕۆی، سەرت بڕاوە!

کابرای قەپۆز خواریش لاسایی ژاپۆنییەکەی کردەوەو مشتێکی بە "های وا"دا کێشاو هاواری کرد: – ئەگەر دۆغرییەکەی نەڵێی، هەر لێرەدا دەت کوژم!

های وا دیسان گوتی: – من بابایەکی شوانم. شوانێکی گوندی "هود چو".

های وا بە جۆرێ خۆی دەنواند کە گوایە دەیەوێ بگری. بەڵام لە حاڵێکدا کە چاوی هەڵگلوفت، لە نێوان پەنجەکانییەوە ژمارەی ژاپۆنییەکان و چینییە بەکرێ گیراوەکانی حسێب دەکرد. گریانەکەی های وا کابرای سمێڵ چکۆڵەی هەڵخەلەتاند. دەستووری دا کە هەموو شوێنێکی های وا بپشکنن. کابرای دەم خوار دەستی بە پشکنینی های وا کرد. تەنانەت ژێر پینەی جلەکانی "های وا"ش گەڕا، پێڵاوەکانی پێ داکەند. تاقە شتێ کە دۆزییەوە بنە گۆزروانێك بوو کە باوکی پێی دابوو. دەم خوار هەر کە بنە گۆزروانەکەی بینی دەمی ئاوی کردو ویستی بیخوات، ئەفسەرەکە لە دەستی سەند.

- ئەمە... چ باش ... بۆ خواردن!

کابرای ژاپۆنی بە لوتە باریکەکەی، بنە گۆزروانەکەی بۆن کردو دەستی بە خواردنی کرد.

- زۆر باش،زۆر باش!

بە ملچە ملچەوە گوتی: –ئەم.... لە چیا، زۆر باش،زۆر باش! سوپای ژاپۆن... هەمووی... گرت!.

کابرای دەم خوار بە مەراییەوە گوتی: – بەڵام لە چیادا بنە گوزروان ناڕوێت! تاڵانەکەمان لە کوێوە دەست پێ بکەین؟ بێگومان ئەم جۆرە شتانە لە دەشتدا زۆرە. بەڵام "های وا" زوو هاتە وەڵام: – ئەم بنە گوزروانە زۆر بە تامە. من هەر چەند مەڕەکانم بێنم بۆ چیا، بنە گۆزروان دەخۆم.

قسەکانی های وا کردیانە کارێ کە ئەوان وا بزانن کە بەڕاستی شوانەو لە دەشتەوە دێت. بنە گوزروانە کە ئیشتیای ئەفسەرەکەی کردەوە. پەیتا پەیتا لێوی دەلستەوە، ئەوجا چاوە بچووك و تووڕەکانی تروکاندو لە حاڵێکدا کە ددانە زێڕەکانی نیشان دەدا پرسی: – تۆ، کار... چی؟

های وا دەمو دەست لە مەبەستی کابرای ژاپۆنی حاڵی بوو. وەڵامی دایەوە: – کاری من، شوانییە.

- تۆ، تەسکەرەکەت نیشان بدە!
- من چوارده ساڵانم، تەسکەرەم نادرێتێ؟ ئەگەر باوەڕ بە من ناکەیت بچۆ بۆ گوندی "هود چو"و لە کوێخای گوند بپرسە. ئەم مەڕانەش هی ئەون.

بەڵام کابرای ژاپۆنی هەرگیز دەرفەتی ئەم کارانەی نەبوو. تەنیا دەیویست تاڵانەکانی لەو دەوروبەرەوە دەست پێ بکات. لە کاتێکدا هێشتا پاشماوەی بنە گوزروانەکەی "های وا"ی بە دەمەوە بوو پرسی:

- ئەمە، لە وێ بوو؟

های وا وەڵامی دایەوە: – بێگومان یەك دنیای لێیە. تۆ هەر ئەوەندە خۆت بگەیەنە گوندی "هود چو" کوێخای گوند یەك دنیای هەیە.

- لەوێ، ئەمە؟

کابرای ژاپۆنی ئەمەی گوتو دووبارە ئیشارەتی بۆ پاشماوەی بنە گوزروانەکە کرد: – تۆ، ئەمە, سوپای ژاپۆنی دەدا؟

ددانە زێڕەکانی لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا دەبریقانەوە. های وا گوتی:

- حاڵی بووم، هەر کاتێ گەڕایتەوە، من یەك سەبەتە لەمەت دەدەمێ.

بە هەردوو دەستی بازنەیەکی گەورەی کێشا تا گەورەیی سەبەتەکە نیشان بدات، بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی: – "تۆ هەرگیز بە زیندوویەتی ناگەڕێیتەوە. تۆ دەکەویتە داوی ئێمەوەو دەبێ لەوێ کاڵەك بە ئەژنۆ بشکێنی!"

های وا لە کانگای دڵەوەو بە دەنگی بەرز پێکەنی.

ئەفسەرەکەش پێکەنی.

- تۆ، باش، کوڕ! باش کوڕ بۆ سوپای ژاپۆنی! تۆ ئێستا ڕۆییشتن!.

های وا بە شادییەوە لە کاتێکدا کە مەڕەکانی دا بووە پێش کەوتە ڕێگا.

## مەڕەکانی های وا

باشترین کار بۆ های وا کە بتوانیٚ لەویٚ دوور بکەویٚتەوە غاردان بوو.

بەلاّم زاتی ئەم کارەی نەبوو. بۆیە تەنیا تۆزیٚ خیٚرا دەڕۆیی.

- بوەستە! بوەستە!

دەم خوار بە راکردن شویٚنی کەوت، کۆمەلیٚك سەربازی بەکریٚ گیراویش دوای کەوتن. وەختیٚ کە گەینە های وا، میٚگەلە مەڕەکەیان راگرتو دەستیان بە مەڕ گرتن کرد. های وا بە نارەحەتییەوە هاواری کرد: – ئەوە چی دەکەن؟!

دەم خوار بە پیٚکەنینەوە وەلاّمی دایەوە: – تۆ لە ئیٚمە دەپرسیت کە چی دەکەین؟! ئەی نابینی سوپای ژاپۆن بۆ نیوەڕۆژە هیچی نییە؟ مەڕەکانی تۆش بەشی چەند ژەمە خواردنیٚ دەکەن!

قەمچییەکەی لە دەستی های وا راپسکاندو دیسان مەڕەکانی بۆ نیٚو دۆلّەکە گیٚڕایەوە. های وا بە تەواوی ئەبلّەق بوو بوو:

"نامەکە! ژاپۆنییەکان نامەکە دەدۆزنەوە!"

چووە پیٚشەوەو لە حالیٚکدا کە دەیویست قەمچییەکە لە دەستی دەم خوار دەربیٚنیٚ، هاواری کرد: – ئەوە تۆ نیازی چیت هەیە؟

ئەوجا دەستی بە گریان کرد: – مەڕەکان هی ئاغان، هی کویٚخای گوندن! خیٚرا قەمچییەکەم بدەوە!

- فیٚلّبازی حەرام زادە! دەتەویٚ هەلّمان بخەلّەتیٚنیٚ؟!

یەکیٚك لە خۆفرۆشەکان هاواری کرد: –هەر ئیٚستا بگەڕیٚوە بۆ گوندو بلّیٚ سوپای ژاپۆن مەڕەکانیان بردیت. تۆ هەقت نەبیٚ. دەی بڕۆ دەی!

دەم خوار دەیویست لە بری ترساندن، قەناعەتی پیٚ بکات. چونکە دەترسا کە نەبادا های وا گازی لیٚ بگریٚ یان بەردیٚکی پیٚدا بکیٚشیٚت.

- من ناڕۆم. قەمچییەکەشم بدەوە!

های وا دیسان هەولّی دا قەمچییەکەی وەربگریٚتەوە. قەپیٚکی قایمی بە دەستی دەم خواردا کرد.

- مەڕەکان هی ئاغان. ئەگەر ئیٚوە مەڕەکان بەرن، ئەو من پارچە پارچە دەکات.

خۆفرۆشەکان هەر میٚشیش میوانیان نەبوو، چونکە ئاغاکەی های وا خاوەنی گوندی "هودچو"ش وەکو ئەوان بابایەکی خایەنو خۆفرۆش بوو، کڕنۆشی بۆ ژاپۆنییەکان دەبرد. خۆ پارچە پارچە کردنی شوانیٚکی بچکۆلە بەلای ئەوانەوە چ بایەخیٚکی نەبوو. بۆیە بە قسەکانی "های وا" پیٚدەکەنین: – ها... ها... ها...

خۆفرۆشە جل رەشەکان بە پشتیٚنە قایشەکانیان مەڕەکانیان دایەپیٚش.

"های وا" له حاڵێکدا که توند قەمچییەکەی گرتبوو، تا هێزی تێدا بوو خۆی به دەم خواردا کێشا.

- ون به لەبەر چاوم! ئەگەر تووڕەم بکەیت دەتکوژم!

دەم خوار هەناسەیەکی هەڵکێشاو له حاڵێکدا که به تفەنگەکەی هەڕەشەی له "های وا" دەکرد، کوتای بەزەویدا. ئەوجا مەڕەکانی دایه پێش و بردنی. وەکو ئەوەی مەڕەکان هی باوکی بن.

"های وا" لەسەر زەوی کەوتبوو. هەر چەند بۆ مەڕەکانی نیگەران بوو، بەڵام پتر خەمی نامەکەی بوو. شریخەی قامچییەکەی دەم خوار وەکو گولله لەگوێی "های وا"دا دەنگی دەدایەوە. تەواوی نەخشەکانی هەڵوەشایەوە. شریخەی قەمچییەکه کزەی له جەرگی هەڵدەستان.

"های وا، های وا! تۆ چۆن ڕێ به ژاپۆنییەکان دەدەی نامەکه بدۆزنەوە! مەگەر تۆ سەرتیپی منداڵەکان نیت؟"

های وا چیدی نەگریا. خەمەکانی فەرامۆش کردو گوڕی دایەخۆ. ددانەکانی جیڕ کردنەوە، هەستایه سەر پێ و کەوته تاقیبی ژاپۆنی و به کرێ گیراوەکانیان. لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا به وردی چاوی به زەوییەکەدا دەگێڕا تا ئەگەر نامەکە کەوتبێ هەڵی بگرێتەوە. لەبەر خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە که نامەکه هەڵبگرێ و له هەلێکی گونجاودا به بێ ئەوەی بێڵێ ئەوان هەستی پێ بکەن یەکسەر بۆ "زان وانگ"ی بەرێ. بەڵام نامەکە لەو ناوە نەبوو. نا چووە ئەقڵەوە که کەوتبێتە سەر زەوی. های وا بیری لەو سێ گرێ توندە دەکردەوە که له نامەکەی دابوو. "دۆزینەوەی نامەکه لەسەر زەوی خەیاڵ پلاوە".

های وا پێی هەڵگرت.

"نابێ به هیچ جۆرێك له نامەکه جیا ببێتەوە! هەرگیز نابێ ژاپۆنییەکان بیدۆزنەوە! دەبێ به هەر نرخێ بووە نامەکه به دەست بێنم!".

## لە گوندێکی زۆزان دا

دەم خوار دەست بەجێ هەستی کرد کە های وا تاقیبیان دەکات. بە توڕەییەوە هاواری کرد:

- ئەگەر گۆڕت گوم نەکەیت، تۆش لەگەڵ مەڕەکانت دا سوور دەکەم!

یەکێك لە سەربازە خۆفرۆشەکان بە هێمنی پێکەنی:

- لێی گەڕێ بابێت. تکا لە ئەفسەرەکانی سوپاکەمان دەکەین کە پارچە ئێسقانێکی بۆ تامی دەم بدەنیٚ! ها... ها... ها...

خۆفرۆشەکانی تریش ئەم قسەیەیان بەلاوە خۆش بوو، ژاپۆنییەکانیش بە دەنگی بەرز پێکەنین.

چاوانی های وا، لە رقاندا سوور هەڵگەڕابوون.

"دەیانەوێ هەموو مەڕەکان بخۆن! بەڕاستی هەمووی دەخۆن؟!"

های وا دوو فیکەی قایمی کێشا. مەڕەکان یەکڕاست بەرەو لای ئەو بە غاردان گەڕانەوە.

"های وا" بەرەو دۆڵی "داچوانکو"دا گەڕاو مەڕەکانیش بە غاردان دوای کەوتن. بەرانە پیرەکە بە دوای "های وا"دا غاری دەداو هەموو مەڕەکانیش بە دوای بەرانە پیرەکەدا، سەربازە بەکرێ گیراوەکانیش بە دوای مێگەلەکەدا.

های وا نیازی وابوو بەرانە پیرەکە لە مێگەلەکە دابڕێ. ئەگەر گشت مەڕەکانی دی سەر بڕن قیروسا.

- غاردە ئەی بەرانی پیر! خێرا تر، خێرا ترا ئاخ، چەند خۆش دەبوو، ئەگەر لەبەر مەڕەکان نەگەڕێتەوە. من دەزانم ئەی پیرە گیان، تۆ بۆ مەڕەکان نیگەرانیت. منیش وەکو تۆ نیگەرانم. بەڵام قەیناکە رابکە! تا دەتوانی خێرا تر رابکە! کە ئێمە بگەینە "زان وانگ" برادەرەکانی خۆمان تۆڵەمان لە مانە دەکەنەوە.

لەم دەمەدا سەربازەکان بڕیاریان دا کە های وا بگرن، چونکە هەنگاوەکانی ئەوان گەورەتر بوو، دەم خوار توانی های وا بگرێت:

- ڕێ بکە تۆ دەتەوێ مەڕەکان بۆ لای ئەفسەرەکان بەری!

ئەمەی گوت و شەقێکی لە های وا هەڵدا.

- زۆر چاکە! دەبێ ئیدی کارمان بۆ بکات و پێویست ناکات ئێمە ئارەق بڕێژین.

دڵی "های وا" هەم لە خۆشیداو هەم لە ترساندا خەریك بوو لە لێدان بوەستێ: "زۆر باش بوو. ئەمە هەلێکی چاکە بۆ من!" بەڵام بە دەنگی بەرز هاواری کرد:

- نا، من ئەم کارە ناکەم!

های وا وا خۆی دەنواند کە گوایە تەنیا بە زۆر ناچار بە بردنی مەڕەکان دەبێت. لە کاتێکدا کە سەربازە خۆفرۆشەکان دارکاریان دەکرد، هێدی هێدی لەگەڵ ئەواندا بە کێوەکەدا هەڵگەڕا.

- تۆ... سوپای ژاپۆنی... بردا حاڵی بوویت؟

سمێڵ چکۆلە لە خۆشیاندا حاڵی نەبوو. لە کاتی قسە کردندا هەمیشە دانە زێڕەکانی دەردەخست. "های وا" گوتی: حاڵی بووم.

کەچی هەرگیز گوێی لەو نەدەگرت، چونکە بیری لە نەخشەکەی خۆی دەکردەوە. بەم زووانە دەگەنە لوتکەی کێوەکە. دنیا خەریکە تاریك دەبێ، نامەکە هەڵدەگرێ و خۆی لە نێو چیاکاندا دەشارێتەوە. هەرگیز تەسلیمی دژمن نابێت!

هەر زوو گەیشتنە گوندێکی بچکۆلە. ژاپۆنی و بەکرێ گیراوەکانیان لەوێ لایانداو وەستان. "های وا"و مەڕەکانیشی وەستان. لەم گوندەدا 6-7 ماڵ دەژیان. تەواوی دەرگاکان داخرابوو. دژمن بۆ تاڵان کردن دەرگاکانیان دەشکاندو دەچوونە نێو خانووەکانەوە. تەواوی خانووەکان خاڵی بوون. تەنانەت تاقە مەنجەڵێك لەسەر کوانوو نەبوو. لە گشت خانووەکاندا تەنانەت دەنگە برنجێ پەیدا نابوو. هەموو شتێکیان لە کێوان شاردبووەوە. تاقە شتێ کە بە جێیان هێشتبوو کاو چیلکەی وشك بوو. ژاپۆنییەکان ئاگریان لە کاو چیلکەکان بەردا، دەرگاو پەنجەرەی خانووەکانیان شکاندو خستیاننە ئاگرەوە. روناکی ئاگر گردەکەی رۆشن کردبووەوە. لەم کاتەدا، لە پشت گردەکەی رۆژئاواو خوارووەوەش بڵێسەی ئاگر بەرز بووەوە. ژاپۆنییەکان زۆر خۆشحاڵ بوون و گۆرانیان دەگوت. لە رۆژئاواو خوارووشەوە ئەم دەنگە دەبیسترا. ژاپۆنییەکان بەم رێگایە یەکتریان ئاگادار دەکرد. لە خۆشیاندا سەردەکەوتن و ئاڵا بچکۆلەو رەنگاو رەنگەکانیان با دەداو بەو تاریکە شەوە هاواریان دەکرد. "لەبەر ئەمەی دژمن سێ گردی گرتووەو سبەینێ دەست بە تاڵان دەکەن".

ژاپۆنییەکان لە خۆشی و کەیفی خۆیاندا "های وا"یان بیر نەمابوو ئەمەش بۆ ئەو هەلێکی چاك بوو. ئەنجام بەرانە پیرەکەی پەیدا کرد.

## بەرانە پیرەکە

هەرکە "ھای وا" بەرانەکەی گرت، سمێڵ بچکۆلە بە تورەییەوە نەڕاندی:

- هەی گەوج!

ھای وا کە زۆر ترسابوو، ئاوڕی دایەوە، دیسان گوێی گرت: هەی گەوج!

بەڵام کابرای ژاپۆنی لەگەڵ زەلامەکانی خۆی بوو نەوەك ھای وا.

هاواری دەکرد:

- میشی! میشی!

بێگومان مانای نان خواردن بوو، چونکە ژاپۆنی و بەکرێ گیراوەکانیان پەلاماری مەڕەکانیاندا.

"ھای وا" بەقینەوە سەیری ژاپۆنییەکانی دەکرد. سەرگەرمی گرتنی مەڕەکان بوون و هەر ئاوڕیان لەم نادایەوە. یەکێکیان پاشوی مەڕێکی گرتبوو و رای دەکێشا. یەکێکی تر قەمەکەی دەرهێنا بوو و بەوپەڕی خەمساردییەوە سەری مەڕێکی دەبڕی. دەم خوار ماوەیەك سەیری دەوروبەری خۆی کردو ئەوجا بە شاخی بەرانەکەوە نووسا.

"ھای وا" دەلەرزی و فرمێسك زایی بووە چاوانی، "نامە بەنرخەکەم چی بەسەر دێ؟ ئایا ئیدی هەموو شتێك تەواو, و دەزانن من کێم؟".

ساتێکی ناسك بوو. ھای وا رەق راوەستا بوو: "ئەگەر ئەمانە بزانن من کێم... دەبێ نامەکە هەڵگرمو دەمو دەست رابکەم. ئەگەر ئابڵوقەیان دام، نامەکە دەخۆم. بە گوللەش ناتوانن دەمم پێ بکەنەوە".

دەم خوار هەر بەو دەقەوە شاخی بەرانە پیرەکەی گرتبوو و رای دەکێشا بەڵام بەرانەکە هەر لە شوێنی خۆی ناجۆڵا. دەمو چاوی دەم خوار شەلاڵی ئارەقە بوو بوو. بەرانە پیرەکە لاقەکانی بڵاوکردبووەوە لە عەردەکەی چەقاند بوو. ژاپۆنییەکان گاڵتەیان بە دەم خوار دەکرد. هەر چەند شێت ئاسا بە شاخی بەرانەکەوە نووسا بوو. بەڵام هەر دەرەقەتی ناهات. دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو، هاواری کرد:

- بەچی پێدەکەنن؟ ئەمە بە تەنیا سی کیلۆ گۆشتی دەبێ. چ گیاندارێکی جوانە, وەرن برادەران وەرن یارمەتیم بدەن!

بەڵام کەس لە جێی خۆی نەجووڵاو لە بری یارمەتی دانی دەستیان بە گاڵتە پێکردنی کرد:

- کەس گۆشتی ئەو پیرە بەرانەی بۆ ناخوریٚ! بیبەرەوە بۆ دایکت!

دڵی های وا بە جۆرێ لێی دەدا خەریك بوو بتەقێ. ئەویش دوا بە دوای قسەکانی ئەوان گوتی:

- بەڵێ گۆشتی ناخورێ. دەم خوار بە تووڕەییەوە شەقێکی بە پیرە بەرانەکەدا ماڵیو بە "های وا"ی گوت:

- ئەمە بەرەوە بۆ دایکت!

بەرانە پیرەکەی بەرەڵڵا کردو کەوتە غاردان بە دوای مەڕی دیدا... های وا هەناسەیەکی هەڵکێشا، بەڵام هێشتا ئارام نەبوو بووەوە. سەراپای بەدەنی نیشتبووە سەر ئارەقەیەکی سارد، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "بە ئارەزووی خۆتان گاڵتەم پێ بکەن. من هیچتان پێ ناڵێم بەڵام رۆژێ دێ ئەم دڕکەتان لە ژێر پێ دەربکەم. مەڕەکانم بۆ دەرناکرێ. باشترا شەو، نامەکە دەبەمو رادەکەم.

مەڕەکان! لەو لاوە بە قەمەی سەربازانی ژاپۆنی کەوڵ دەکران. کۆمەڵێك سکی مەڕەکانیان هەڵدەدڕی.خوێن لەسەرو سکی مەڕەکانەوە دەڕۆیی. های وا لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "دەڵێی گورگنو نێچیری خۆیان دەست کەوتووە". لە ژیانیا یەکجار گەلە گورگێکی بینی بوو کە پەلاماری رانە مەڕیان دابوو. رژا بوونە سەر مەڕەکانو راکێشو بکێش بەرەو لێرەوارو بێشەیان دەبرد تا لەوێو دوور لە خەڵکی پارچە پارچەیان بکەنو بیان خۆن. بەڵام ئەم ژاپۆنییانە لەو گورگانەش دڕندەترن. ئەم گورگە دوو پایانە مەڕەکان بە بەر چاوی خەڵکییەوە پارچە پارچە دەکەن... تەنیا چەند سەرێك لە مەڕەکان مابوو.

بەرانە پیرەکە قەپۆزی لە های وا هەڵدەسوو و دەیباپاند. چاوی پڕ لە فرمێسك بوو. های وا جگە لەوەی ئاگاداری بێو بیلاوێنێ چ کارێکی دی لە دەسەڵاتدا نەبوو. بەرانە پیرەکە دەیڕوانییە مێگەلەکەو ئەو قەمانەی لە خوێنا دەبریقانەوە، دیسان ئاوڕی لە های وا دایەوە. های وا بە ئاسپایی و بە چپە بە بەرانەکەی گوت:

- ئەی پیرە بەرانە نازدارەکەم! من دەبێ تۆ بە جێ بهێڵم. دەبێ بە تەنیا نامەکە بگەیەنمە جێی مەبەست!

کاتێ کە های وا بەرانەکەی دەلاواند، فرمێسك لە چاوانی هاتنە خوارەوە. ئەوجا بە وریاییەوە دوگی بەرانەکەی هەڵدایەوە، نامەکە لە جێی خۆی بوو.

- بەم زووانە دەردی ئەم دڕندانە دەرمان دەکەین.

"های وا" ئەمەی گوتو بە خۆشەویستییەوە دەستی بەسەر بەرانەکەدا هێنا. دەیویست نامەکە دەربێنێ کەچی دەم خوار گەییشتە سەریو پرسی:

- لەم ناوەدا کانی هەیە؟

های وا لە کاتێکدا وا خۆی دەنواند کە دەیەوێ بەرانەکە بلاوێنێ وەڵامی دایەوە:

- ئەگەر ئەم گوندە، کانی لێ بوایە خەڵکەکە چۆڵیان ناکرد!

هەڵبەتە ئەو ناوە کانی لێ بوو. کانییەکە لە پشتی گوندەوە بوو و های وا زۆر جاران لەوێ مەڕەکانی ئاودەدان.

"بەڵام هەرگیز بە دژمنی نیشان نادەم!"

خۆفرۆشەکان بە دوای مەنجەڵێك دا دەگەڕان. بەڵام پەیدایان ناکرد. های وا بە خۆی گوت:

- "ئەوان بەبێ ئاوو مەنجەڵ ناتوانن خواردنەکەیان دروست بکەن".

قەتی بە خەیاڵدا ناهات کە مەڕەکان هەر بەو خوێنەوە پارچە پارچە دەکەن و دوای برژاندن دەیخۆن.

لەبەر بۆنی ئەو ناوە نارەحەت دەبوو. دوای ئەو هەموو زەحمەتە کە بە بەخێوکردنی مەڕەکانەوە کێشابووی. ئێستا هەموو شتێك تەواو بوو بە بەرچاوی خۆیەوە مەڕەکانیان کوشتو خواردیان! وەکو گورگ، گورگی هار قەپاڵیان لە رانە خوێناوییەکەی مەڕەکان دەداو چەوری بە دەمو دەستیانەوە دەچۆڕایەوە. دەم خوار دوای تێر خواردن پارچە ئێسقانێکی دەکڕاندەوە، دەمی بە دەست پاك دەکردەوەو ئێسقانەکەی بە ئاسماندا توڕدا:

- وەرە ئێرە بچکۆل شتێك بە تۆش دەدەین!

های وا کە لە سەرماندا هەڵدەلەرزی، بە ساردییەوە وەڵامی دایەوە: ناخۆم.

گەڕایەوەو خۆی بە بەرانەکەوە سەر گەرم کرد.

- کەوایە! ناخۆی! وەرە ئێرە. هەی مشکە تۆپیو، ئەمجارەیان لە دەستم دەرناچیت! دەستی بە دارکاری کردنی "های وا" کرد. کاتێ های وا هاتەوە سەرخۆ تەنیا ئەوەندەی لە دەست هات لە جێیەك دابنیشێتو تەماشا بکات کە چۆن دوژمن بە گۆشتی مەڕەکانی ئەو سکی خۆیان تێر دەکەن.

## هەڵاتن

ژاپۆنییەکان دوای ئەوەی تاتوانیان تێیان تراند. پاشماوەی خواردنەکانیان کردە توێشەبەرەوەو لە پشتیان بەست. دوای ئەوەی مر بوون بۆ خەوتن روویان کردە گوند. تەنیا دەم خوار لەگەڵیانا نەڕۆیی. بە "های وا"ی گوت کە پاشماوەی مەڕەکان بکاتە نێو ئەو حەسارەی پشت گوندەکەوە.

"های وا" دوای ئەوەی هەموو مەڕەکانی کردە حەسارەکەوە، دەرگاکەی داخستو بەردێکی نایە پشت دەرگاکە. ئەوجا هەندێ کای دۆزییەوەو لە نێو حەسارەکەدا هەڵی رشت.

دەم خوار پرسی:

- دەتەوێ چ بکەیت؟

- دەمەوێ بخەوم.

- تۆ دەبێ بڕۆی بۆ گوندو لەوێ بخەوی.

بەم قسەیە، تەواوی نەخشەکانی "های وا"ی هەڵوەشاندەوە. های وا پرسی:

- بەڵام کێ ئاگاداری مەڕەکان دەکات؟ پڕ ئەم ناوە گورگە!

دەم خوار بە تووڕەییەوە گوتی:

- بەڵام... بەڵام... تۆ هەی زۆڵی حەرام زادە، من بە تۆ هەڵناخەڵەتێم. تۆ دەتەوێ هەڵبێی، وانییە؟ یاڵڵا وەرە بزانم!

های وای دایە پێش خۆیو بۆ گوندەکەی برد. دەم خوار "هایوا"ی بردە ماڵێکی یەك ژوورییەوە. ناو ژوورەکە کاڕێژ کرا بوو. ژاپۆنیو بەکرێ گیراوەکانیان لە حاڵێکدا کە تفەنگەکانیان بە باوەشیانەوە بوو لەسەر کایەکە ڕاکشا بوون. "های وا"یان خزاندە گۆشەیەکی تەنگی پاڵ دیوارەکەوە.

هەر زوو دەنگی پرخە پرخیان بەرز بووەوە. جگە لە ئێشك گرێك کە بە چاوی خەواڵووە لەبەر دەرگاوە دەیڕوانییە ئەملاو ئەولا. ئیدی چ کەسێك بەخەبەر نەبوو. های وا نایتوانی بخەوێ. مەسەلەی هەڵاتن بە ڕۆژەوە کارێکی مەحاڵ بوو. "پێویستە تا دنیا تاریکە هەڵێم. بەڵام چۆن؟ لێرەوە ناتوانم ڕەت ببم. ناش بێ نامە پەڕدارەکەیان بکەوێتە دەست!"

های وا چاوەکانی هەڵگلۆفتو تەماشایەکی دەرگای کرد. مانگ بەسەر گردەکەوە بوو. تریفەکەی هەموو لایەکی روناك کردبووەوە. "دیارە زۆر درەنگە".

ئێشگ گرەکە وەکو مانگا ناو دەرگاکەی گرتبوو و بە لاقەکانی ڕێگای دەرچوونی بەستبوو.

های وا چاوەکانی نایە سەر یەكو گوێی لە پرمە پرمی ئەسپەکانو خشەخشی پۆشو پەلاشی نێو تەویلەکەی پشت حەوشەوە گرت. "دەبێ لێرەش ئێشك گرێك هەبێ."

لە پڕ های وا لەوپەڕی گوندەوە دەنگێکی بیست:

- کێ لەوێیە؟

وەڵام درایەوە:

- مەیتەر!

"کەواتە لەوێش ئێشك گر هەیە!"

های وا زۆر نیگەران بوو. چۆن رابکات؟

لە دوورەوە دەنگی قوقوی کەڵەشێرێك دەگەییە گوێ. بەم زووانە دنیا رووناك دەبێتەوە. "های وا" نەیدەتوانی چیدی دەستەو ئەژنۆ دانیشێتو ماتەڵ بێ. هەستا.

ئێشك گری بەر دەرگاکە، لە گۆشەیەکدا کزکۆڵەی کردبوو. سەری بەسەر سینگیدا شۆڕ بوو بووەوەو تفەنگەکەی لەسەر ئەژنۆی بوو. ژاپۆنییەکان کە تێرو پڕیان خواردبوو، هەموو لاڵو پاڵ بەسەر یەکدا کەوتبوون دەستی دەم خوار لە نێوان سەری دوو کەسی دیدا بوو. پێ دەچوو چ ڕێگایەکی هەڵاتن نەبێت. بەڵام های وا نا ئومێد نەبوو. هەستایە سەر پێ، بە ئەسپاییو بە نووکی پێ دەستی دەم خواری لابرد. ئەوجا لەسەر پێی چەپ وەستاو بە پێی

راستی پێشی لادایە لاوە. دوا کۆسپ لە ڕێگایدا ئەفسەرە سمێڵ بچووکەکە بوو کە پرخە پرخی بوو. لەسەر گازی پشت خەوتبوو و دەستو لاقی لێ بڵاوکردبووەوە.
دنیا بەرەو ڕووناك بوونەوە دەچوو. سمێڵ چکۆڵە هەر پرخەی دەهات. لە کاتی پرخە پرخدا پەڕەی لووتی دەکرایەوە. تۆزێ خۆڵی لە عەردەکە کۆکردەوەو بە سمێڵی ئەویا کرد. کابرای ژاپۆنی لە پرخە کەوت. دووچاران بە توندی پژمی و گیانی لەرزی. بەڵام بێدار نەبووەوە. لوتی هەڵگلۆفتو کەوتە سەر تەنیشتو دووبارە دەستی بە پرخە پرخ کردەوە. ئیدی ڕێ بۆ "های وا" کرایەوە. هەستی دەکرد کە بارێکی قورسی لەسەر شان لاچووە. بەسەر ژاپۆنییەکەدا بازیداو بەرەو دەرگاکە خۆی کوتا، ئێشك گرەکە هێشتا هەر خەوتبوو.
"های وا" بە سڵ کردنەوە لە خانووەکە دەرچوو، تانزیکی نیوەی ڕێگا ڕۆیی بوو، یەکێك گازی کرد: کێ لەوێیە؟ "های وا" ئەو وەڵامەی شەوێی بیر کەوتەوەو بە پەلە وەڵامی دایەوە: مەیتەری ئەسپەکان. ئێشك گرەکە قەناعەتی کرد. های وا بەرەو تەویلەی ئەسپەکان ڕۆیی. واتە هەمان کاری کرد کەمەیتەرە ڕاستییەکە دەی کرد.
بەسەر دیوارێکی داروخاودا بازیداو بەرەو حەساری مەڕەکان ڕۆیی. مەڕەکان بە باعە باع قەپۆزی ساردیان لە های وا هەڵدەسوو. کاتی ئالیك دانیان بوو، و بێ تاقەت بوون. "های وا" ماوەی نەبوو فریایان بکەوێ. دەمو دەست بەرانە پیرەکەی گرتو نامەکەی دەرهێنا. دەنگی زەنگوڵە زەردەکەی بەرانە پیرەکەشی خەفە کرد. دوای شەش ساڵ لەوەڕاندنو بەخێو کردنی مەڕەکانی. ئێستا دەبوایە بە ناچاری لێیان جیا بێتەوە. ئەمە کارێکی ئەستەمو ناخۆش بوو بەڵام چ دەکرێ؟ نامەکەی خستە نێو گیرفانیو دۆخینەکەی توند کردەوەو بە پەلە بەرەو گردەکەی پشت گوندەکە هەڕای کرد.

## ئاڵای سپی

های وا، بەرەو دۆڵێکی تەنگ غاری دەدا. هەر کە گەییە دوو ڕیانێك لە دوورەوە دەنگی زەلامێکی بیستو کەمێ هێواش بووەوە. های وا نەیتوانی لێی حاڵی ببێ کە چی دەڵێت، بەڵام ئاڵایەکی سپی بچکۆلەی بینی کە لە پشت گردێکەوە دەجووڵا.
"کێ ئاڵای سپی بۆ ئەو تەکان دەدات، یەکەمجار لەسەر سەریو ئەوجا بەملاو بەولادا؟"
"های وا" نەیزانی کابرا چی دەڵێ، بەڵام وای هەست دەکرد کە ئەم دەنگە لە دەنگی نیشانەی خەتەرەکەی دوێنێ شەو دەچێ. لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە کە هەبێو نەبێ ئەمە یەکێکە لەو ژاپۆنییە بێ ئابڕوانەی کە دوێنێ شەو ئاگری لەو ناوە بەردا.

تەکان دانی ئالاکە تەواو بوو، ئەوجا شتێك کە تەنیا لە تفەنگ دەچوو، بۆ ئاسمان بەرز بووەوە.

های وا، چ ترسێکی نەبوو. دەیتوانی خۆی بخزێنێتە پەنای تاشە بەردەکانی ئەمبەرو ئەوبەری ڕێگاکەو خۆی لە گوللەی دژمن بپارێزێ. بەڵام درێژەی بە ڕێکردن نەدا. لەوانەیە سەربازەکانی دیش لەم نزیکانە بن! تەقەیەك دەتوانێ هەموویان خەبەر بکاتەوەو بواری هەڵاتنی لێ ببڕێ.

های وا کراسە سپییەکەی داکەندو یەکەمجار بەسەر سەریا بایداو ئەوجا بەملاو بەولایدا. واتە هەمان کاری کرد کە ئەو پیاوە کردبووی.

ژاپۆنییەکە چەکەکەی داگرتو دووبارە ئالاکەی هەڵبڕی. واتە ئەوی "های وا"ی بە دۆست زانیوە. "های وا"ش دووبارە کراسەکەی بادا. ئەوجا لە گردەکە دوور کەوتەوەو دەستی بە غاردان کرد.

بایەکە بە بناگوێدا گیڤەی دەکرد. باڵندەکان لەسەر درەختەکانەوە جیکەجیکیان دەکرد.

"های وا" زۆر لە باڵندەکان خۆشحاڵ تر بوو. ئەوەندە شاد بوو وای دەزانی باڵی لێ ڕوواوەو هاوڕێ لەگەڵ بایەکەدا دەفڕێ! لەم تاشە بەردەوە بۆ ئەو تاشە بەرد بازی دەدا، لەم دۆڵەوە بۆ ئەو گرد هەڵدەگەڕاو لەم گردەوە بۆ ئەو دۆڵ دادەگەڕا.

های وا بە هەناسە برکێ لەسەر تاوێرێك دانیشت. لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە:"ئیدی پێویست ناکات بەو خێراییە رابکات" چونکە گردی "زان وانگ" تەواو بەرانبەری بوو. گوندەکەش ڕێك لە پشت ئەم گردەوە بوو. لە پڕ نامەکەی بیر کەوتەوە" "بەم زووانە دەیگەیەنمە جێ!"

بێ ئەوەی ئارەقەکەی بسڕێ بە شادییەوە دەستی بە گیرفانیا کرد تا جارێکی دی نامەکە سەح بکاتەوە.

لە پڕ ئازای گیانی کەوتە لەرزین:

- "کوا نامەکە؟"

جارێکی دی گیرفانی گەڕا، نامە نەبوو. هەستا کراسەکەی داکەندەوەو هەمووی گەڕا. تەواوی ژێرو ژووری بەردەکان گەڕا. بەڵام بێهودە بوو نامەکە هەر نەبوو.

تەزوویەکی ساردی پێدا هات. دڵنیایەکە نامەکەی خستبووە گیرفانی، گیرفانی نەش دڕا بوو. "ئەی گوایە چی بەسەر هات؟!"

"های وا" بێ ئەوەی بیر بکاتەوە، دەمو دەست لە گردەکەوە چووە خوارێ، چاوی لە زەوی هەڵنابڕی. بەڵام نامەکە لەو ناوە نەبوو، نە لە دۆڵەکەداو نە لە پەنا بەردەکانا. های وا زۆر نیگەران بوو، های وا گشت خەتەرێکی خستە لاوەو یەکڕاست بەرەو گەلییەکە کەوتە ڕێ.

لە پڕ ڕاما. نامەکە لەوێ بوو، ڕێك لەو شوێنەی کە کراسەکەی بادا بوو. لە خۆشیاندا هاواری کردو خۆی بەسەر نامەکەدا دا. ئەوجا ڕوانییە دەوروبەری خۆی. لە دوورەوە هەندێ زەلامی تفەنگ بە شانی بینی. هەموو تفەنگەکان نێزەیان پێوە بوو.

"وا دیاره دژمن هێزی خۆی کۆ دەکاتەوە."

## های وا دیسان دیل دەبێ

"های وا" نامەکەی لە گیرفانی شاردبووەوە، لە پڕ لە پشتەوە دەنگێکی بیست.

خاوەنی دەنگەکە دەم خوار بوو کە خۆی بەسەر "های وا"داداو هاواری کرد: هەی چەپەڵ، رادەکەی؟ دەتکوژم!

ئیدی بۆ هەڵاتن درەنگ بوو بوو. بۆیە های وا بە ئارامی گوتی: کێ فیرار دەکات؟ بە دوای مەڕەکانمدا دەگەڕام.

- کام مەڕ؟ کێ بەتۆی گوتووە ئەم کارە بکەیت؟ مەڕەکان لە کوێن؟ ها؟

لە رقاندا نەڕاندی و کۆڵەمستێکی بەناوسکی "های وا"دا دا. های وا دانیشت و دەستی بە سکییەوە گرت:

- هێشتاهیچیانم نەدۆزیوەتەوە.

سکی های وا زۆر ژانی دەکرد. ئارەقەش بەنێو چەوانەییەوە دەچۆڕا. بە دوو دڵییەوە دەستی بەسەر گیرفانەکەیدا هێنا تا لە مانی نامەکە دڵنیا بێت. های وا گوتی:

- ئەمڕۆکە بەیانی زوو چوومە حەساری مەڕەکان و بینیم کە دەرگای حەسارەکە کراوەیە. هەموو شوێنێك بۆ مەڕەکانم گەڕام. ئەگەر بم دۆزینایەتەوە ئیدی بەدوایاندا ناگەڕام.

دەم خوار نەڕاندی:

- تۆ درۆ دەکەی. تۆ دەتویست هەڵبێی. تۆ... دەتکوژم! دیسان دەستی بە دارکاری کردنی های وا کرد. دەتکوت لە رەشکەکا دەدات. بەڵام های وا رەشکە کانەبوو. بۆیە لە تاو ئازار هاواری دەکرد. دەستی بە سکییەوە گرت و هاواری کرد:

- ئاخر بۆ دەبێ هەڵبێم؟ ئەگەر هەڵبهاتمایە ناگەڕامەوە. بەڵام باشتر کە تۆ وا دارکاریم دەکەیت! مەڕەکان هی ئاغام. خاوەنی گوندی "چوا" بوون. ئێستاش زۆریان سەر بڕان و ئەوانی تریان گووم بوون. ئایا من دەتوانم جارێکی دی بچمەوە لای؟ نەخێر ناتوانم بگەڕێمەوە. چاکتر وایە هەر لێرەدا بمکوژیت.

لە کاتێکدا کە درۆی بۆ دەم خوار دەهۆنییەوە، بەردەوامیش ناڵە ناڵی دەکرد. ئاقیبەت لەسەر زەوییەکە دانیشت و بە شێوەیەکی خەمگین دەستی بەگریان کرد. هەردوو دەستی بە دەموچاوییەوە گرتبوو, و سەری داخستبوو بە ئانیشکیشی گیرفانەکەی توند دەکرد تا نەبادا نامەکە بکەوێ. "هەرگیز نابێ نامەکە بکەوێتە دەستی دژمن. ئەگەر دەم خوار نامەکە

بدۆزێتــەوە ئیـدی کـار لــە کـار دەترازێـت!" بـەڵام دەم خـوار هـەرگیز بـیری لـەوە نـەکردەوە کەگێرفانەکانی بگەڕێ. های وا بە تەواوی دەم خواری تەفرەدا بوو.

ژاپۆنییـەکان دەیانویسـت هێـرش بکـەنو بـە دوای رێنوێنێکـدا دەگـەڕان. دەم خـوار یەخـەی "های وا"ی گرتو گوتی:

- بەسە ئیتر، بی بڕەوەو چیدی ناڵە ناڵ مەکە! هەستە رێگا بە سوپای ژاپۆنی نیشان بدە! ئەگەر نەیبڕیتەوە بە قوربانی گوللەیەکت دەکەم!

های وا گرینوك نەبوو. دوای چەند هەنگاوێ ئیدی لەگریان کەوت، لەحاڵێکدا کە دەیڕوانییە دەم خوار گوتی:

- ئەفسەر! لە ئەفسەرە ژاپۆنییەکان بپرسە کە ئایا من دەتوانم لەگەڵ ئێوەدا بێم؟ مـن ئیـدی ناتوانم بۆ ماڵ بگەڕێمەوە. دەم خوار لە ژێر لێوەوە گوتی:

- تۆ دەتەوێ سکی خۆت تێر بکەیو هیچی دی! تۆ دەتەوێ لەگەڵ ئێمەدا بێی؟ تۆ هەر کە تفەنگێك هەڵگری. دەکەویتو دەمری!

های واتا توانی بە غەمگینییەوە تێی روانی. ئەوجا بە پاڕانەوەوە گوتی:

- ئەفسەر گیان. رزگارم بکە! تەنیا یەك شت بە ئاغام بڵێ پێی بڵێ کە دەرم نەکات.

دەم خوار تاقەتی نەبوو لەم بارەیەوە لەگەڵ های وا قسان بکات.

"های وا"ی توڕدایە ناو حەساری مەڕەکان. لەم کاتەدا چەند سەربازێکی بەکرێ گیراو هاتنە ئەوێ. کە دەم خواریان بینی گازیان کرد:

- هێی! ئەوە لە کوێ دۆزیتەوە؟ ئەم حەرام زادەیە بۆ کوێ هـەڵاتبوو؟ پێویسـتە هـەر ئێسـتا برۆی بۆ لای ئەفسەرە ژاپۆنییەکەو هەموو شتێکی پێ بڵێی. هەموو ئامادەی هێرشن!

دەم خوار دەیویست وەڵامیان بداتەوە کە لەم کاتەدا دەنگـی شـاور لـە گوندەوە بـەرز بـووەوە. هێزەکـانی دژمــن لەوێــدا کۆبووبوونــەوە. ســەبازە بــەکرێ گیراوەکـان تفەنگـەکانیان بــە شاناداوبەرەو شوێنی کۆبوونەوەکە رۆیشتن, دەم خوار نەڕاندی:

- هەر ئێستا مەڕەکان بێنە دەرێ. ئەگەر جارێکی دی هەڵبێی دەتکوژم! ئەویش کڵاوەکەی رێکخسـتو رۆیـی، هـای وا بـە تـاقی تـەنیا لـە نێـو حەسـارەکە مایـەوە. هـەڵاتن کـارێکی ئاقڵانە نەبوو. بۆیە بڕیاریدا کە دیسان نامەکە بشارێتەوە. "سمێڵ بچکۆلە جارێکی دی دەم کوژێـت!" هـای وا ئەمـەی بـە خـۆی گـوتو دووبـارە نامەکـەی بـە بـن دوگـی بەرانـە پیرەکەوە بەستو یەکراست مەڕەکانی بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە رانی.

سەربازانی دژمن بەملاو بەولادا پیاسەیان دەکرد، نێزەی تفەنگەکانیان لەبەر تیشکی هەتاودا دەبریقایەوە. هەموو لـە هـای وا رامـابوون. دەم خـوار لەبـەردەم سمێـڵ بچکۆلەدا وەستا بـوو. دەسـتی بەسـەر شمشـێرەکەیەوە بـوو. ژاپۆنییەکـە خـەریکی جنێـودان بـوو بـە دەم خـوار. کـە "های وا"ی بینی لێی راما. های وا لەبـەر خۆیـەوە بـیری دەکـردەوە: "ئێسـتا منـیش دارکاری دەکات". روانییـە دەم خـوارو چـووە ژێـری: "ئەگـەر ئـەمجارە لـێم بـدەی، بێگومـان بـە قەسـتی کوشتن لێم دەدەیت. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا نامەکە هەر دەگەیەنمە جێ!".

## گردی "زان وانگ"

ئیدی ماوەی دارکاری کردن یان پشکنینی گیرفانەکانی های وا نەمابوو. بۆیە کابرای ژاپۆنی وەکو سەگ هاواری کرد:

- بۆ گردی زان وانگ، بکەوە پێشمان! دەی خێرا!

دڵی های وا کە بە توندی لێی دەدا گوتی:

- من رێگاکە شارەزام. لەم لایەوەیە!

کابرای ژاپۆنی شمشێرەکەی هەڵتەکاندو سەربازانی دژمن هەرەکەتیان کرد. های وا کەوتە نێوانیانەوەو مەڕەکانیش لە پێشیانەوە دەڕۆییشتن. لە پێش هەموویانەوە بە کرێ گیراوەکان دەڕۆیین و لە دوای هەمووشیانەوە ژاپۆنییەکان بە سواری ئەسپ دەهاتن.

"ئێوە دەبێ فەرماندەی چانگ تێك و پێك بشكێنن!" های وای لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئومێدەوارم کە ئەوان ئێوە تەفرو تونا بکەن، ئەگینا چ ئومێدێك بەم نامەیە نابێ!"

سمێڵ بچکۆلە هەمیشە پرسیاری گردەکەو رێگاوبانەکانی لە "های وا" دەکرد یا دەستووری دەدای کە مەڕەکان خێرا تر لێ بخوڕێ. هاواری دەکرد:

- خێراتر، خێراتر!

های وا کە بینی مەڕەکان دوگیان بۆ پشقل کردن هەڵبڕیوە، زۆر نیگەران بوو "ئەگەر بەرانە پیرەکەش وا بکات, ئەوا نامەکە دەبینن". لە راستیشدا بەرانەکە دەیویست دوگی هەڵبڕێ. های وا دەمو دەست بەردێکی هەڵگرت و هاویشتییە بەرانەکە. بەرانە پیرەکە لە ترساندا دوگی دادایەوەو تاتوانی خێرا تر رای کرد. های وا قەمچییەکەشی بادا. سمێڵ بچکۆلە بە تەواوی هاتبووە سەر زەوق. هاواری کرد:

- زۆر چاکە, زۆر چاکە, خێراتر!

های وا پەیتا پەیتا بەردی دەهاویشت و قەمچییەکەی با دەدا. بۆیە بەرانە بێ چارەکە ناچار بوو دوگ هەڵنەبڕێ. بەو چەشنە رۆیین تاگەیینە بناری گردی "زان وانگ". "گردی زان وانگ! چ مەیدانێکی جەنگە! لێرەدا ژاپۆنییەکان دەکەونە تەڵەوە، ئەندامانی ئێمە بێگومان لە پشت گردەکەوە کەمینیان داناوە."

"های وا" بەدوای داری نیشانەی خەتەری سەر گردەکەدا دەگەڕا، دارەکە لەوێ بوو، بەلاّم هەر کە ژاپۆنییەکان لەگردەکەی بەرانبەرەوە دابەزین دارەکە نەما، "سەرتیپەکەمان، دژمنی بینیبوو!"

بەڵام ژاپۆنییەکان، بە ئاسوودەیی لە نێو دۆڵەکەدا پشوویان دەدا، ئەفسەرە ژاپۆنییەکە لەسەر زەوییەکە دانیشتبوو و جگەرەی دەکێشا. ئەوانی تریش پاشماوەی گۆشتی مەڕەکانیان دەخوارد. سەربازە بەکرێ گیراوەکانیش کە نە جگەرەیان دەکێشاو نە خواردنیان دەخوارد، وردە وردە بەگردەکەدا هەڵدەگەڕان. هەموویان لە باریکە ڕێگایەکەوە سەر دەکەوتن!. "های وا" لە دژمن دوور کەوتەوە. چونکە "نابوو دەستگیر ببێ، ئەگینا چ کەسێک نامەکە بگەیەنێتە جێگای مەبەست؟" مەڕەکانی بەرەڵلا کرد تا بلەوەڕن و لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە "چەند باش دەبوو، ئەگەر سەرتیپی –چانگ– هەر ئێستا دەست بە شەڕ بکات. چونکە کە تەقە دەستی پێ بکردایە ئەو دەیتوانی هەڵێ و خۆی لە پەنا تاوێرەکاندا بشارێتەوە. چ پێویستیشی ناکرد سەرتیپی چانگ بۆ ئەو نارەحەت بێ. خۆزگەی دەخواست کە بوونی مەڕەکان نەبنە بەرهەڵست بۆ سەرتیپی –چانگ–. تەنیا کە دژمن بشکێت، ئەوسا دەکرێ نامەکە بگاتە جێ".

بەڵام چ تەقەیەك لەسەر گردەکەوە نەکرا، نزیکەی نیوەی بەکرێ گیراوەکان چووبوونە سەرەوە. "بۆ هیچ نەبوو؟!" های وا خەریك بوو نا ئومێدی پەیدا بکات کە لە پڕ، لەگەڵ تەقینەوەیەکی گەورەدا دووکەڵێکی چڕ بە ئاسماندا چوو. بەکرێ گیراوەکان قاچیان لەسەر مینێك دانابوو.

تازە جەزای خیانەتیان دەدایەوە. تەنیا ژمارەیەکی کەمیان لە ناو دووکەڵەکەوە هاتنە دەرێ و بە پەلە پڕوزێ دەیانویست خۆیان بدەنە پاڵ تاشە بەردەکان.

ئیدی تەقینەوە سەری کرایەوە. تەواوی دۆڵەکە دەلەرزی. بەکرێ گیراوەکان کەوتبوونە مەیدانێکی مینەوە کە سەرتیپی "چانگ" نابوونییەوە.

دەم خوار یەکەم کەس بوو کە گەڕایەوە. هاواری دەکرد:

- ئاە، خوایە! ئاە، خوایە! سەرم، سەرم!

های وا پێی دەکەنی. خوێن لە دەمو لووتی دەم خوارەوە دەڕۆیی. یان پارچە مینی بەرکەوتبوو. یان لە کاتی هەڵاتندا سەری بەر تاشە بەرد کەوتبوو، کابرای ژاپۆنی بێ ئەوەی بۆ دەم خوارو بەکرێ گیراوەکانی دی نارەحەت بێ، باریکە ڕێیەکی نیشان "های وا"داو دەستووری دا:

- تۆ... هەوەڵ جا بڕۆ... ڕێ بدۆزەرەوە! سوپای ژاپۆن لە دوای تۆوە دێت. حاڵی بوویت؟.

# ڕێگا مالرو

های وا تۆزێك لێی ڕاما. ئەوجا بۆ پرسیار کردن چوو بۆ لای دەم خوار. دەم خوار لەسەر زەوی دانیشتبوو. خەریك بوو بەسارغییەك سەری دەپێچا:

- ئەفسەرە ژاپۆنییەکە گوتی: – کە تۆ لەگەڵ مەڕەکانتدا ڕێیەك بدۆزیتەوە.

های وا گوتی:

- من ئەم کارە ناکەم! من بە نێو میندا ڕەت نابم! نەخێر من ئەم کارە ناکەم!

سمێل چکۆلە هاواری کرد:

- هەی کەر پیاو"

شیرەکەی هەڵکێشا:

- دەبێ ڕێیەك.... بدۆزیتەوە!

دەم خوار پشتگیری قسەکەی ئەفسەر ژاپۆنییەکەی کرد:

- هەی چەپەڵ! هەر دەبێ بڕۆی،من تاقەتم نییە خۆم بکەم بە خۆراکی مین!

های وا تەماشایەکی ژاپۆنییەکانی کرد. هەموو شمشێرەکانیان هەڵکێشابوو. تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد. ڕووی تەواوی تفەنگەکان لەو بوو. "ئەگەر من بکوژن، ئەوسا مەڕەکان بەرەو مەیدانی مینەکان دەنێرن".

های وا تەماشای گردی "زان وانگ"ی کرد: مەیدانێکی گەورەی مین! دەمێ بوو بۆ دژمنیان نابووەوە. های وا سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ نامەکە لە مەترسی مین بپارێزێ. ئەو وەکو سەرتیپی مندالآن نابوو پێ بەو مینانەدا بنێ کە پێشمەرگەکان دژی ژاپۆنییەکان نابوویانەوە. چونکە نەیدەتوانی نامەکە بگەیەنێتە جێگا.

های وا لەوە پێش مەڕی لەگردی زان وانگ لەوەڕاند بوو و چەند جارێکیش لە هەمان ڕێگاوە نامەو پەیامی بردبوو. هەموو پێچ و پەناکانی ڕێگای مالرو شارەزا بوو، دەیتوانی بە شەویش بیدۆزێتەوەو پێی دا بڕوات. بەڵام ئەمڕۆکە ئەم باریکە ڕێیەی زۆر لە لا درێژ بوو بوو.

ئەفسەرە ژاپۆنییەکە فەرمانیدا، سەربازەکانی تفەنگیان هێنایە سەرپێ و ئامادەی تەقە کردن بوون. پیرە بەرانەکە سەری تەکان دەداو زەنگۆڵەکەی ملی دەزرینگایەوە. های وا لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "زۆر چاکە. دەڕۆم. ئەگەر خۆم لەگەڵ مەڕەکاندا بڕۆم گەلێك چاکترە لەوەی ئەم بێ ئابڕوانە بیانخەنە ناو مەیدانی مینەکانەوە. دەزانم حەز دەکەن بەچاوی خۆیان

ببینن کە چۆن مین بە ئاسماندا هەڵم دەدا. بەڵام دڵنیا بن کە ئەم ئاواتەتان دەبەنە گۆڕەوە! من پێ نانەمە سەر مینەکان بەڵام ئێوە بەم زووانە کاڵەك بە ئەژنۆتان دەشکێنن؟"

های وا پیرە بەرانی دایە پێش خۆیو قەمچییەکەی خستە کار.

- یاڵا، هەموو بەدوای بەرانە پیرەکەدا! لە یەکدی جودا نەبنەوە! نەوەستن! ئەم ناوە یەك پارچە مینە. لە پاڵ تاوێرەکاندا، لە نێو گیایەکاندا، لەسەر دارو درەختەکان، لە هەموو شوێنێ مین هەیە. نەچن بەملاو بەولادا! دوای بەرانە پیرەکە بکەونو هەقتان نەبێ.

کوێستانی چڕی "تایهانگ" سەری لە ئاسمان دەسوو. دەتگوت گردی "زان وانگ"ی لە ئامێز گرتووە. های وا کە بە بەردەوامی قەمچییەکەی بادەدا. خێرا خێرا دەچووە پێشێ:

- خێرا ترا! خێرا ترا!

سمیڵ چکۆلە دەستی لە های وا هەڵناگرت. های وا کە ئاوڕی دایەوە بینی ئەسپەکان تەنانەت بەبێ باریش زۆر دوا کەوتوون. بەدوای ئەسپەکانەوە سەربازانی ڕەش پۆشی بەکرێگیراو بە لەتر دانەوە سەر دەکەوتن،ئەوجا لەدوای ئەوانەوە ژاپۆنییەکان دەهاتن. ئەفسەرەکە دوا کەوتووەکانی هان دەدا. سمێڵ بچکۆلە لە حاڵێکدا کە شمشێرەکەی بادەدا بە هەناسە بڕکێ هاواری دەکرد:

- خێرا ترا! خێرا ترا!

های وا لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە کە : "ئەم پەلە پەلەیان بێهودەیە. هاکا ڕێگای بەرو دوایان لێ گیراو تەفروتونا کران" زۆری حەز دەکرد کە بپرسێت: "بۆ هێندەتان پەلەیە؟"

های وا زۆر شارەزایانە بە نێو تاشە بەردەکاندا دەڕۆیی. کاتێ کە مەڕەکان گەیینە بێشەیەکی بچووك، وەستان.

"لە کام ڕێگاوە" لە باریکە ڕێگاکەوە یان لە ڕێگای مالرو– وە؟" پەڕینەوە لەم ڕێگایەوە مەحاڵ بوو.

های وا ئیدی ژاپۆنییەکانی نابینی. لەبەر خۆیەوە بە دژمنی دەگوت:

- "ئێستا ئەگەر پیاون بە دوای مندا بێن!" ئێستا مەڕەکان کەوتبوونە سەر ڕێگای "مالرو". سوپای دژمن لە بێشەکەدا ون دەبوونو دەردەکەوتنەوە.

های وا دەنگی دەم خواری دەبیست کە هاواری دەکرد:

ئەم ڕێیە هەڵەیە. بگەڕێوە بە ڕێگا ڕاستەکەدا برۆ!

های وا وەڵامی دایەوە کە:

- ئەم ڕێگایە باشە! ئەمە قەدبڕە. یاڵا سەرکەون!

- ئەسپەکانیش دەتوانن لەم ڕێگایەوە سەر بکەون!

های وا گوتی:

- ئیدی چۆن! بە ئاسانیش

قەمچییەکەی بادا. های وا بە ئاسانی بەسەر تاوێرەکاندا سەردەکەوت, هێندە خێرا دەڕۆیی دەتگوت بە راستە شەقامدا دەڕوات. لەم کاتەدا ژاپۆنییەکان تەواو دوا کەوتبوون. بەکرێ گیراوەکان هاواریان کرد:

- راوەستە. ئەسپەکانمان ناتوانن سەر بکەون! بووەستە!

های وا ئەسپەکانی بینی کە لە پاڵ تاشە بەردەکاندا وەستان.

- هەر ئەوەندە خۆتان بگەیەننە ئەم سەرە, ئیدی ئاسانە، ئێرە دەشتە. ئەسپەکانتان بۆ ئێرە بێنن!

ژاپۆنییەکان ئەسپەکانیان رادەکێشا. بەڵام ئەسپەکان جەنەیان دەبەست. ئەنجام رەق راوەستان. های وا بەشادییەوە گۆرانی دەچڕی:

- ئەگەر ئەسپێکت بینی خەریکە جەنە دەبەستێ خێرا کلکی بنوشتێنەوە! هێی... بجوڵێن. هێی خێراکەن، بجوڵێن!

بە راکێش راکێش و پاڵ نان ئەسپەکانیان تا سەرەوە هێنا. های وا لە تاوێرێکەوە بۆ تاوێرێکی دی سەردەکەوت. تا دەهات رێگاکە تەنگ ترو سەخت تر دەبوو. زەلامەکانی دژمن دەبوایە دوای هەر هەنگاوێك بووەستن و پشوو تازە بکەنەوە. زوو بەزوو لە چاو ون بوون، های وا گەییبووە ناوەندی گردەکە کە سمێڵ بچکۆلە فەرمانی دایێ کە بوەستێ و چاوەڕوان بکات. های وا وا خۆی دەنواند کە گوێی لێ نییەو پەلەتری کرد.

"سەرتیپی، تیپی منداڵانی دژ بە ژاپۆن، هەرگیز فەرمانەکانی دژمن ئەنجام نادات!"

های وا بە پەلە بەرەو سەرێ غاری دەدا، دەم خوار هاواری کرد:

- بووەستە! بووەستە! ئەگینا دەکوژرێی!

بەڵام های وا بە پەلەتر رۆیی. ژاپۆنییەکان دەستیان بە تەقان کرد، گوللەکان بە گیزە گیزە بە تەکیدا رەت دەبوونو بە تاوێرەکانەوە دەگیرسانەوە، های وا خێراتر غاری دەدا. لەگەڵ مەڕەکانی دا بەدوی پەنایەك دا دەگەڕا. گوللەکان نزیكو نزیکتر دەبوون. گوێی لە دەستڕێژێ بوو. کەوت. بەسەر گیایەکاندا، تا توانی رووەو سەر گردەکە هاواری کرد:

- ژاپۆنییەکان خەریکە دێن! تەقەکەن! خێرا کەن!

## های وا بریندار دەبێ

تەقە لەسەر گردەکەوە دەستی پێ کرد. یەکەمجار یەکێك و دوایی یەکێکی تر. های وا هەر هەستا و بە پەلە بەرەو سەر گردەکە غاریدا.

دوای چەند هەنگاوێ لە پڕ لارە لاری پێ کەوت، هاوارێکی کردو بە زەویدا کەوت.

لەم کاتەدا، پێشمەرگەیەکی لقی هەشتی سوپای سوور کە جلی خاکی لەبەر بوو، لەسەر گردەکەوە خۆی گەیاندە های وا. های وای دا بە کۆڵیا و بردییە ئەولای گردەکەو هاواری کرد:

- شوانە بچکۆلەکە بریندار بووە!

پێشمەرگەیەکی تری سوپای سوور کە دەمانچەیەکی بەدەستەوە بوو لە تەك های وا دانیشت و پرسی:

- ئەمە های وا نییە؟ شوانە بچکۆلەی گوندی "لونگ من"؟ کە هەمیشە هەواڵی بۆ دەهێناین؟ چۆن کەوتۆتە دەست دژمن؟

های وا چاوەکانی هەڵێناو فرمێسك لە چاوی هاتنە خوارێ، ئەم پیاوەی کە لە تەك های وا بوو هاورێ "چانگ"ی سەرتیپ بوو، های وا بە شادییەوە دەیویست کە بیبەن بۆ لای بەرانە پیرەکە، بەڵام نایتوانی لە جێی خۆی بجوڵێ.

- بەرانە پیرەکە... بدۆزنەوە... نامەیەکی سێ پەڕ!

"چانگ" لە کاتێکدا کە برینەکانی "های وا"ی دەرمان دەکرد پرسی:

- بەرانی پیر چییە؟ کوا نامە؟

- بەرانە پیرەکە... دوگی... لە ژێر نامە... نە ء... نامەکە لە ژێر... بەڵام های وا ئیدی بورایەوە. نەی بینی کە چۆن ژاپۆنییەکان لەو دەشتەدا بوون بە خۆراکی ئاگر. کاتێ کە بە هۆش هاتەوە هەستی بە ئازارێکی کوشندە دەکرد. لەسەر تەختێکی نەرمو گەرم راکشێنرابوو. بەتانییەکی سووری نەرمیانیش بەسەردا دابوو.

تیشکی هەتاو کە لە پەنجەرەکەوە لە بەتاییە سوورەکەی دەدا روناکییەکی جوانی پێ بەخشی بوو. کۆمەڵێك قوتووە خواردنی چاك لە تەك های وا دانرابوون. هاورێ "چانگ" لەتەکی دانیشتبوو، تەماشای دەکرد، زەردەخەنە دەیگرت:

- ئێستا باشتریت؟ هێشتا ئازارت هەیە؟

های وا ئازارەکانی فەرامۆش کردو پرسی:

- من لە کوێم؟ ئەم شتانە هی کێن؟

- ئەمانە هەمووی هی تۆن.

ئایا "چانگ" هەڵی خەڵەتاندووە؟ های وا تاکو ئێستا هەرگیز خواردنی قوتووی نەدی بوو.

"نا، ئەمانە هی من نین". هاوڕێ چانگ پێکەنی:

- نامەکەی کە دوێنێ بۆت هێنام، فەرامۆشت کردووە؟ هەواڵەکەی باوکت، کە ژاپۆنییەکان لە گوندی "تیان چو" لە سەربازگەکانی خۆیان دەرچوون و بۆ تالان کردن بۆ ناوچە شاخاوییەکان چوون و ئەمەی کە چەند کەسێك لە سەربازە بەکرێ گیراوەکان لە گوندا ماونەتەوە؟ باوکت داوای لە ئێمە کردبوو تا هێزی بۆ بنێرین. لەبەر ئەوە دوێنێ شەو هێزی "پڵینگی شەوانە"و چەند لقێکمان بۆ چیاکان نارد. ئێمە لە سەرەتادا دژمنان ئابلۆقەداو ئەوجا لە دەرەوەی گوند، لەگەڵیاندا کەوتینە شەڕ. لەم کاتەدا لقەکەی بابی تۆش لە گوندەوە هێرشیان کردە سەر دژمن. بە هاوکاری و یەکێتی توانیمان دژمن تەفرو تونا بکەین و هەموو شتەکانیان بگرین.

های وا پرسی:

- ئەی سمێڵ بچکۆلە؟

- کێ؟

- ئەو ژاپۆنییەی کە لەگەڵ دەم خوارو داروودەستەکەیدا هاتبوون بۆ گردی "زان وانگ"!

- مەبەستت هێزەکانی دژمنە کە بۆ تالان کردن هاتبوون بۆ شاخەکان؟

هاوڕێ "چانگ" پێکەنی:

- کاتێ کە بینیان بنکەکانیان لە خەتەردایە، پاشەکشەیان کرد.... بەم جۆرە کەوتنە داوی هێزەکانی تری ئێمەوەو تەفرو تونا بوون... ئەگەر نامەکەی تۆ نەگەیبیشتایە، لەوانە نەبوو ئەم سەرکەوتنە بەدەست بێنین و ئەگەر ئەم سەرکەوتنەشمان بە دەست نەهێنایە ئەوا ئەم دەستکەوتانەمان نەدەبوو.

هاوڕێ "چانگ" بە دڵسۆزییەوە دەستێکی بەسەری "های وا"دا هێناو گوتی:

- لە راستیدا تۆ پێشمەرگەیەکی بچکۆلەی سوپای سووری. پاڵەوانێکی بچکۆلەی! ئەم قوتووە خواردنانەش، سەرکردایەتی بۆ تۆی کردووە بە دیاری.

- های وا سوور بووەوە:

- تفەنگیشمان گرتووە؟

- تەماشای ئەوی بکە!

هاوڕێ چانگ بە دەست ئیشارەتی بۆ سوچێکی ژوورەکە کرد. یەك دنیا تفەنگی نوێی ژاپۆنی لەوێ هەڵچنرابوو.

- من دەمەوێ یەکێك لەوانەم هەبێ! تفەنگێکم بدەنێ!

"های وا" بەتانییەکەی لەسەرخۆی لادا، ویستی دەست درێژی بکات، لە تاو ئازار بە دەنگی بەرز هاواری کردو..................

سەرگەڵو /1985/3/18

# شێرو مشك

(كە پەردە لادەبرێ، دیمەنی دارستانێك دەبینرێ، لە دەوروبەری شانۆكەدا، دیمەنی درەختان بەرچاو دەكەون، وەرز، وەرزی بەهارە، گوڵو گیای خۆرسك دەبینرێ. گوتیار "راوی" لە سەنتی راستەوە وەژوور دەكەوێ".

گوتیار/ هەبوو نەبوو، یەكێ هەبوو یەكێ نەبوو. دەگێڕنەوە لە ساڵو رۆژگارانی كۆندا، لە دارستانێكی سەوزو دڵگیردا شێرێك هەبوو، گیانلەبەرانی دارستانەكە بە پاشای دارستانیان دەزانی. هەڵبەتە لەبەر تواناو هەیبەتی خۆی بە پاشایان دەزانی. بۆیە هەمیشە هەوڵیاندەدا كارێ نەكەن كە تورە ببێ. مشكێكی چكۆلەی زیتو زرینگش لە هەمان دارستاندا دەژیا. ئەم مشكە زۆری حەز لە راوە پەپولە بوو. كە بەهار دەهات، پەپولان دەكەوتنە فڕینو ئەم گوڵو ئەو گوڵیان دەكرد، ئیدی مشكە چكۆلە لە خۆشیاندا جێی بەخۆی نەدەگرتو دووی پەپولان دەكەوت. هەندێ جار بۆی رێدەكەوت كە پەپولەیەكیش بگرێ. ئەزقەزا لە بەهارە رۆژێكی سازگاردا جەنابی مشك بە قەستی راوە پەپولە، بەنێو پیرە دارستان كەوت.

((گوتیار، وەدەردەكەوێ. پەپولە وەژوور دەكەوێ. بەدەم نەرمە گۆرانییەوە لەسەر گیایەك دەنیشێتەوە))

پەپولە/ پەپولان جوانو قەشەنگن، جوانو قەشەنگن

باڵیــــــــــــــان نەخشـــــــــــــــینو رەنگـــــــــــــــاو رەنگـــــــــــــن

بەه بەه لەو دارستانە جوانە

یەكپارچە گوڵو گوڵزارە

هەوای خۆشەو فێنكی گیانە.

دەكرێ بە سەعاتان لێرەدا گەشتوگوزار بكرێو لەزەت لە جوانی گوڵان بدینی "كە دەبینێ شێر لە غوڕابی خەودایە، خۆی كەنار دەگرێ" ئۆو، جەنابی شێریش لێرەیە، بەڕاستی چاكی هەڵبژاردووە، چ خەوێكی لێكەوتووە! لە تۆ وایە چەندین هەفتەیە نەخەوتووە، "دەنگی جوڵەیەك دێت" دەڵێی یەكێك بۆ ئێرە دێ. دەبێ ئاگام لە خۆ بێ "خۆی لە پاڵ لقێكدا مت دەكات، مشك وەژوور دەكەوێ" ئەمرۆژانە بڕ بڕ تووشی راوچییانی پەپولان دەبی.

مشك/ "دەوەستێ، هەناسەیەكی قووڵ هەڵدەكێشێت". ئەمرۆ لە رۆژە خۆشەكانە. تۆزێ ئیسراحەت دەكەمو پاشی دەچمە راوە پەپولان. "پاڵ دەدات بە درەختێكەوە. كە دەیەوێ

ئیسراحەت بکات، چاوی بە پەپولەیەك دەكەوێ" وەی وەی، ئەمە یەکێکیان لێرەیە، چەند جوانیشە، نابێ بێڵم لە دەستم دەرباز بێ.

"هێدی هێدی لە پەپولەکە نزیك دەبێتەوە، لێ هەر کە دەستی بۆ دەبات، پەپولەکە هەڵدەفڕێ.

پەپولە/ ئۆو "پێدەکەنێ"

مشك/ ئەه، فری. "هەمدیس بە ئەسپایی بەرەو پەپولەکە دەچێ"

پەپولەکە هەمدیس هەڵدەفڕێ و ئەمجارەیان لەسەر کلکی شێرەکە دەنیشێتەوە. مشکەکە بێ ئەوەی بە شێرەکە بزانێ بازێك دەداتە سەر کلکی شێرەکە، پەپولەکە ئەمجارەش هەڵدەفڕێ و لە شوێنێکی دی دەنیشێتەوە.

پەپولە/ "بەپێکەنینەوە" ئەهای ئەوە چ دەکەی، وریابە. "تا مشکەکە فریا دەکەوێ شێرەکە رادەپەڕێ و بە تورەیی سەر هەڵدەبڕێ تا بزانێ چ گیانلەبەرێك ئەم ناماقوڵییەی کردووە، چاوی بە مشکەکە دەکەوێ. مشکەکە کە دەستەپاچە بووە، نازانێ چ بکات. شێرەکە لە چاو تروکانێکدا مشکەکە دەگرێ.

شێر/ ئەی مشکی شەیتان ئەو چ دەکەی لێرە؟

مشك/ ئاهە ئاه خنکام. بێ زەحمەت بەرم بدەو با بڕۆم. تکا دەکەم بەرەڵلام بکە.

شێرە/ بەرەڵلات بکەم بڕۆی ها؟ "پێدەکەنێ" بووی بەو پیاوەی کە گاڵتە لەگەڵ مندا بکەی؟ "پێدەکەنێ و دەبۆڵێنێ" هەر ئێستا چارت دەکەم. "پێدەکەنێ و لە جێی خۆی رەق رادەوەستێ".

گوتیار/ "وەژوور دەکەوێ" بەڵێ منداڵان رەنگە نەزانن کە مشکی بێ یەغباڵ لە نێو چنگی بەهێزی شێرەکەدا چ حاڵێکی شڕی هەبوو. بەڵام بەو حاڵەشەوە هەوڵیدەدا هێدی بێت و نەپەشۆکێ و کارێکی وەها نەکات کە شێرەکە لەوەی پتر تورە بکات. بۆیە لە کاتێکا کە هەوڵی دەدا جڵەوی خۆی لە دەست نەدا، کەوتە گفتوگۆ دەگەڵ شێرەکەدا "گوتیار وەدەردەکەوێ، روناکی دەکەوێتە سەر شێرو مشکەکە".

مشك/ جەنابی شێر، دەزانم کەکارێکی نابەجێم کردو بوومە مایەی تورە بوونی جەنابتان، زۆرم لەمەڕ گەورەیی ئێوە بیستووەو ئیدی لە کۆنەوە گوتوویانە، بەخشندەیی هی گەورانە. تکاتان لێدەکەم بە گەورەیی خۆتان لە گوناحم خۆش بن. باوەڕبکە من نەمویست بێ ئەدەبیتان لە روودا بکەم، جا بەڵکو ئێستا پەنجەی موبارەکتان تۆزێ شل بکەن تا مەرەخەس ببم، جا قوربان بەڵێنتان وێدەدەم کە هەرگیز ئەم چاکەیەی ئێوە لە بیر ناکەم. کێ چوزانێ، ئەمە دنیایە رەنگە رۆژێك بێت کە مشکێکی بچووکی وەکو من بتوانێ خزمەتێك بە جەنابتان بکات.

شێر/ "پێدەکەنێ" ئەوە چ دەڵێی مشکی چکۆلە، تۆ ئێستا های لە ناو چنگی منداو دەتوانم بتکەم بەیەك پاروو. هەر چەندە ئەوەندە بچووکی کە هیچ دادێکی من نادەیت.

مشك/ دروستە، فەرمایشتی جەنابتە.

شێر/ "پێدەکەنێ" بەڵام شتێکی خۆشت گوت. تۆ دەتوانی چ یارمەتی و خزمەتێکی من بکەی مشکی چکۆڵە، ئاخر من پاشای دارستانم. بەهێزو بە چنگم، مشکێکی بێدەسەلاتی وەکو تۆ لە حیساباتی مندا جێت نییە.

مشك/ راست دەفەرمووی جەنابی شێر بمبورە.

شێر/ بەڵام وێڕای ئەو بێ ئەدەبییەی دەرهەق بەمن کردت، دڵم بە حاڵت دەسووتێ.

مشك/ بەڵێ جەنابی شێر

شێر/ چونکە مشکێکی بە ئەدەبی، ئەمجارە دەتبوورم و لە گوناحت خۆش دەبم.

مشك/ زۆر مەمنون جەنابی شێر. ئەمە لە گەورەیی خۆتانە.

شێر/ دەبڕۆ دەی، جارێکی دی لەم ناوە نەت بینم. نە خەڵەتابی کەسێك ئەزیەت بدەی ها.

مشك/ وەبان چاو جەنابی شێر. بێگومان. "شێرەکە، مشکەکە بەرەڵڵا دەکات، مشکەکە کەمێك دێتە پاشێ و سوپاسی دەکات" مەمنونم جەنابی شێر، هەرگیز ئەم لوتفەی ئێوە لەبیر ناکەم "وەدەر دەکەوێ".

شێر/ "باوێشکێك دەدات، تۆزێك دەجوڵێ و دووبارە دەیەوێ بخەوێتەوە". "گوتیارەکە، وەژوور دەکەوێ. روناکی لەسەر شێرەکە نامێنێ".

گوتیار/ بەڵێ منداڵینە، ماوەیەك بەسەر ئەم واریقاتەدا بوری، شێرو مشك هەریەکەیان سەرگەرمی خۆیان بوون، بەڵام بە رێکەوتی رۆژگار دوو نێچیرڤان رێیان کەوتە ئەو دارستانە، و هەرزوو پەیان بەوە برد کە شوێنێکی چاکیان بۆ راووشکار دۆزیوەتەوە. ((گوتیار, وەدەردەکەیێ)).

((دوو نێچیرڤان بەتفەنگ و تۆڕەوەو بەدەم گفتوگۆوە وەژوور دەکەون, دەوەستن و تەمەشای دەوروبەران دەکەن.))

نێچیرڤانی یەکەم/ دارستانێکی پڕ بەرەکەتە.

نێچیرڤانی دووەم/ بەڵێ تا حەز بکەی ((تفەنگەکەی لەعاردی دادەنێ)) دانیشەبا هەناسەیە تازە بکەینەوە.

نێچیرڤانی 1/ باشە "ئەویش تفاقەکەی لە عاردی دادەنێ" چە دارستانێکی خۆشە.

نێچیرڤانی 2/ بەڵێ وایە. دەڵێی تا ئێستا نەهاتویە ئێرە؟

نێچیرڤانی 1/ بیرم نایە هاتبم، "دەروانێتە دەوروبەری"

نێچیرڤانی 2/ لێرە هەموو جۆرە نێچیرێك پەیدا دەبێ، چ بۆ خواردن و چ بۆ فروشتن بە باقی گیانداران.

نێچیرڤانی 1/ بەڕاستتە؟ ئادەی بۆم باس بکە.

نێچیرڤانی 2/ بیستوتە؟ گوایە لەم رۆژانەدا لێرە "کەرە کێوییە"یێکیان راو کردووە کە دەڵێن زۆر دەگمەنە.

نێچیرڤانی 1/ بە راستتە؟.

نێچیرڤانی 2/ بەڵێ، وەکو دەڵێن کابرای نێچیرڤان بە پارەیەکی باش فرۆشتویەتی.

نێچیرڤانی 1 / ئەوەیە شانس. .

نێچیرڤانی 2/ خۆ لەم دەوروبەرانە شێرو پڵنگ و سمۆرەشیان دیتوە. .

نێچیرڤانی 1/ لەوەی باشتر دەبێ، خوا لە زارت بنۆڕێ. "هانام وە دەمت"..

نێچیرڤانی 2/ ئەگەر شانسمان بیکات، نانمان دەکەوێتە رۆنەوە. .

نێچیرڤانی 1/ دەڵێم چۆنە هێواش هێواش دەست بەکار بین.
نێچیرڤانی 2/ باشە.
نێچیرڤانی 1/ "دەڕوانێتە دەوروبەر" بەڕای من ئەوێندەر بۆ تۆر نانەوە جێیەکی باشە. تۆ چ دەڵێی؟.
نێچیرڤانی 2/ بەڵێ، شوێنێکی باشە.
نێچیرڤانی 1/ کەواتە وەرە یارمەتیم بدە، با تۆڕەکە بکەینەوە، "هەردووکیان دەچن تۆڕەکە هەڵدەخەن".
نێچیرڤانی 2/ لەو گەڵاو گوڵانەی بەسەردا بکە تا نەبینرێ.
نێچیرڤانی 1/ دەزانم.
نێچیرڤانی 2/ با چەشەکانیش لەسەر ڕێیەکە دا بنەین "دەڕواتو دەست بە چەشە دانان دەکات" با بزانین چی بەگیر دێنین؟.
نێچیرڤانی 1/ ئەمە دوا تۆڕمان بوو کە لەم دارستانەمان دانا، وایە؟.
نێچیرڤانی 2/ بەڵێ وایە، چەشەکانیش تەواو بوو.
نێچیرڤانی 1/ چاکە، با ئێستا لێرە دوور بکەوینەوە. .
نێچیرڤانی 2/ باشە با بڕۆین. شتەکانت لە بیر نەچێت.
نێچیرڤانی 1/ نە ء "شتەکانی هەڵدەگرێ" با لێرەوە بڕۆێنو سەرێکی تەڵەکانی دوێنێمان بدەین.
نێچیرڤانی 2/ دەی با بڕۆین "وەدەر دەکەون. مۆسیقا"..
"گوتیارەکە وە ژوور دەکەوێ"
گوتیار/ بەڵێ منداڵینە، وەکو بینیتان نێچیرڤانەکان تۆڕەکانیان نایەوەو ڕۆییشتن. بەڵام هێشتا زۆر بەسەر ڕۆییشتنی واندا نەبوری بوو کە جەنابی شێر لە خەو رابوو، هەستی کرد سکی کەوتۆتە قوڕە قوڕو برسییەتی. بۆیە هەستاو کەوتە گەڕان تا پاروە خواردنێك بە چنگ بێنێ.
"گوتیار، وەدەردەکەوێ". "شێرەکە وەژوور دەکەوێ".
شێر/ من شێرێکی پڕ زۆرم، پیاوێکی مەغرورم، لە بێشەڵانان بۆ خواردن دەگەڕێم، "دەوەستێ" بۆنی گۆشتی تازە دێت. دەڵێی لەم ناوەیە؟ بەڵێ، دروستە.... "شێرەکە هەر کە هەنگاوێکی دیکە دەنێ، دەکەوێتە ناو تۆڕەکەوە، تۆڕەکە دێتەوە یەكو شێرەکە گیرۆدە دەبێ، دەنگی لێدان دێت، شێرەکە هەرچی دەکاتو دەکۆشێت، ناتوانێ خۆی دەرباز بکات. شێرەکە شەکەتو داماو رەق دەوەستێ".
گوتیار/ "وەژوور دەکەوێ" بەڵێ منداڵینە، شێرەکە خراپ تووش بوو بوو، هەرچی هەوڵیدا تا خۆی ڕزگار بکات، لێ بێفایدە بوو. بەندەکانی تۆڕەکە زیاترو زیاتر لە دەستو پێی دەئاڵانو پتر تورەیان دەکرد، ئەنجام ماندوو بوو و زانی کە هیچی لە دەست نایەت، ئەو هەموو هێزو توانایە لێرەدا بەکاری نەدەهات. بەڵام گوێ لە مشکی چکۆڵە بگرە، لە کاتێکا کەلە نێو دارستانەکەدا سەرگەرمی گەمەی خۆی بوو، لە پڕ هەستی کرد سەدای نەعرەتەی شێری دێتە گوێ، لە دڵی

خۆیدا گوتی با بڕۆم بزانم، لەوەیە جەنابی شێر شتێکی لێ قەومابێ "گوتیارەکە وەدەردەکەوێ"
"شێرەکە دەکەوێتە بەر روناکی، گیرۆدە بووەو مشکێك بە دەم گۆرانییەوە وەژوور دەکەوێ"
مشك/ پەپولان جوان و قەشەنگن، باڵیان نەخشین و رەنگاو رەنگن،
"چاوی بە شێر دەکەوێ" جەنابی شێر ناکا بەم جۆرە گیرۆدە بووبی! چی بووە، چیتان لێ قەوماوە، بۆچی دەنێو ئەم تۆڕەی لوول بوویت؟
شێر/ ئەمە تۆی مشکی چکۆلە؟ مەگەر نابینی کەوتوومە تۆڕەوەو گیرۆدە بووم بەم چەشانە خەڵەتام. کاتێکم بە خۆ زانی کە کەوتمە تۆڕەکەوەو ئێستاش نازانم چم بەسەر دێ.
مشك/ بەڵێ، خراپ تووش بوویت، با بزانم چ کارێك دەکرێ "سەیری دەکات".
شێر/ هەر چەند پتر هەوڵ بدەم، ئەم تۆڕە لەعنەتییە زیاتر لە دەست و پێم دەئاڵێ.
مشك/ کەواتە هیچ هەوڵێك مەدە، ئێستا کارێکت بۆ دەکەم.
شێر/ مشکی چکۆڵە تۆ دەتوانی چ کارێك بۆ من بکەی. لاکەوە لێرەو سەر مەخە سەرم، زۆر پەرێشانم.
مشك/ قوربان جەنابی شێر، بێگومان لە یادتان ماوە کە چاکەیەکی گەورەتان دەرهەق بە من کرد، هەقتان لەسەرمە. من ئەو چاکەیە هەرگیز لە بیر ناکەم.
شێر/ نازانم مەبەستت چییە؟
مشك/ دەمەوێ بڵێم ئێوە لە کاتێکا دەتانتوانی من بکەن بە پارویەکی خۆتان، کەچی لێم بوردی و ئازادت کردم.
شێر/ ئا... بیرم کەوتەوە.
مشك/ دەی سا دەمەوێ ئەو چاکەیەتان بدەمەوە.
شێر/ "پۆز خەنێکی کرد" چۆن دەیدەیەوە"
مشك/ ئێستا بە چاوی خۆت دەیبینی، تۆ مەجوڵێ، هەر ئێستا.
"مشکەکە کەوتە قرتاندی بەندەکان، دەنگی مۆسیقا، ئەوان لە جێی خۆ دەوەستن. گوتیار وەژوور دەکەوێ."
گوتیار/ بەڵێ منداڵینە. مشکی چکۆڵە بە ددانە تیژەکانی کەوتە قرتاندنی داوەکان، دوای چەند دەقیقەیەك داوەکانی یەك یەك قرتاند و جەنابی شێر بە تەکانێك لە نێو تۆڕەکە وەدەرکەوت.
"گوتیار، وەدەردەکەوێ"
مشك/ هەنووکە هەستەو وەرە دەرێ. "مشکەکە دەچێ لە دواترەوە دەوەستێ. شێرەکە بە کاوەخۆ هەڵدەستێ و لە تۆڕەکە دێتە دەرێ"
شێر/ ئۆخەی ئیسراحەتم کرد. مشکی چکۆڵە بەڕاستی نازانم چۆن سوپاست بکەم. تۆ گیانی منت رزگار کرد.
مشك/ سەروەری قوربان، کارێکی گەورەم نەکردووە، بەڵام تەنیا ئەمەت لە بیر بێ کە من ئەگەرچی بە کەلەش بچوکم، بەڵام ددانەکانم زۆر تیژو بڕندەن.
شێر/ مەمنونم مشکی چکۆڵە، مەمنونم.

مشك/ ئۆ خەریك بوو لە یادمان بچێت، وا چاكە زووتر لێرە بڕۆین چونكە نێچیرڤانەكان هەر ساتێ پەیدا بېن و بگەنە سەرمان.

"شێرو مشكەكە بە دەم گۆرانییەوە وەدەردەكەون".

# دۆستایەتی

"بەشێك لە لێرەوارێك, چەند بنچكێك، دار گوێزێکی بتەوی زەلام و گوڵو گیاکە نیشانەی چڕی دارستانەکەیە. دەنگی باڵندان دێت. وەرز، وەرزی بەهارە, گوتیار، وەڕوور دەکەویٚ".

گوتیار/ منداڵینە سلاو. حاڵتان چۆنە، بەخێرهاتن بۆ ئەم شانۆیەی ئێمە، ئەم سەربورەی کە بۆ ئەنگۆی دەگێڕمەوە، یەکێکە لەو هەزاران سەربورەی کە لەم لێرو دارستانەدا رووی داوە. لەم دارستانە سەوزو دوورە دەستەدا، کە هەموو جۆرە گیانلەبەرێکی تێدا پەیدا دەبێت. لە پڵنگو چەقەڵەوە بیگرە تا دەکاتە پەپولەو سۆنەو مراوی. هەروەها هەموو جۆرە گیایەکی تێدا پەیدا دەبیٚ، لەوانە دار گوێزێکی زەلامی گەورەی بە تەمەن کە هەموو ساڵێك دنیایە بەری دەدا. رۆژێك قەلەڕەشێکی کە لەم نزیکانە هێلانەی هەبوو، هاتو لە بنی دار گوێزەکەدا نیشتەوە، دیقەتیدا کە گوێزە گەییوەکان رژاونەتە بنی درەختەکە. "گوتیارەکە، وەدەردەکەویٚ. قەلەکە وەڕوور دەکەویٚو گوێزەکان سەرنجی رادەکێشن".

قەل/ بڕوانە ئەم گوێزە نایابانە، تازەو گەییو! وا چاکە هەندێکی لە بن عاردی بنەمو بۆ زستان کە رێگەوبانان دەگیریٚو گوێزو ئازوقە کەم دەبن، هەڵی بگرم... و هەنگینیٚ دەریان بێنمەوەو بۆ خۆ بیخۆم. بنی ئەم بنچکە باشە، دار گوێزەکەش نیشانەیەکی چاکەو لێم گوم نابیٚ "دەکەوێتە چاڵ هەڵکەندن، مشکێك وەڕوور دەکەویٚ، قەلەڕەشەکە هەستی پێدەکات. مشکەکە دەیەویٚ هەڵیٚ".

قەلەڕەش/ سلاو جەنابی مشك, وا بزانم لەم دەوروبەرە ژننەگی دەکەیت، وایە.

مشك/ وایە.

قەلەڕەش/ ئەوەش دەزانم کە تۆ لە من دەترسیت. "هەڵوەستەیەك" بەلام چت خەم نەبیٚ، من نانی خۆم خواردووەو پێویستم بە خواردنی مشکێکی وەکو تۆ نییە، کەواتە هەقە لە من نەترسیت.

مشك/ چ دەکەی لەم ناوە؟

قەلەڕەش/ چەند دانە گوێزم بۆ زستان شاردەوە. دەبیٚ کار قایم بین.

مشك/ بەڕاستی ئاقڵو دوور بینی. دەزانی ئێوەی قەلەڕەشیش لەم رووەوە لە ئێمەی مشك دەچن. ئێمەش شت لە ژێر عاردی دەشارینەوە تا لە زستاندا پەکمان نەکەویٚو بیٚ خواردن نەمێنینەوە.

قەلەڕەش/ باشە بۆ نایەیتە پێشترەوە تا زیاتر یەکدی بناسین.

مشك/ ئاخر تۆ قەلەڕەشیتو قەلانیش لە کۆنەوە دژمنی جماعەتی مشکان بوون.

قەلەڕەش/ بەلام دەکریٚ ئەم دژمنایەتییە بکەین بە دۆستایەتی، وانییە؟

مشك/ "بە تێفکرینەوە دەڕوانێتە قەلەکە، ئەوجا بە پێکەنینەوە" هەڵبەتە دۆستایەتی لە دژمنایەتی چاترە. بەلام پێم ناڵێی چۆن متمانە بە دۆستایەتی تۆ بکەم؟

قەلەڕەش/ گوێ بگرە مشکی ئازیز، حەز دەکەم لەگەڵ یەکدیدا ڕاستگۆبین، چۆنە؟

مشك/ باشە.

قەلەڕەش/ من ئەگەر تەماح لە خواردنی تۆ بکەم، لە چنگێ پێستو ئێسك زیاترم پێ نابڕێ.

مشك/ مەبەستت. مەبەستت بڵێ.

قەلەڕەش/ مەبەستم ئەمەیە کە لەو ڕووەوە بێ خەمو خاترجەم بە.

مشك/ زۆر چاکە من متمانە بە تۆ دەکەم "دەست دەدەنە دەستی یەکدی" بەڵام پێم بڵێ بزانم ئێمە چۆن دەتوانین کۆمەکی یەکدی بکەین؟

قەلەڕەش/ کەواتە گوێ بگرە بزانە چ دەڵێم، من دەتوانم بفڕمو دەنوکێکی چاکیشم هەیە. تۆش مشکێکی چابوکو چالاکیو ددانی تیژت هەنو ڕێگە باریكو گەورەکان باش دەناسیت, وا نییەن؟

مشك/ وایە.

قەلەڕەش/ بۆ نموونە دەتوانین هەر لێرەوە دەست پێ بکەین. من دەچمە سەر ئەم دارەو، بە دەنووك گوێزە گەییوەکان دەخەمە خوارەوە. تۆش زەوییەکە هەڵدڕە تا گوێزەکان بۆ زستانمان بشارینەوە.

مشك/ تەگبیرێکی چاکە. کەواتە دەست پێ بکە. من ئامادەم.

گوتیار/ بەڵێ منداڵینە، قەلەڕەشو مشك دەمێك بوو گەیی بوونە ئەم ئەنجامەی کە بە هاریکاری یەکدی دەتوانن ئاسانتر گیروگرفتان چارەسەر بکەن، هەر واش-ی لێهات. زۆر بە زوویی بوون بە دۆستی یەکدیو زۆر شتان لە یەکدییەوە فێر بوون. تا ڕۆژێکیان "ڕوناکی لەسەر گوتیار لا دەبرێ".

"قەلەڕەشو مشك بە دوو قۆڵی لە دارستانەکەدا پیاسەی دەکەن".

مشك/ دەزانی دۆستی ئازیز، ئێروکانە ماڵی یەکێك لە هاوڕێ هەرە باشەکانی من بوو. ماوەیەکە لێرە ڕۆییوە، زۆری بیر دەکەم، بەڵام چ بکەم کە ڕێگا دوورەو تەنیایی-ش گەلەك ئەستەمو زەحمەتە، ماوەیەکی دیکە دنیاش سارد دەبێو ئیدی زەحمەت تر دەبێ، ئەو دۆستەی من کیسەڵێکی میهرەبانو زەحمەتکێشە. زۆری یارمەتی مندا.

قەلەڕەش/ تۆش مشکێکی وەفاداری. ئەگەر بە ڕاستتەو بیری دەکەیت من ئامادەم تۆ ببەم بۆ لای دۆستەکەت.

مشك/ بەڕاستی ئەم کارە دەکەیت، نازانم چۆن سوپاسی مەحەبەتی تۆ بکەم.

قەلەڕەش/ شایەنی نییە، ئەمە ئەركو واجبی دۆستایەتی منە.

مشك/ بەڵام تۆ بڵێ بزانم چۆن ئەم کارە دەکەی؟

قەلەڕەش/ کارێکی قورسو زەحمەت نییە. دەتخەمە سەرپشتی خۆمو بە ئاسماندا هەڵدەفڕم.

مشك/ چەند خۆشە، دیارە لەو ئاسمانەوە زۆر شتی جوان دەبینرێ. وانییە.

قەلەڕەش/ راستە، زۆر شتی جوان دەبینریٚ، رووبار وەکو باریکە هێڵێك دێتە بەرچاوان. بنیادەمان وەکو خاڵێکی بچووك بچووك دەبینرێن، دارستان وەکو پارچە مەخمەلێکی سەوز دێتە بەرچاو، تەنانەت دەکریٚ بچینە سەرووی هەوران.

مشك/ یەکێك لە حەزەکانی من فڕین بووە، هەندیٚ جار لە خەونمدا لە ئاسمان بوومو وێڵی دووی هەستارە یان هەور بووم. نوکە پێدەچێت ئەم حەزەم بێتە دی.

قەلەڕەش: بەڵێ. کەواتە کارەکانت بکە، سباهی سپێدە زوو دەکەوینەڕیٚ. چۆنە.

مشك/ زۆر چاکە. "روناکی لەسەر ئەو دووە لا دەچێت. دەنگی مۆسیقا. گوتیار وەژوور دەکەویٚ".

گوتیار/ بەلیٚ منداڵینە، ئەو شەو مشك بە شادی دیداری دۆستەکەیو بەتاسەی سەفەرێکی خۆشەوە خەوت، سباهی زوو لەگەڵ گزنگی هەتاودا رۆیی و قەلەڕەشەکەی گاز کردو کەوتنەڕیٚ. دیمەنێکی جوان بوو، بە تایبەتی بۆ مشکەکە، زۆر شتی بینی و زەوق و لەزەتێکی زۆری بینی، قەلەڕەشەکەش، بە هەمان سەنتدا رۆیی کە مشکەکە پێی دەگوت. نزیکەی نیوەڕوانیٚ بوو کە گەیینە ئەو دەڤەرەی کە ماڵی کیسەڵەکەی لیٚ بوو. "گوتیار وەدەر دەکەویٚ. مشکەکە و قەلەڕەشەکە لەسەر شانۆن".

مشك/ زۆرت لیٚ مەمنونم, دەزانم کە ماندوو بوویت، بەلاٚم ئیدی گەییشتین، ئەها، ئەمە نیشانەکەیەتی.

قەلەڕەش/ چ شوێنێکی باشە.

مشك/ قەلەڕەشی ئازیز تۆ کەمێك ئیسراحەت بکە،من دەگەڕێم تا کیسەڵەکە بدۆزمەوە، نابیٚ زۆر دوور کەوتبێتەوە.

قەلەڕەش/ چاکە، من لێرە چاوەنۆڕ دەکەم.

مشك/ کیسەڵی میهرەبان، ئەهای کیسەڵی میهرەبان، لە کوێی. "هەڵوەستەیەك" "بەم لادا دەڕوات" من مشکم مشك، دۆستی دێرینت "کیسەڵ لە پشت بنچکێکەوە دێتە دەریٚو مشکەکە دەبینیٚو بە روویدا پێدەکەنیٚ، بەلاٚم لە پڕ چاوی بە قەلەڕەش دەکەویٚو پاشەوپاش دەگەڕێتەوەو سەری دەباتە نێو قاوغەکەی خۆی".

مشك/ "هەستی پێدەکات" دۆستی ئازیز، خەمت نابیٚو مەترسە، ئەم قەلەڕەشە دۆستی منەو ئەز بە کۆمەکی وی ئەم رێگا دوورەم بڕیوەو هاتووم بۆ لای تۆ، خەیاڵت ئاسوودەو رەحەت بیٚ.

کیسەڵ/ "سەری دەردێنیٚو دەڕوات" زۆر بەخێرهاتن، زۆر بە دیدارتان خۆشحاڵم.

مشك/ ئەم قەلەڕەشە دۆستی منە، حەز دەکەم یەکدی بناسن.

قەلەڕەش/ سلاٚو. شوێنێکی خۆشت هەیە. جەنابی مشك زۆری ستایش کردویت.

کیسەڵ/ زۆر بەخێرهاتن، بەڕاستی کارێکی چاکتان کردووە. مشکی ئازیز زۆر مەمنونم کە منتان لە یادو بیر بووە.

مشك/ ببورە, بیرم کردیت دۆستی ئازیز.

قەلەڕەش/ منیش کە ئێوە، هەردووکتانم ناسی، زۆر خۆشحاڵم.

کیسەڵ/ زۆر مەمنون قەلەڕەشی ئازیز، من دەزانم لە ڕێیەکی دوورەوە هاتوون. بێگومان دەبێ زۆر ماندوو بووبن.

قەلەڕەش/ لە یەك ڕوبارو لەیەك دەشت پتر نەبوو. ئێمەی باڵداران عادەتمانە.

مشك/ بەڵام تۆ منیشت بە کۆڵەوە بوو.

کیسەڵ/ ڕاستە، ئێستا شتێکتان بۆ دێنم بیخۆن، تا ماندووییتان بحەسێتەوە. "برێك خواردەمەنی دێنێ".

مشك/ کیسەڵی میهرەبان، پێدەچێت ئێرە شوێنێکی پڕ پیت و بەرەکەت بێ.

کیسەڵ/ بەڵێ، لە خوا بەزیاد بێ.

قەلەڕەش/ وا دیارە دۆست و ئاشنای باشت لێرە هەن.

کیسەڵ/ لە رووی خۆتان نەبێ، دۆست و دراوسێی چاکم هەن.

"دەنگێك دەبیسترێ". فریاکەون خۆتان بشارنەوە.

"ئاسکێك، شپرزەو بە هانکەهانك وەژووردەکەوێ، نیگەران و سەرگەردان بە دووی پەنایەکدا دەگەڕێ".

کیسەل/ ئەهای ئاسکی خاڵ خاڵ، زووکە هەرە پشت ئەو درەختە خۆت وەشێرە. "ئاسکەکە دەڕوات و خۆی دەشارێتەوە". "هەڵوەستەیەك". چ شتێك ڕوونادات. کیسەڵەکە بە ئەسپایی دێتە دەرێ و دەڕوانێتە دەوروبەر".

کیسەڵ/ دۆستان وەرنە دەرێ "مشك و قەلەڕەش و ئاسك دێنە دەرێ" ئەم بەشەی دارستانەکە تەواو ئەمینە. تائێستا ڕاوچییەك پێی تێ نەناوە.

قەلەڕەش/ بەڵام هەرچییەك بڵێی لە ئادەمیزاد دەوەشێتەوە. شتی وای دروست کردووەو کاری وا دەکات کە ئێمە ئەقڵمان پێیدا ناشکێ.

مشك/ ڕاستە. من جارێکیان لە ئاغافڵان لە بن عاردیدا تووشیان بووم. لە قسەکانیانداوا دەردەکەوت کە کانیان کەشف کردووە.

قەلەڕەش/ من لە ئاسماندا باڵندەی کانزایی زۆر گەورە دەبینم کە زۆر بە خێرایی دەفڕن. ئادەمیزادیش لێیان دەخوڕێ.

ئاسك/ ڕاست دەکەن، دەبێ زۆر ئاگامان لە خۆ بێ، خۆ داوو تەڵەی وایان داهێناوە زۆر بە زەحمەت هەستی پێدەکرێ.

کیسەڵ/ خۆ هیچ-ت لێنە هاتووە؟

قەلەڕەش/ سەلامەتی؟

ئاسك/ بەڵێ سەلامەتم، بەڵام زۆرم غاردا، ماندوو بووم.

مشك/ ماندوویەتیت دەردەچێ، بەس نییە شوکر سەلامەتی.

کیسەل/ دەی سا بۆمان بگێڕەوە بزانم چی بوو.

ئاسك/ لە کەناری رووبارەکە بووم دەمویست ئاو بخۆمەوە کە لە پڕ سەیرم کرد تەنافێك لە تەنیشت لاقی راستمەوە لەسەر عاردەکەیە کە ئاوڕم دایەوە. راوچییەکەم بینی کە خەریك بوو بۆ لای من دەهات. منیش هەر هێندەم پیٚ کرا، تا هێز لە لاقمدا بوو پێم وەغارێوە نا.

کیسەل:/ "قاپە ئاوێکی لە بەردەم دادەنیٚ" وەرە بخۆوە ماندوویيت دەر دەکات.

قەلەڕەش/ تۆزێکی بەسەردا بڕوات، ئیدی لە دۆزینەوەت نا ئومێد دەبن و دەڕۆن.

مشك/ راست دەکات، ئیدی پێی ناویٚ بترسیت.

کیسەڵ/ هەر بە یەکجاری لێرە وەمێنەو لەگەڵ ئێمەدا بژی.

ئاسك/ زۆرتان لیٚ مەمنوم. ئاخر

کیسەڵ/ ئاخرو ماخری ناویٚ. شوێنێکی گەورەو باشە. "گیانلەبەرەکان لە شوێنی خۆ دەوەستن، روناکییان لەسەر لا دەچێت. دەنگی مۆسیقا. گوتیار وەژوور دەکەویٚ".

گوتیار/ بەڵیٚ مندالینە، ئاسکەکە قەبوڵی کرد کە لەگەڵ ئەو گیانلەبەرانەدا لەویٚ بژی، رۆژگارو شەوگاران تیٚ دەپەڕیٚو بەرە بەرە دۆستایەتییەکی تەواویان لە بەیندا پەیدا بوو. بەڵام چونکە رووداوو کارەسات-ش لە کەمیندایە، نیوەڕوانێك کە قەلەڕەش و مشك و کیسەڵ چاوەرنۆڕ بوون تا ئاسکەکە بگەڕێتەوەو پێکەوە نان بخۆن، ئاسکەکە نەهاتەوە. پاش ماوەیەك چاوەڕانی بڕیاریاندا کە قەلەڕەش بڕوات و بەڵکو سۆراخێکی ئاسکەکە بکات و هەواڵێکی بێنێتەوە ((گوتیار وە دەردەکەویٚ, شانۆکە تاریك دەبێت )). ((کە شانۆکە رووناك دەبێتەوە. مشك و کیسەڵ لەسەر شانۆنە)).

کیسەڵ/ بۆ هیچت نەخوارد مشکی ئازیز؟ برسیت نییە؟

مشك/ دڵم نایبا دۆستی ئازیز ((هەڵوەستە)) باوەڕ بکە ئاگام لە خۆم نییە. قەلەڕەش هەر نەهاتەوە, سەعاتیٚ پترە کە رۆییشتوە.

کیسەڵ/ ئێستا دەگەڕێتەوە.

مشك/ ئەویش شتێکی لیٚ نەقەومابیٚ؟

کیسەڵ/ بیری خراپ مەکەوە "هەڵوەستە) گوێت لە دەنگیٚ نەبوو؟

مشك/ با، وەك بڵێی لەم لایەوە بوو. "دەڕۆن بەرەو ئەولایە. قەلەڕەشەکە لەوێندەرەوە بە دیار دەکەویٚ"

کیسەڵ/ چەند دوا کەوتی؟

مشك/ ئەوە چییە، دەڵێی بریندار بوویت؟

قەلەڕەش/ چ نییە، چاك دەبێتەوە. دەبیٚ بیریٚ لە ئاسك بکەینەوە.

مشك/ چی؟ هیچی لیٚ قەوماوە؟

کیسەڵ/ بۆمانی باس بکە بزانین چت دی؟

قەلەڕەش/ باشە, هەر ئێستا بۆتانی دەگێڕمەوە. کاتیٚ گەییمە ئەوسەری دارستانەکە سەیرم کرد ئاسکی خاڵ خاڵ لە پشت دەوەنێکەوە لە هەوڵ و تەقەلادایە، کە چوومە خوارترەوە سەیرم کرد لاقێکی بە تەڵەوە بووە، هەروەها کە ویستم نزیکتر ببمەوەو یارمەتییەکی بدەم، لە پڕ یەکێك لە

راوچییەکان فیشەکێکی پێوە ناو و بەر سوچێکی ئەم باڵەم کەوت. ئیدی نەوەستام و بە هەر حاڵێ بوو خۆم گەیاندەوە ئێرە. "کیسەڵ دەڕوات شتێ دێنێ و لە زامی قەلەڕەشەکەی دەنێ".

مشك/ ئێمە زۆر خەممان بوو

کیسەڵ/ شوکر زامەکەت قوڵ نییە.

مشك/ دەتوانی بفڕی؟

قەلەڕەش/ پێم وایە بتوانم، "باڵەکانی تەکان دەدات" بەڵێ دەتوانم.

مشك/ کەواتە وا چاکە زووتر بکەوینە ڕێ و فریای ئاسکی خاڵ خاڵ بکەوین و ڕزگاری بکەین.

کیسەڵ/ بەڵێ با بڕۆین. قەلەڕەش تۆ پێشمان بکەوەو ڕێمان پێ نیشان بدە.

مشك/ ئەمن پێشنیازێکم هەیە.

قەلەڕەش/ چییە؟

مشك/ دەڵێم چۆنە کیسەڵ لێرە بمێنێ تا ئێمە دەگەڕێینەوە.

کیسەڵ/ چی، من بمێنمەوە؟

مشك/ ئاخر وا دیارە ڕاوچییەکان لەو دەوروبەرە بن "هەڵوەستە" ئەگەر لە ناغافلا بێن بەسەرا، ئێمە دەتوانین بەپەلە خۆمان بشارینەوە، بەڵام ئەم کارە بۆ کیسەڵ زەحمەتە.

قەلەڕەش/ ڕاست دەکەی، باشە بە خۆت چ دەڵێی؟

کیسەڵ/ قسەکەتان دروستە. بەڵام منیش بە تەنێ بێ تاقەت دەبم، حەز دەکەم لەگەڵ ئێوەدا بێم. بەڵکو بتوانم یارمەتییەکتان بدەم.

مشك/ مادامێکی وایە بڕۆ با بڕۆین "شانۆ تاریك دەبێ، دەنگی مۆسیقا" "گوتیار، وەژوور دەکەوێ".

گوتیار/ بەڵێ منداڵینە، قەلەڕەش و مشك و کیسەڵ خێرا خۆیان گەیاندە ئاسکی خاڵ خاڵ، ئاسکەکە کە زۆر ترسا بوو، بە دیتنی دۆستەکانی خۆشحاڵ بوو، و ورەی بەرز بووەوە، بەڵام بەر لە هەر شتێك بە دۆستەکانی گوت کە ڕاوچییەکان لەو نزیکانەن و دەبێ زۆر وریا بن، "گوتیار، وەدەر دەکەوێ –شانۆ ڕووناك دەبێتەوە. مشکەکە بە دیار دەکەوێ کە خەریکی قرتاندنی داوی تۆڕەکەیە، قەلەڕەش و کیسەڵەکە ل دوو لاوە ئێشك دەگرن".

قەلەڕەش/ خێراکەن، وا یەکێك بەرەو ئێرە دێت "لاقی ئاسکەکە بەرەڵڵا دەبێت".

مشك/ تەواو بوو. چ داوێکی قایم بوو!

کیسەڵ/ باشە با بڕۆین.

"ئاسك، مشك، قەلەڕەش و پاشان کیسەڵەکە وەدەردەکەون. دەنگی مۆسیقا، ڕاوچییەك وەژوور دەکەوێ و بەرەو لای داوەکە "تۆڕ" دەچێت. زۆری پێ سەیر دەبێ، بە تورەیی کڵاوەکەی بەعاریدا دەدات".

# سیٚ ماسی

دیمەن: بنکی گۆلاوێك، چەند داوە قەوزەیەك تاوێرێکی گەورە بە دەستەچەیدا. پارچەیەك لە رەگی درەختێکی گەورە، گڵو قوڕاوی بنی گۆلاوەکە. دەنگی مۆسیقای دیٚ. شانۆکە بەرە بەرە روناك دەبێتەوە.

بەیانییە، سیٚ ماسی لە گۆلاوەکەدا دەبینرێن. یەکێکیان سپیو ئەویتریان خاڵدارەو سێیەمیان کەوەییە. گوتیار، لەلای راستەوە وەژوور دەکەویٚ، جلو بەرگەکەی وەکو هی حیکایەتخوانانی کۆنە، رووخۆشو دەم گەرمە.

گوتیار/ منداڵینە سلاٚو. زۆر بەخێرهاتن, یەکیٚ بوو یەکیٚ نەبوو. دەگێرنەوە دەڵێن لە گۆلاوێکی ئەمنو ئارامدا سیٚ ماسی دەژیان. یەکێکیان سپی بوو، ئەویتریان خاڵدارو سێیەمیان کەوەیی بوو. رەنگە کەس بە تەواوی نەزانیٚ کە ئەو ماسییانە چۆنو چەند وەخت بوو کە لەو گۆلاوەدا پێکەوە دەژیان، رۆژانو شەوانیان بەبیٚ سەریەشەو بە ئاسایی لیٚ دەرۆیی. ئەوانیش بۆ خۆیان هۆگری یەکدی بوو بوون ئەگەرچی هەر یەکێك لەو سیٚ ماسییە تایبەتمەندی خۆیان هەبوو، و لێکدی جودا دەکردنەوە، بۆ وێنە ماسییە سپییەکە، ماسیەکی بە هۆشو گۆش زیرەك بوو و لە نێو ئەم گولاوە بچووکەدا زۆر شت فێر بوو بوو و هەوڵی دەدا وەختی خۆی بە فیرۆ نەدات. ماسییە خاڵدارەکە کەمیٚ لاسار بوو، بەلاٚم ئەگەر کار بهاتبایە سەر راستیو دڵی بەکارێکەوەبا ئەقڵو هۆشێکی باشی هەبوو. بەلاٚم ماسییە کەوەکە زۆر تەمەڵو تەوەزەل بوو. لاسارو کەمتەرخەم بوو. دۆستەکانی هەر چەندە ئامۆژگاریان دەکرد، لەم گوێیەوە دەهاتو لەو گوێیەوە دەردەچوو. بەمجۆرە رۆژان دەهاتنو دەچوون تاوەکو "گوتیار وە دەردەکەویٚ" "ماسییە سپی خەریکی گواستنەوەی سەدەفێکە، ماسییە خاڵدارەکە لێی دەچێتە پێشیٚ".

ماسییە خاڵدار/ بەیانیت باش، ئەوە چت دۆزیتەوە؟

ماسییە سپی/ بەیانیت باش، ببینە چم دۆزیوەتەوە. پاشماوەی سەدەفە، زۆر قایمە.

ماسییە خاڵدار/ چۆن گەییوەتە ئێرە؟

ماسییە سپی/ پێدەچێت سێلاٚوەکەی چەند رۆژی رابردوو لەگەڵ خۆی هێنابی.

ماسییە خاڵدار/ دیسان هەورە. دوور نییە باران بباریٚو لافاو هەستیٚ هەنگینیٚ منیش دەگەڕێمو یەکێك دەدۆزمەوە.

ماسییە سپی/ بەڵیٚ، دوور نییە، دەبیٚ خۆمان حازر بکەین.

ماسییە خاڵدار/ هیچ حەزم لە باران نییە. چونکە قوڕاو ئاوماڵکەو زڕو زبلاٚن هەموو دێنە خواریٚو دەرژێنە گۆلەکەوە.

ماسییە سپی/ بەڵام ئەگەر باران نەبارێ، چ گۆلاوێك نامێنێ. چونكە ئاوەكان بەرە بەرە دەبنە هەڵم و منو تۆش وێڵو سەرگەردان ماتەڵ دەبین. دەزانی ئەو سەدەفانە بە پرژە ئاوی ناو خۆیان مرواری گران بەها پەروەردە دەكەن كە هەم جوانن و هەم پڕ بەها.

ماسییە خاڵدار/ تۆ ئەمانە لە كوێ دەزانی.

ماسییە سپی/ جارێك ماسییەكی دەریایی بۆی باسكردم. لەوەیە پێت سەیر بێ كە شتی زۆر دەربارەی ئەم سەدەفە بچووكە فێر ببی؟ ئەوە كەوە ماسی دۆستمان لە كوێیە؟

ماسییە خاڵدار/ هێشتا نەم دیتوە "كەوە ماسی دێتە نزیكەوە".

ماسییە كەوە/ سلاو، بەیانیتان باش.

ماسییەكان/ سلاو، بەیانیت باش.

ماسییەكەوە/ ئێوە بەم بەیانییە زووە سەرقاڵی چین؟

ماسییە سپی/ زۆریش زوو نییە. بڕوانە ئاسمان بزانە خور لە كوێیە؟

ماسییە خاڵدار/ ماسییە سپی، پارچە سەدەفێكی دۆزیتەوە و خەریك بوو بۆی باس دەكردم كە سەدەف چ گیانلەبەرێكی سەیرن. خەریك بوو هەندێ شتی لەمەڕ ژیانی سەدەفان بۆ باسدەكردم.

ماسییە كەوە/ "باوێشك دەدات" خەوێكی باشم لێ كەوتبوو"كێشمانی خۆی دەدات" هیچ شتێك لە خەو باشتر نییە, بۆچی وا لەشم كوتراوە "ئاماژە بۆلای تاوێرەكە دەكات" چ زڕو زبڵێك لەوێندەر نیشتووە.

ماسییە سپی/ ڕاست دەكەی. دەڵێم چۆنە پیاسەیەك بكەین؟

ماسییە كەوە/ باشە بابڕۆین "گوتیار, وەژوور دەكەوێ"

گوتیار/ ماسییەكان پیاسەیەكی نێو گۆلاوەكەیان كردو تۆزێ خواردنیان خوارد. ئەوجا سەرقاڵی گەمان بوون. هێندە سەرگەرم بوون نەیانزانی چەندە ئاگایان لە دەوروبەری خۆیان بڕاوە.

"لە كاتێكدا ماسییەكان خەریكی چاو شاركێو خۆ شاردنەوەن، لەگەڵ مۆسیقادا یەكێكیان چاوی دەگرێو دووەكەی دی خۆ دەشارنەوە".

ماسییەكەوە/ "دەستی خستوونەتە سەرچاوانی" زۆرچاكە، من چاوم گرتووە.

حازرن؟ هاتم.

ماسییە خاڵدار/ نە ء، تۆزێ بوەستە.

ماسییە سپی/ تەمەشا نەكەی ها.

ماسییە كەوە/ "دەكەوێتە گەڕان" ئێستا دەڵێم لە كوێ خۆتان مات داوە.

ماسییە سپی/ "بە ئەسپایی خۆی دەگەیەنێتە نزیكی ڕەگەدارەكە"

هاتم، هاتم

ماسییە كەوە/ ها.. سەرم لێ شێوا.. نەم دی لە كوێوە خۆت گەیاند. باشە خاڵدار- تۆ لە كوێی؟

ماسییە خاڵدار/ بە ئەسپایی نزیك دەبێتەوە" هاتم، هاتم "لە كاتێكدا ماسیەكان سەرقاڵی گەمەی خۆیانن، دور ڕاوچی بە دەم قسانەوە لە ڕەخی گۆلاوەكە نزیك دەبنەوە، ڕاوچییەكان لە كەنارێكی

بـەرزی گۆلاوەکـەدا وەسـتاون. ماسـییە سـپیە پێیـان دەحەسـێت، ئـەوجا هەرسـێکیان رەق رادەوەستن".

راوچی 1/ چۆنە چەند دەققەیەك دانیشین و ماندوویەتیمان بحەسێتەوە؟

راوچی 2/ چاکە، دەمێکە بەرێوەین.

راوچی1/ شوێنێکی خۆشە، بێدەنگ و دوورە دەستە.

راوچی2/ بیرم نایەت رێم کەتبێتە ئێرە.

راوچی1/ بە زۆری بەو بەری کەنارەکەدا دەڕۆییشتین، ئەوڕۆ قەدبڕ لێماندا.

راوچی2/ هەفتەی رابردوو بۆ راو چوو بوومە ئەوبەری روبار چەند نێچیرێکی باشم بەنسیب بوو، بەڵام ئاسکێك بە تەواوی گێژی کردم. هەتا توانیم بە دویـدا غارمدا، ئاقیبـەت خـۆی بە دەستەوە نەداو نەدا. بە تەواوی ماندووی کردم. باوەڕدەکەی ئێستاش هەر چاوم لە دوایەتی؟

راوچـی1/ خـۆت نارەحـەت مەکـە "پێدەکـەنی" سروشـت پـڕە لـە نێچـیر، دەروات، دەگەڕێتـەوە، قەڵەوتر دەبیٚ و ئاقیبەت هەر بەنسیبی خۆت دەبێت "هەردووکیان پێدەکەنن"

راوچی 2/ مەیلت لە سەبیلێك هەیە؟ ماندوویەتی دەردەکات.

راوچی 1/ تێی بکە "دەڕوانێتە دەوروبەر. سەرنجی گۆلەکەو ماسییەکان دەدات"

راوچی 2/ "کیسەو سەبیلەکەی دەردێنیٚ و خەریکی داگیراندنی دەبیٚ"

راوچی 1/ دەڵێم لەگەڵ راوە ماسییدا چۆنی؟ لەمڕۆ بەدواوە وەرز وەرزی ماسی گرتنـە، تۆڕەکەت بخە ئاوەکەوەو پاش تۆزیٚ هەڵی بکێشە, چ دەڵێی؟

راوچی2/ "سەبیلەکە دەدا بە هاوڕێکـەی" پێشـینان گرتویانـە ماسـی هـەر کـاتیٚ لـە ئـاو دەربێنی تازەیە. نە خوازەڵڵا ماسی بە تامی ئەم ناوانەش.

راوچی1/ راوە ماسی لەزەتێکی دیکەی هەیە.

راوچی2/ دەڵێم چۆنە ئەمجارە تۆڕ بێنین و راوە ماسییەکی باش بکەین؟

راوچی 1/ خستمتە سـەر کەڵکەڵـەو ئـارەزووی ماسـی. دەکـەم، "هـەردووکیان پێدەکـەنن" حـەیفیٚ تۆڕو قولاپمان پیٚ نییە، دەنا هەر ئێستا دەست بەکار دەبووین. تـۆ تەماشـایەکی ئـەم گۆڵـە بکـە، لێرەوە پێیا برۆ.

راوچی 2/ دوێـنیٚ ژنەکـەم باسـی کـرد، کـە گوایـە موختـارو زاواکـەی ماسـییەکی دوو مـەترییان گرتووە.

راوچی 1/ کەواتە کەیفیان کۆکە.

راوچی2/ چۆنە هێواش هێواش بکەوینە ریٚ.

راوچی1/ باشە، تا دنیا گەرم تری نەکردووە دەبیٚ خۆمان بگەیەنینە بناری کێوی.

راوچی 2/ بەڵام ئێرە نیشانە بکەو لە بیرت نەچیٚ "هەڵدەستن و کۆڵـەکانیان هەڵـدەگرن و لـە قـەراخ گۆلەکە هەڵوەستەیەك دەکەن و پاشان دەڕۆن".

"دەنگی مۆسیقا. روناکی لەسەر راوچییەکان لا دەبریٚ"

"شانۆ: گۆلاو ماسییەکان"

ماسییە کەوە/ دەڵێی ماندوو بوون؟

ماسییە خاڵدار/ کەمێك

ماسییە کەوە/ چۆنە یارییەکی دی بکەین؟

ماسییە خاڵدار/ چ یارییەك؟

ماسییە کەوە/ یارییەکی دی، "هەڵوەستەیەك" تۆ بیڵێ، "هەڵوەستەیەك" منش لەم یارییە بێ تاقەت بووم.

ماسییە خاڵدار/ "هەڵوەستە دەکات. چاوەنۆڕی کاردانەوەی ماسییە کەوە دەکات"

کەوە ماسی/ چۆنە یاری "حەبلانێ" بکەین.

ماسییە خاڵدار/ یان جۆلانێ؟

کەوە ماسی/ یان حەمامۆك؟

ماسییە خاڵدار/ "وازییەك تازە بێ تازە"

کەوە ماسی/ دەتەوێ بە درێژایی گۆلاوەکەدا پێشبڕکێی چوونو هاتنەوە بکەین "زۆری پێ خۆش دەبێت".

ماسییە خاڵدار/ باشە.

کەوە ماسی/ یان بچینە سەری ئاوەکەو بڵقەکان بتەقێنین.

ماسییە خاڵدار/ با لە ماسییە سپیش بپرسین.

کەوە ماسی/ ئەوە بە راست کوا؟ بیرم چوو بوو.

ماسییە خاڵدار/ تۆزێ لەمەپێش لەلای ئەو قەوزانە بوو

"بانگی دەکات" ماسییە سپی لە کوێی"

ماسییە سپی/ "دێتە نزیکەوە" منت گاز کرد؟

کەوە ماسی/ کێوە چوویت؟ لە نیوەی وازییەکەدا ڕۆییشتی.

ماسییە سپی/ بۆ هیچ کوێ نەچووم, لەم دەوروبەرە بووم.

ماسییە خاڵدار/ پێی بڵێ.

کەوە ماسی/ لێبڕاوین وازییەکی تازە بکەین. تۆ چ دەڵێی؟

ماسییە سپی/ خراپ نییە، بەلاّم وەخت زۆرە بۆ وازی. دەمویست شتێکتان لێ بپرسم "هەڵوەستەیەك" ئەرێ کەوە ماسی تۆ هەستت بە شتێك نەکرد؟

کەوە ماسی/ شتی چی؟

ماسییە سپی/ ئەو مرۆڤانەت بینی؟

کەوە ماسی/ کامانە "هەڵوەستەیەك" ئەها . بیرم کەوتەوە. بۆ؟

ماسییە سپی/ گوێت تێوە بوو باسی چییان دەکرد؟

کەوە ماسی/ راستت دەوێ نە ء سەرگەرمی وازییەکە بووم.

ماسییە سپی/ ئەدی تۆ ماسییە خاڵدار؟

ماسییە خاڵدار/ مەبەستت ئەو دوو راوچییە یە کە تۆزێ لەمەوبەر هاتنە دیار گۆلاوەکە.

ماسییه سپی/ بەڵێ.
ماسییه خاڵدار/ "لە فکران رادەچێ" هەندێ قسانیان کرد، بەڵام بە تەواوی لە بیرم نەماوە. باسی راوو نێچیرو ئەم شتانەیان دەکرد.
ماسییه سپی/ دروستە، ئەو قسانە نارەحەتیان کردووم.
کەوە ماسی/ دیسان دەتەوێ بەو بیانوانە خۆت لە یاری ئەمڕۆش بدزیتەوە؟
ماسییه سپی/ گوێ بگرن دۆستان "هەڵوەستەیەك" ئێمە ماوەیەکە بە یەکەوەین. لە خەم و شایدا یارو خەمخۆری یەکدی بووین. خۆشبەختانە تا ئەمڕۆ چ خەتەرێك هەڕەشەی لێنەدەکردین. بەڵام ئەمجارەیان مەسەلەکە جیاوازە، ئەو قسانەی من گوێم لێ بوون هی ئەوەن تەگبیرێکی حاڵی خۆمان بکەین. ناکرێ دەستەو ئەژنۆ دانیشین.
کەوە ماسی/ چ شتێ روویداوە؟
ماسییه سپی/ چ شتێ رووی نەداوە، بەڵام پێش باران کەپنەك. ئەگەر گوێتان لە قسەی ئەو دوو کەسە بگرتبایە ئەوجا بۆتان بە دیار دەکەوت کە رەنگە لە یەکەمین دەرفەتدا بێن و قسەی خۆیان بێننە دی.
کەوە ماسی/ چما چ قەسەیەکیان کرد تا بیهێننە دی.
ماسییه خاڵدار/ دوربینی شتێکی باشە، بەڵام منیش بە دووری دەزانم. بۆ خۆیان هەندێ قسانیان کردو هەستان و رۆییشتن.
کەوە ماسی/ بێگومان ئێستا هەر بیریشیان نەماوە.
ماسییه سپی/ خۆ لەوانەشە بیریان مابێ، بەڵام من پێم سەیرە ماسی لە راوچی سڵ نەکات.
کەوە ماسی/ زۆریش دڵی خۆت تەنگ مەکە.
ماسییه سپی/ مەسەلە دڵ تەنگ کردن یان رەشبینی نییە، مەسەلەکە ئەوەیە کە من و ئێوەش ئەم رووداوە بە زەنگی خەتەر بزانین.
ماسییه خاڵدار/ بەرای تۆ ئێستا چ بکەین؟
کەوە ماسی/ چما دەبێ کارێ بکەین؟
ماسییه سپی/ "ماسییەکان چاوەنۆڕی قسەی ماسییه سپی دەکەن" من پێم وایە چاکترە لێرە بڕۆین.
کەوە ماسی/ بڕۆین؟
ماسییه خاڵدار/ بۆ کوێ بڕۆین؟
ماسییه سپی/ شوێنەکە گرینگ نییە، گرینگ ئەمەیە کە...
کەوە ماسی/ یانی ئێرە... "ماسییه خاڵدار نیگایەکی پرسیار ئامێزی ئەو دەکات، قسەکەی قووت دەداتەوە"
ماسییه سپی/ ئەو جووتە راوچییە، دێنە راوی ئێمە.
کەوە ماسی/ ئەی بابا. بە رادەیەش نییە.
ماسییه خاڵدار/ ئێمە بەم گۆلاوە راهاتووین. چۆن دەتوانین لێرە بڕۆین.

ماسییه سپی/ من بڕیاری خۆم داوه. لەو جوگەلە باریکەوە بۆی دەردەچین و دەڕۆین، ئەگەر ئێوەش بێن زۆر چاکترە. "هەڵوەستەیەك دەكات و سەیری ئەوانی دی دەكات"

ماسییه خاڵدار/ ئەو جۆگەیە ئاوی كەمە.

ماسییه سپی/ چاوەنۆڕ دەكەین و لەگەڵ یەكەم باراندا ئاوی جۆگەلەكە زیاد دەكات و خۆمان دەدەینە دەم ئاوەڕۆیەكەوەو ملی ڕێگا دەگرین و دەڕۆین.

كەوە ماسی/ ئەو جۆگەلەیە دەگاتە كوێ؟

ماسییه سپی/ جارێك باڵندەیەك گێڕایەوە كە ئەو جۆگەلەیە دەچێتەوە سەر جوێبارێكی گەورەو جۆێبارەكەش دەچێتەوە سەر ڕوبارێك و ڕووبارەكەش دەڕژێتە دەریاوە.

كەوە ماسی/ باشە بیرت لە تەنگوچەڵەمەی ڕێگە كردۆتەوە؟

ماسییه سپی/ ئێستا وەختی ئەوە نییە. گرینگ ئەوەیە كە نەكەوینە چنگی ئەو ڕاوچییانە.

ماسییه خاڵدار/ كەواتە تۆ بە ڕاستی بڕیاری خۆت داوە؟

ماسییه سپی/ "بە زەردەخەنە" بەڵێ، چی بێ لە ئێوە نهێنی، ئەوە ماوەیەكە هەست دەكەم ئەم گۆلاوە بچووكە، نامگرێتە خۆی. ئیدی بەلامەوە زەحمەتە لە گۆلاوێكی بچووكدا بێم و بچم، یان خۆم بە گەمەو وازی بێهودەوە خەریك بكەم. لەلایەكی ترەوە هەر خۆی لە خۆیدا سەیران و سەفەرێكە شتی تازەش لە ڕێگەدا زۆرن.

كەوە ماسی/ بەڵام ئێمە تا ئێستا لە ڕوباردا یان لە دەریادا نەژیاوین.

ماسییه خاڵدار/ بەڕای تۆ دروستە بێ بوار خۆ بە ئاویدا بدەین؟

ماسییه سپی/ نازانم مەبەستت چییە، ئیدی ئاو ئاوە، لە جێیە زۆرترو لە جێیە كەمتر. دەزانن دڵم ئارەزووی دەریای هەیە. چما نەت بیستووە كە گوتویانە.

هەر كەسێ لە ژیانیا دەریای نەدیوە

نەزننەگی كردووە، نە هیچ فامیوە.

"هەڵوەستەیەك" باشە ئێوە چ دەڵێن؟ با ئەم گۆلاوەش بۆ ئەو ڕاوچییانە بمێنێ و هەر كە هاتن دەست لە گونان شۆڕتر بگەڕێنەوە "دەڕواننە یەكدی".

ماسییه خاڵدار/ نابێ قسەی ئەو ڕاوچیانە بەجدی بگیرێ، لەوەشە هەر كە لێرە دوور كەوتبنەوە لە بیریان كردبێ.

كەوە ماسی/ ئەم گۆلاوە چاكە بەجێ بهێڵین و خۆمان بدەینە دەم خەتەری جوێبارو ڕووبارانەوە؟

ماسییه سپی/ بە هەر حاڵ بڕیار بە دەست خۆتانە، بەڵام من حەز ناكەم هەڵەیەك بكەم كە نەتوانم تۆڵەی بكەمەوە "دەنگی هەورە تریشقەو بروسكە دێت و پاشان باران وردە وردە دادەكات و بەرە بەرە توندتر دەبێت" ئەوە بارانیش دەستی پێكرد، كەواتە فرسەتە "ماسییه سپی، دۆستانە دەڕوات بۆ لای دوو ماسییەكەی دی خوا حافیزییان لێدەكات، كە دەگاتە لێواری جۆگەلە كە دیسان هەڵوەستەیەك دەگات" بە هیوای دیدار. "وەدەردەكەوێ".

"دەنگی مۆسیقا، دوو ماسییەكە دەڕواننە یەكدی، شانۆ تاریك دەبێت".

"دیمەن گۆلاوەکەیە. کەوە ماسی و ماسییە خاڵدار سەرگەرمی یارین، بەیانییە، دەنگی مۆسیقا دێ"

ماسییە خاڵدار/ کەوە ماسی دەڵێم تۆ بیری لێ بکەوە، لە نێو دەریایەکی گەورەدا مەلە بکەین و لە پڕ ببینی نە هەنگێکی گەورەش خەریکە شان بە شانی تۆ دەڕوات "قاقا پێدەکەنێ".

کەوە ماسی/ ئەرێ بەڕاست دەشێت ختوکەی بدەی؟

ماسییە خاڵدار/ چۆن دەوێری؟ ئەو نەهەنگێکی زەبەلاحە.

کەوە ماسی/ یانی چەند گەورەیە.

ماسییە خاڵدار/ زۆر، ماسییە سپی زۆر شتی دەربارە دەزانین، دەیگوت هەندێکیان بە ئەندازەی یەك کەشتییە.

کەوە ماسی/ دەڵێم ئەوە چەند رۆژە ئەو دۆستەمان رۆییوەو هیچ هەواڵێکی نازانین. چ دەنگو باسێکی ئەو راوچییانەش نەبوو، پێت وانییە ئەو دۆستەمان بگەڕێتەوە لای ئێمە.

ماسییە خاڵدار/ نازانم، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە دۆستێکی چاك بوو. "دەنگێ دێ، راوچییەکان وەژوور دەکەون. هەردووکیان بە متمانەوە بە دیار گۆلاوەکەوە دەوەستن، گوتیارن وەژوور دەکەوێ".

گوتیار/ رێك لەو دەمەیدا کە ماسییەکان سەرگەرمی گفتوگۆ بوون، راوچییەکان پەیدا بوون، دەمو دەست تۆڕەکانیان خستە ئاوەکەوە.

ماسییەکان خراپ غافڵگیر بوو بوون. بەر لەوەی فریای خۆیان بکەون، راوچییەکان تۆڕی خۆیان هەڵدا بوو.

راوچی1/ "بە دەم تۆڕ هەڵدانەوە" زۆر چاکە ئەمەش تۆڕ.

راوچی 2/ ئەمەش چەشە "هەندێ شت هەڵدەداتە ئاوەکەوە".

کەوە ماسی/ "سەرسامە" ماسییە خاڵدار لە کوێی، وەرە کەوتینە داوەوە.

ماسییە خاڵدار/ راستە، خۆیانن، ئێستا چ بکەین "هەڵوەستەیەك" بە راستی ماسییە سپی راستی کرد.

کەوە ماسی/ ئێستا چ بکەین؟ هەر ئێستا دەگیرێین.

ماسییە خاڵدار/ هەوڵ بدە کەوە ماسی، بە خۆڕایی خۆت مەشڵەژێنە. هەوڵ بدە بە هەر شێوەیەك بووە خۆت رزگار بکەی، منیش هەوڵی خۆم دەدەم. "لەگەڵ خۆیدا" دەبێ تا درەنگ نەبووە بیر لە چارەیەك بکەمەوە. "بۆ ساتێك لە فکران رادەچێت و پاشان دێتەوە سەر خۆی".

خۆم دەکەم بە مردوو و هێدی هێدی بەرەو رێژگەی جۆگەلەکە دەچم، تەنێ ئەم کارەم بە بیردا دێت، هیوادارم کەوە ماسی–ش چارەیەکی خۆی بکات.

گوتیار/ بەڵێ، ماسییە خاڵدار، خۆی کرد بە مردوو، هاتە سەر ئاوەکەو هێدی هێدی بەرەو رێژگەی جۆگەلەکە داکشا، بەڵام راوچییەکان پێیان زانی.

راوچی1/ "دادەنەوێتەوە. نیگایەکی ماسییەکە دەکات" دەڵێی مردووە، بووە بە داری رەق.

راوچی2/ لافاوەکە کوشتوویەتی.

راوچی1/ تۆڕەکە بگوازەوە بۆ قولایی ئاوەکە.

راوچی2/ باشە "تۆڕەکە دەجولێنیٚ".

راوچی1/ وا چاکە تۆڕەکە بە تەکان و یەك کەرەت دەربێنین. چۆنە؟

راوچی2/ باشە، حازری؟ "لە کاتی هەڵکێشانی تۆڕەکەدا هەردووکیان رەق راوەستان".

گوتیار/ ماسییە خاڵدار وەکو چۆن خۆی کردبوو بە مردوو هەر بەو دەقەوە خۆی گەیاندە ڕێژگەی جۆگەلەکەو خۆی هەڵداو بە تەواوی خۆی رزگار کرد. بەڵام گویٚ بگرە بزانن کەوە ماسی کە هەرگیز ئەقڵی لە خەسارەکانی خۆی وەرنەگرتبوو، کەوتە پەلە پروزیٚ ویڵ‌ڵو سەرگەردان چەپ و راستی کرد، هەورازو نشێوی کردو لە ئەنجامدا گیرۆدە بوو.

"روناکی لەسەر گوتیار لا دەچێت. کەوە ماسی دەبینین کە شڵەژاوەو بەم لاو بەولادا دەڕوات، لە پریٚکا تۆڕەکە رادەکێشریٚ و کەوە ماسی دەکەوێتە داوەوە، دەنگی قاقای راوچییەکان بەرز دەبێتەوە. روناکی لەسەر شانۆو دیمەنەکە لا دەچێت، دەنگی مۆسیقا".

"دیمەن: بەشێك لە دەریا"

گوتیار/ بەڵیٚ دۆستان ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو رۆژانەدا بوری، مانگان و بگرە سالانیش تێپەڕین تا رۆژێك لە گۆشەیەکی دەریایەکی گەورەدا شتێکی سەیر روویدا، "گوتیار وەدەردەکەویٚ" "چەند ماسییەك خەریکی مەلەن. ماسییە سپی بە پەلە وەژوور دەکەویٚ".

ماسییە سپی/ سڵاو، سەبرکەن، سەبرکەن، دەتانەویٚ لێرەوە بڕۆن؟

یەکێك لە ماسییەکان/ بەڵیٚ.

ماسییە سپی/ حەز دەکەم لێرەوە نەڕۆن ڕێگەکەتان بگۆڕن.

یەکێك لە ماسییەکان/ بۆ، هیچ بووە.

ماسییە سپی/ من وا لەوێندەرەوە دێم، کەشتییەکی گەورەی راو لەویٚ لەنگەری خستووەو بە چاوی خۆم دیتم کە چۆن تۆڕە گەورەکانیان هاویشتە دەریاکەوە، تا ئێستا تۆڕی وەهام نەدیووە.

یەکێك لە ماسییەکان/ "دێتە بەرەوە" ببوورە، تۆ لەبەر چاوم غەریب نیت "دوای تۆزێك، پاش ئەوەی یەکتر دەناسنەوە، یەکدی لە ئامێز دەگرن" سپی ماسی، ئەمە تۆی دۆستی دێرین. .

ماسییە سپی/ خاڵدار، تۆ لە کویٚ و ئێرە لە کویٚ؟ باباش تەمەشات بکەم.

ماسییە خاڵدار/ چەند خۆشحاڵم، چاوم روون، خەریکە لە خۆشیا باڵدەگرم. .

ماسییە سپی/ منیش، چەندم حەز دەکرد جارێکی دی یەکتر ببینین. .

ماسییە خاڵدار/ سوپاس بۆ خوا، سوپاس بو خوا.

ماسییە سپی/ سوپاس... پاش ئەوەی لە گۆلاوەکە لێکدی جیا بووینەوە، بە درێژایی ڕێگا هەر بیرم لای ئێوە بوو لە دڵی خۆدا دەم گوت، ئاخۆ جارێکی دی یەکدی دەبینینەوە. .

ماسییەخاڵدار/ منیش نیگەرانی تۆ بووم، بەڵام یەك دنیا بە بینینەوەت خۆشحاڵم. .

ماسییە سپی/ ئیٚ، دە بۆم باس بکە بزانم چۆن گەییشتیە ئێرە؟ ئەدی کەوە ماسیت لەگەڵ نییە.

ماسییە خاڵدار/ "هەڵوەستەیەك" حیكایەتەكەی دوورو درێژە. ماوەیەك دوای تۆ راوچییەكان هاتن. من لە دوا ساتەكاندا توانیم خۆم نەجات بدەم. بەڵام كەوە ماسی نەیتوانی خۆی لەو تالوكەیە رزگار بكات و منیش نەمتوانی هیچی بۆ بكەم. "هەڵوەستە، خەمبارە"..

ماسییە سپی/ بەداخەوەم.

ماسییە خاڵدار/ پاشان دوای گەڕانێكی زۆر، ئەوەتا ماوەیەكە گەییومەتە ئەم دەریایەو لێرە دەژیم. ئەمانەش كە دەیان بینی بێچووی منن.

ماسییە سپی/ زۆر بە دیدارتان شادم. "بێچووەكان بۆی دەگرژێنەوە".

ماسییە خاڵدار/ تۆ بۆم باس بكە ماسییە سپی.تۆ هەمیشە قسەو حیكایەتی خۆش خۆشت لە كن هەن. چۆنی لێرەوە سەرت دەرهێنا . .

ماسییە سپی/ ئەوی راستی بێ بە خۆیشم بە تەواوی نازانم، پاش ئەوەی لە گۆلاوەكەی وەدەركەوتم، جۆگاو جۆگا هاتم و گەییمە روبار، لە دەرێی گۆلاوەكە هەر چیم دەبینی پێم سەیرو جوان بوون. رووبار، بە پێچ و دورە بە دەشت و ئاوەدانیاندا رەت دەبوو و بەبێ درێغی هەمووی پاراو دەكرد. من جووتیارانێكم دەبینین كە بە چ شەوق و زەوقێكەوە زەوی و زاری خۆیان دەكێڵا. لە شوێنێك كۆمەڵێك پیاوم بینی كە بە دڵ و گیان پردێكیان رۆدەنایەوە كە لافاو بردبووی. گیانلەبەرانم بینی كە لە دووری چەندین كیلۆمەترەوە دەهاتن تا لە روباری ئاو بخۆنەوە. لە شوێنێكیشدا خەڵكی دوو گوندان لەسەر ئاوی رووبارەكە لێیان بوو بوو بە شەڕ، لە جێیەكی دیكەش دایكێكم بینی كە منداڵە چكۆڵەكەی خۆی لە ئاوی رووبارەكەدا دەشت، لە شوێنێكی دی شاعیرێك شیعری بۆ خەڵكی دەخوێندەوە كە هەندێكیم لەبیر ماوە.

با ئاوی لێڵ نەكەین، رەنگە كۆترێ لە خوارێ را ئاوێ بخواتەوە یا لەوەیە لە بێشەیەكی دورا، رەشۆڵەیەك خۆی بشوات یان لە ئاواییدا گۆزەیەك پڕ بكرێ.

با ئاوی لێڵ نەكەین. رەنگە ئەم ئاوە زوڵاڵە بچێتە پای چنارێ، تا خەمی دڵێك بشواتەوە. لەوەیە دەستی قەڵەندەرێك نانێكی وشك لە ئاوێ هەڵكێشێ، خەڵكی، كە لە ئاوازی ئاو تێدەگەن.

لێخنیان نەكرد، با ئێمەش چاو لەوان بكەین.

ماسییە خاڵدار/ شیعرێكی جوانە.

ماسییە سپی/ پاشان گەییمە دەریا. دەریا بەو هەموو هەیبەتەوە، بەو هەموو شتە جوانانەیەوە، جانەوەرانی رەنگاورەنگ، هەڵكشان و داكشانی ئاو، شەپۆلانی گەورە، كە شتیان و رووداوی جۆراوجۆر. جارێكیان تۆفان هەستاو بووە باعیسی غەرق بوونی كەشتییەك، من بە چاوی خۆم هەوڵ و تەقەلای مەرگ و ژیانم تێدا بینی. "هەڵوەستەیەك بە زەردەخەنەوە" ئێستاش ئەوە ماوەیەكە لەم دەریایەدا دەژیم. لە نزیكی هۆو بەردە.،

ماسییە خاڵدار/ ئەوڕۆ چ رۆژگارێكی خۆش بوو. سوپاس بۆ تۆ خوایە، بریا بكرایە جارێكی دی پێكەوە بژین. .

ماسییە سپی/ كارێكی زۆر زەحمەت نییە.

ماسییە خاڵدار/ یانی تۆش حەز دەکەی؟.

ماسییە سپی/ هەڵبەتە حەز دەکەم، دەڵێم چۆنە بێیتو بچینە پەنای ئەو بەردە، شوێنێکی زۆر چاك و لەبارە، لەوەیە بە قەد ئەو بەشەی کە ئاوی گەرمی پێدا دەڕوات باش نەبێ بەڵام دڵنیام بە دڵت دەبێ.

ماسییە خاڵدار/ من رازیم "روو دەکاتە هاوڕێکانی" ئەنگۆ چ دەڵێن؟.

ماسییەکان/ ئێمەش رازین.

ماسییە سپی/ کەواتە ماتەڵی چین، با بڕۆین.

"مۆسیقا، شانۆ تاریك دەبێت".

# دێو و ئاوایی

دەورەکان:
گوتیار
نێرە دێو
دێڵە دێو
پیاوێك و ژنێك لە پەنجەرەوە
دوو پیاوی دێهاتی
دوو ژنی دێهاتی
جەنگ
جەهل
مەرگ
تەماعکاری.

لای راستی شانۆ بیابانێکە کە کەلاوەو شوێنەواری کۆنە دیوارە، لەلای راستو لە قوڵایی شانۆدا کە نزیکەی 1 لەسەر سێی فەزای شانۆکە دەگرێتەوە و دیوارێکی قەڵا ئاسا کێشراوەو دەرگایەکی مەحکەمی هەیە، لەو لای دیوارەکەوە دیمەنی ئاواییەکی رێك و پێکە بە چەند پەنجەرەیەکەوە. کات نیوەشەوەو ئاوایی لە خەودایە. لە دوورەوە دەنگی ناسازی پێچکەی گالیسکەیەك دێت کە رادەکێشرێ، لەگەڵ هانکە هانکەدا. نێرەدێو و دێڵەدێو لەلای چەپەوە وەژوور دەکەون. نێرەکە گالیسکەکە رادەکێشێت و دێڵەکە لە دوای نێرەکەوە دەوێستێ. ئارەقەی هەنیەی دەسڕێ . گالیسکەکە لەلایەکەوە دادەنێ و نیگای دەوروبەری دەکات. کێشمانێکی خۆی دەدات و ماندوویەتی خۆی دەردەکات، دێڵە دیچوەکەش بە کنوکۆوە دەڕوانێتە دەوروبەر.

گوتیار، وەژوور دەکەوێ.

گوتیار/ هەبوو نەبوو یەکێ هەبوو لە زەمانی کۆنداو لە شوێنێکی نە زۆر دوور و نە زۆر نزیکدا، دێوێك لەگەڵ ژنەکەیدا دەژیا. پێیان دەگوتن نێرە دێوو دێڵە دێو، واتە ژن و مێردی یەکدی بوون ئەمانە هەر چەند وەختێ جارێك سەفەریان دەکردو لە رێگادا شتی زۆر رووی دەدا، ئەم رووداوەی کە هەنووکە دەیبینن یەکێکە لەو هەزاران رووداوانە کە ئەوان ناویانەتەوە، یان با بڵێین یەکێکە لەو کەتنانەی ئەوان کردوویانە. دەیسا با رووداوەکە بدینین:

نێرەدێو/ رێیەکی زۆرمان بڕیوە نا؟

دێڵە دێو/ ئەرێ وەڵلا، چاوم تاریك بوو، هەر بڕۆ هەر بڕۆ و مەگەجێ، بە تەواوی ماندوو بووین.

نێرە دێو/ بەڵام ئیدی خەیاڵت رەحەت بێ، گەییشتین. وا چاکە نیگایەکی دەوروبەرمان بکەین.

دێڵە دێو/ باشە "بەدەم نیگاکردنی دەوروبەرەوە" دەڵێم تۆ تەمەشا لەم سەرزەمینەدا، چەندێ زەوی‌و ئاوایی هەن. "بەدەست ئیشارەت دەکات" ئەم هەمووە "پێدەکەنێ. بە نێرەدێو" ئەگەر ئەمانە هەمووی هی ئێمە بوایەن چەند باش دەبوو

"پێدەکەنی"

نێرەدێو/ "لە کەناری دیوارە رووخاوەکە دەوەستێت" ئێرە سەر دەمانێك ئاوەدان بووە، تۆ تەماشای ئێرە بکە.

دێڵە دێو/ لەوانەیە. بەڵام من هیچم بیر نایەت.

نێرە دێو/ چۆن هیچت بیر نایەت. باش بیربکەوە. دیارە لە بیرت چووە.

دێڵە دێو/ دەشێت، هیچم بیر نایەت.

نێرە دێو/ ئێرە، هاوکارانی خودی ئێمە وایان بەسەر هێناوە، چاك لە بیرمە ساڵێك بوو بێ بارانی.

دێڵە دێو/ راوەستە، دەقیقەیەك، وەك بڵێی خەریکە هەندێ شتم بیر دەکەونەوە.

نێرەدێو/ "ئیشارەت بۆ ئاواییەکە دەکات" تەنێ ئەم ئاواییە بە سەلامەتی دەرچوو "یەکێك لە پەنجەرەکان رووناکم دەبێتەوە، کە سێك لە پەنجەرەکەوە سەر دەکێشێت. دوای تۆزێك پەنجەرەکانی دیکەش بەرە بەرە روناك دەبنەوە".

دێڵە دێو/ ئاواییەکی رێك‌و پێکە، چراکانیان رۆشنە، دیارە کە بە خەبەرن.

نێرەدێو/ دروستە، "نێرە دێو بەرەو دەرگا دەچێت تەمەشایەکی دەکات" ئەمەش دەرگای باخەکەیانە. .

دێڵە دێو/ دیارە دەبێ ئاواییەکی باش بێت.

نێرەدێو/ هەر وایە، من ئاگادارم کە چەند ماڵن، کاروباریان رێك‌و پێك و بە حیساب‌و کیتابە.

دێڵە دێو/ کەواتە کاروباریان بە حیساب‌و کیتابە "دێتە جۆش‌و شادو خۆشحاڵ دەبێت".

نێرەدێو/ چییە؟ خۆشحاڵ دێیتە بەرچاو "هەڵوەستەیەك" ئەڵێم ئەگەر ئاواییەکانی دیکەش چاو لەمان بکەن، ئەوسا ئاوایی باش و خۆش لە دنیادا چەند زۆر دەبوو.

دێڵە دێو/ دروستە، بەڵام ئێمە چمان داوە لەم قسانە.

نێرەدێو/ واشە، گرینگ ئەمەیە کە لە هەر شوێنێك شتێکی باش هەبێ ئێمە دەمانەوێ "هەردووکیان پێدەکەنن‌و دەڕواننە پەنجەرەکان".

دێڵە دێو/ دەڵێم، چۆنە ئەوزاری گالیسەکە پەیدا بکەین؟

نێرەدێو/ تۆ خۆت ماندوو مەکە. ئەم کارانە لە ئەستۆی خانەخوێیە، بە کوێرایی چاویانەوە دەبێ ئەنجامی بدەن، تۆ لە بیری خۆماندا بە.

دێڵە دێو/ کەواتە چ بکەین؟

نێرەدێو/ ئێستا پێت دەڵێم. "بەرەو دەرگا دەچێت‌و دەکەوێتە لە دەرکەدان.

هەڵوەستەیەك دەکات. گوێی بە دەرگاکەوە دەنێ، دیسان لە دەرگا دەدات. چەند کەسێکی خەڵکی ئاوایی دێنە پشت دیوارەکەوە".

دێڵە دێو/ دەڵێی گوێیان لێ نییە.

نێرەدێو/ بێگومان سەرقاڵی کەیفی خۆیانن.

دێڵە دێو/ لەوەشە بە جۆرێ خەوتبن کە بەو دەنگانە بێدار نەبنەوە.

نێرە دێو/ "دادەنەوێتەوە، بەردێك هەڵدەگرێ‌و دەکەوێتە دەرگالێدان"

دیارە لە دڵی خۆیاندا دەڵێن بەم درەنگە شەوە وەختی میوان و میواندار نییە. "چ وەڵامێك نییە".

دێڵە دێو/ دەزانی چییە، کەسانێك کە بزانن بەمجۆرە ئاوایی دروست بکەن، دەشزانن چۆن دەرگا دابخەن.

نێرەدێو/ ئامان لە دەستی شارەزایی خەڵکی. ئەگەر هەموو خەڵکی کەڕو کوێرو نەفامو نەشارەزا بن، کاری ئێمە زۆر ئاسانترە. .

دێڵە دێو/ دڵ لە دڵ مەدە. خەیاڵیان خاوە، ئێمە دەست بەردار نابین.

نێرەدێو/ وایە، ئەگەر ئەوان بەمجۆرە دەرگایان داخستووە، ئێمەش دەزانین چۆنی دەکەینەوە.

دێڵە دێو/ هێندە لە دەرگا دەدەین تا خەو لە چاویان حەرام دەبێ.

"ئیدی بە توندی دەکەونە دەرگا لێدان، دێڵە دێوەش هێندە دەجوڵێ کە زەنگوڵەکانی قەدو کەمەری دەکەونە لێدان".

"گوتیار وەژوور دەکەوێ. دێوەکان لە جێی خۆ دەوەستن، هەنووکە روناکی لەسەر گوتیارە.".

گوتیار/ بەڵام خەڵکی ئاوایی کە لە دەنگە دەنگی لێدانی دەرگاو زەنگۆڵەکان هاتبوونە دەرێ هەر کە دیتیان دوو دێو بەعارەبانەیەکەوە لە پشتی دیواری ئاواییەکەیانەوە وەستاون، تەماشای کێۆنەکانیان کردەوە، و لەو رێگایانەوە کە خۆیان دەیانزانی کەوتنە چاودێری دێوەکان "گوتیار وەدەردەکەوێ، نێرەدێو پاش ماوەیەك ماندوو دەبێت، دێڵە دێوەش ماندوو دەبێ‌و بە دوو قۆڵی دەچنە نك گالیسکەکە".

نێرەدێو/ چ ماسییەکی سەرکێش کەوتۆتە تۆڕەکەمانەوە، دەیبینی؟.

دێڵە دێو/ گوێیان لێیە، بەڵام نایکەنەوە، ئێستا چ بکەین؟

نێرەدێو/ راستە، زۆر باشیش گوێیان لێیە. ئەمانە با چۆتە کەوڵیانەوەو لە دڵی خۆیاندا دەڵێن کە ئێمە هەقی خۆمانە بە مەیل‌و ئارەزووی خۆمان بژین.

دێڵە دێو/ دەڵێم خۆ دەرگای دەشتیان لێ نەگرتووین. ئێمە ماندووین، وەرە با لێرەدا بۆ خۆمان لێی بخەوین.

نێرەدێو/ ئەوە چە دەڵێی، هەر خۆت نیو سەعاتی دی دەکەوییە پرتەو بۆڵە کە شوێنەکەم نارِەحەتەو ناتوانم بخەوم، خۆ ئێمە بۆ خەو نەهاتوین بۆ ئێرە، مەبەستێکی دیکەمان هەیە. ئێرە جێی خەونییە، دەشت شوێنی خشۆکان‌و مشك‌و جرجانە، من فێری دۆشەکی نەرم‌و قەرەوێڵەی سپرینگم، ئێستا بێم حەیای خۆم بەرم؟ ئاخر خەڵکی چیمان پێ دەڵێن؟.

دێڵە دێو/ چ کەسێك لێرە نییە تا ئێمە ببینێ؟

نێرە دێو/ با کەسیش نەبێ. چما نازانی ئێمە دێوین. قەت ئەمە لە بیری خۆت دەرمەکە. ئێمە وەختێ ئیسراحەت دەکەین کە دەبێ لە کەماڵی ئاسایشدابین. دەنگی ئاوازان بێت، کە نیزەکان

حیکایەتمان بۆ بگێڕنەوە. غوڵامانی ئەڵقە لە گوێ لە جامی زێڕدا شەرابمان بۆ بێنن. ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ مەگەر خۆت هەموو ئەوانەت ناوێ؟.

دێڵە دێو/ قسەکانی تۆ راستن، بەڵام لەگەڵ نەبوونیدا چ دەکرێ؟ ئەمانە لەو کەسانە نین کە هەرچی دڵمان بیەوێ بماندەنێ، هەر لە دەرگا نەکردنەوەکەیان را دیارە.

نێرەدێو/ وەك بڵێی بیرو خەیاڵت پەرتو بڵاوە "دەست دەنێتە ناو قەدی خۆیو بزەیەکی نا ئومێدانە دەکەوێتە سەر لێوی" کەواتە حسێبی ئەو هەموو شتە زۆرو زەبەندانەی لەم ماڵانەو لەم ئاواییەدا هەن چی لێ دێ؟.

دێڵە دێو/ چوزانم "بۆ ساتێك چاو لە چاوی یەکدی دەبڕن"

نێرە دێو/ کەواتە ئەگەر وایە چ کۆسپێك لە رێی ئێمەدا نییە. ئەگەر ئەوان زەحمەتیان کێشاوە. ئێمەش زەحمەتی خۆمان دەکێشین، کاری ئەم دنیایە بردنەوەو دۆڕاندنە، کاریش هی ئەو کەسەیە کە تەواوی دەکات، خۆ ئەوەشت بیستووە هەر کارێك تەنیا یەك رێی هەیە.

دێڵە دێو/ رێیەکەی چییە؟

نێرەدێو/ من رێگەکەی بەڵەدم.

"نێرەدێو دەکەوێتە حیلاندنو فیکەکێشانو سمکۆڵان. بە دەم نەڕە نەڕو سمکۆڵانەوە گوریسێك لە نێو قەدی خۆی دەکاتەوەو دەکەوێتە بادانی. گوریسەکە هێند بە توندی با دەخوات پریشکی ئاگری لێ دەکەوێتەوەو خامۆش دەبێت. دەنگی بانگی کەڵەباب دێت. دێوەکە هەڵوەستەیەك دەکاتو دووبارە دەست پێدەکاتەوە هەوڵ دەدا زەوییەکی هەموارو لەبار بۆ بەردەوامی کارەکەی خۆی بدۆزێتەوە. دوو جاران بانگی کەڵەباب دەبیسترێ، دەنەڕێنێ".

نێرەدێو/ نەخەون ها . لەگەڵ ئێوەمە ها .

"دیسان دەست پێدەکاتەوە، وەکو جوانەگای بەهار دەکەوێتە نەعرەتە کێشان. سەری بەرەو زەوی دێنێ، وا خۆی دەنوێنێ کە تەقڵە لێدەدات، بە شاخە بچوکەکانی هەڕەشە دەکات کە من وەکو گای کێوی وامو دوچاری شەڕم دەکەن".

دێڵە دێو// "تەمەشای دەکات، بە دڵ پێدەکەنی" زۆر چاکە، زۆر چاکە، گیانەکەمی.

"خەڵکی ئاوایی لە پەنجەرەکانەوەو ئەو چوار نەفەرەی کە لە حەوشی پشت دەرگاکەوەن، خەریکی تەمەشاکرنی رەفتاری دێوەکانن. نێرە دێوەکە هەر کە چاوی بە وان دەکەوێت، دەست لە کارەکانی هەڵدەگرێ. هەنگاوێك دەچێتە پێشێ. سەری سڵاویان بۆ دەلەقێنێو بە نەوازشێکی لیبۆکان ئاساوە سەرفرو دێنێ"

نێرە دێو/ چۆنە؟ پێتان خۆشە؟

یەکێك لە پەنجەرەکەوە/ ئەمەش بۆ خۆی جۆرە کارێکە.

ژنێك لە پەنجەرەوە/ بەڵام بەم درەنگە شەوانە کە خەڵکی دەیانەوێ بخەون، ئەگەر تا سبەینێ لەسەر ئەم کارە بەردەوام بێ مەعنای نییە.

نێرە دێو/ "بە دێڵە دێو" نەمگوت پێیان خۆش دەبێ؟.

دێڵە دێو/ "بە پێکەنین هانی دەدا" زۆر چاکم بوو. بە راستی چاکم بوو.

نێرە دێو/ حەیفیٚ کە ئێرە ساف نییە، تۆزیٚ ناوەختیشەو ناتوانم بۆتان برەقسم. زۆری نەماوە ڕۆژ ببێتەوە. "بەدێڵە دێو" ئەوان سەمای منیان نەدیتوە "پێدەکەنیٚو بۆ ئەوەی بیانهێنێتە سەر هەوەس، کەمەری ناقۆڵای کە زەنگۆڵەی دنیای پێوە بەستووە دەجوڵێنیٚو زەنگۆڵەکان دەنگیان لێوە دێت".

پیاوە دێهاتییەك1/ وەکو دیارە تۆ لە تاریکییدا باشتر دەڕەقسی.

ژنە دێهاتییەك1/ بەڵام تۆ مەبەستت لەم کارانە چییە؟

پیاوە دێهاتی 2/ بەم شەوە کەس داوای ئەم ڕەفتارانەی لێنە کردووی.

ژنە دێهاتی 2/ ئەم گەمانە چین؟

پیاوێك لە پەنجەرەکەوە/ پێت وایە خەڵکی بەم گەمانە فریو بدەی؟

ژنێك لە پەنجەرەوە/ بۆچی ئەم گەمانە نابەی بۆ شارەکەی خۆتانو لە وێندەر پیشانیان بدەی؟

ژنە دێهاتی2/ لەوەی پتر زەحمەت مەکێشە تا ئێرە بەسە.

نێرە پیاو/ "بەدێڵە دێو" ئەو سەبەتەیەم وێدە "ئاماژە بۆ گالیسکەکە دەکات" دەمویست ئەوەشتان پیٚ بڵێم کە بە دەستی بە تالٚ نەهاتووین و شتی چاك چاکمان پێیە. "دێڵە دێو سەبەتەکان دێنیٚو یەك یەك دەیان داتە دەستی دێڵە دێو".

نێرە دێو/ چکلێتی چاكو بە تامو بادەم لە نێو قوتووی جواندا، ئەسپاپی گەمەی تازە، شتی جوانو نویٚ، تەماشا بکەن "پیشانیان دەدات".

پیاوە دێهاتی 1/ دەزانین کە دەوڵەمەندو داران.

پیاوە دێهاتی 2/ بەڵام سەبارەت بە شتە تازەو پێشکەوتووەکانتان، پیاو لە کارو کردەوەکانی ئێوەوە کە بەم درەنگە شەوە دەتانەویٚ بەزۆر، بچنە ماڵی خەڵکەوە، دەکریٚ زۆر شت تیٚ بگەین.

ژنە دێهاتی1/ پێویست ناکات ئەو کاڵایەنەتان پێشانی ئێمە بدەن.

دێڵە دێو/ "قوتویەك دەردێنیٚ" تەماشا بکەن، باش تەماشا بکەن. ئێوە نازانن کە ئەم شتانە چەند گرینگن بۆ پەروەردە کردنی منداڵانو چەند کار دەکاتە سەریانو پاشان دەبن بە پیاوانی بە تواناو هزرڤان بۆ وڵاتی خۆتانو تەنانەت بۆ هەموو دنیاش.

نێرەدێو/ دروستە، ئێمە بە خۆیشمان لەم شتانە دەدەینە منداڵەکانمان.

ژنە دێهاتی2/ لەوە دەچێت ئێمە ئەوشۆ گیرۆدەی ئەو دێوانە بووبین کە لە چیرۆك داستاناندا باس دەکرێن.

پیاوە دێهاتی1/ دروستە، جاریٚ دەرگاکان توند بکەنو وریا بن منداڵەکان بە ئەسپاپ وازییەکانی ئەمانە تەفرە نەخۆنو بۆ هیچ کویٚ نەڕۆن.

پیاوە دێهاتی2/ "بەدێوەکان" دەزانن چییە، ئەم قسانە ناچی بە گوێی ئێمەدا، ئێمە دەتانناسینو جێی خەڵکانی وەکو ئێوە لە ماڵو ئاوایییەکەماندا ناکەینەوە.

ژنە دێهاتی1/ منداڵانی ئێمە لەسەرو سەکوتی ئەنگۆ دەترسن، ڕێی خۆتان بگرنو بڕۆن.

ژنە دێهاتی2/ بڕۆن بە سەلامەت، خەریکە ڕۆژ دەبێتەوە. "پەنجەرەکان دادەخەنو چراکان دەکوژێننەوە، دەچنەوە ماڵەکانیان، ئاوایی تاریك دەبێت" نێرەدێوە کە بەرەو لای دێڵە دێوەکە

دەڕوات کە بە چینچکانەوە دانیشتووەو سەرگەرمی ئەو شتانەیە کە لایەوە دانراون، نازانیٚ چ بڵیٚ. لە بن لێوانەوە دەپرتێنیٚ.

دێڵە دێو/ "دڵی دەداتەوە" دێوی ئازیزم نارەحەت مەبە. دەمزانی کە بەو ڕەفتارو کارانە هیچ بە هیچ ناکریٚ، بەڵام قەیدی نییە.

نێرە دێو/ باشە. .

دێڵە دێو/ بەڵام شتێکی دی، بۆ بە خۆرایی خۆت ڕیسواو سوک دەکەی؟

ئەمانە ئامادەنین پێشوازیمان لیٚ بکەن، ئاخر ئەمانە کەمیان بە دەست ئێمەوە نەکێشاوە.

نێرە دێو/ ئەگەر کار وا بڕوات بازاڕی ئێمە ڕۆژ بە ڕۆژ کەساد تر دەبێت. .

دێڵە دێو/ دوور نییە دوای سەعاتێکی دی بێن و بڵێن بۆچی لە پشت دیواری ئاوایی ئێمەوە لاتان داوەو هەوارتان خستووە.

نێرە دێو/ حەدیان چییە.

دێڵە دێو/ دەڵێم وەرە تا زووە واز لەم باغو ئاواییە بێنن و بڕۆن، با بمێنیٚ بۆ جارێکی دی.

نێرە دێو/ جارێکی دی کەیە.

دێڵە دێو/ دەرفەتێکی دی، دزیٚ دز بیٚ هەڕەشەو زۆرە، ئێستا با بڕۆینە ئەو بەر هەواکەی خۆشە، بارگەی خۆمانی لێدەخەین، گۆشتی قوتوی حازرو ئامادەمان هەیە، تا حەز بکەی خواردنەوەمان هەیە, ئیدی چیت گەرەکە "بۆن بەزەوییەکەوە دەکات" ئەڵڵا لەو بۆنە خۆشە.

نێرە دێو/ بەڵام من جگە لە دڕکو داڵ چ شتێکی دی لێرەدا نابینم. .

دێڵە دێو/ قەیدی نییە، بە خۆڕایی خۆت سەخڵەت مەکە. شەوێك هەر شەوێکە.

نێرە دێو/ تۆڕەم، ناتوانم قەناعەت بە خۆم بکەم.

دێڵە دێو/ خۆت نارەحەت مەکە، دەتەویٚ بۆت ببم بە شابانۆی بیابان و گۆرانی شەوت بۆ بڵێم؟ بێگومان مانگیش هەڵدیٚو بە دیار دەکەوێت.

نێرە دێو/ "زەردەخەنەیەکی تەوسامێز" حەواست بڵاوە. مانگ بە ئاسمانەوەیە. ئێمە لەسەر زەوی پڕ دڕکو داڵین، لەسەر زەویدا دەبیٚ شتی زەمینی بە دەست بهێنریٚ. مانگ و گۆرانی شەو چ دادێکی ئێمە دەدات. .

دێڵە دێو/ بۆ دادمان نادات؟

نێرە دێو/ ئەوەت لە بیر بیٚ کە من و تۆ لە مێژە وازمان لەم جۆرە شتانە هێناوە. تەنیا عەودالی ئەو شتانەین کە فایدەی حازرو ئامادەیان هەیە. لەم باغو ئاواییەی کە پڕن لە شتی باش پتر چیت دەویٚ. "شتێکی بە بیردا دێت" ئەریٚ دەستە کلیلە جۆراوجۆرەکەت هێناوە؟.

دێڵە دێو/ بیرم نییە. دەبیٚ سەیرێك بکەم. "لە کاتێکدا لە نێو یەکێك لە سەبەتەکاندا بە دووی شتێکدا دەگەڕیٚ" بەڕاستی ئێمە بۆ ئەم چەند ساتە کورتەی تەمەنمان چ هەوڵو تەقەلایەکی سەیرو سەمەرە دەدەین، زنەگی پڕ زەحمەتو هەراو هەنگامەی ئێمە هەندیٚ جار خۆشمان دەترسێنیٚ.

نێرە دێو/ فەلسەفە ڕێسی مەکە، ئێمە فەلسەفەمان بۆ خەڵکانی دیکە دەوێ، ئەویش بۆ ئەوەی کە لە ڕێگەی فەلسەفەوە رام و گوێڕایەڵیان بکەین.

دێڵە دێو/ ئەدی ئاسودەیی؟ نابێ ئاسوودەییمان بۆ خەڵکی دیکەش بوێ.

نێرە دێو/ "پەستە" تۆ بۆ خۆت مشەماکان داگرەو بخەوە، هەقت بەسەر هیچەوە نەبێ.

دێڵە دێو/ "بەرەو گالیسەکە دەچێت، بە دووی شتێکدا دەگەڕێ" مشەماکان نا دۆزمەوە.

نێرە دێو/ "بە تەنێ دەڕوات و خەت و نیشانە دەکێشێت" ئێمە لە هەموو شوێنێك دا ژیانمان لە خەڵکی تاڵ کردووە، بەڵام ویستن بەڵگەو دەلیلی ناوێ، ئیدی ژیانیش هەر مەرگە، بەڵام ئەوەی کە گرینگە قۆناغ و ڕۆژگارێکە کە تێی داین و ئەویش جورئەت و قەراری دەوێ هەر شتێکت ویست دەبێ بە دوویدا بچیت "بەرەو گالیسکەکە دەڕوات".

دێڵە دێو/ دەتەوێ چ کارێك بکەی؟

نێرە دێو/ تۆ هەقت نەبێ، بۆ خۆت تەماشا بکە.

"چەند چیلکەیەك لە گالیسکەکە دادەگرێ. بە بەرد دەکەوێتە ئاگر کردنەوە، بەردێکی دی لە زەوی هەڵدەکەنێ، چیلکەکان ئاگر تێ بەردەدا. هەڵدەستێ و چیلکەکان بە گڕەکانەوە بەرەو باغەکەو ئەو چڵ و لقە درەختانە تووڕ دەدات کە لە دیواری باخەکەوە هاتوون بەم دیودا، چەند سێوێك دەکەوێتە زەوی، دێوەکە بە تامەزرۆییەکی سەیرەوە هەڵیدەگرێ و بۆ دەمی دەبات، هەندێ جار بە دێڵە دێویشی نیشان دەدا. ئەویش دەهاڕوژێ و بە هەڵبەزو دابەز دەکەوێتە دوی سێوەکان. هەردووکیان وەکو جووتە سەگێك کە بەردیان تێ دەگیرێ و لە حەژمەتاندا قەپ بە بەردەکاندا دەکەن، ماندوو دەبن. تۆزێ هێور دەبنەوە. نێرە دێو سەیرێکی دەورووبەر دەکات، ئەوجا دەڕوانێتە دێڵە دێوەکە، هەڵوەستەیەکی بێدەنگی".

دێڵە دێو/ چ هەواڵێك نییە، خەیاڵیان نییە دەرگامان لێ بکەنەوە.

نێرە دێو/ شارەزان، بە خۆڕایی هێزی خۆیان بە فیڕۆ نادەن. .

دێڵە دێو/ وەکو چڵی دار حەیزەران دەچەمێنەوە، بەڵام ناشکێن.

نێرە دێو/ بەڵام خۆم دەزانم چۆنیان دەشکێنم. "بەرەو پارچە بەردێکی گەورە دەڕوات. دەیەوێ بەزۆر هەڵیکەنێ ئاماژە بۆ دێڵە دێوەش دەکات کە یارمەتی بدات، بەردەکە بەرەو دەرکەی باخەکە هەڵدەدەن. دەوەستن. پشوویەك تازە دەکەنەوە، هەنگاوێ دێنە دواوە، نێرە دێو روو لە ئاوایی".

نێرە دێو/ چاوچنۆکانە، بێعارانە. منیش دەرگا لە ئەنگۆ دادەخەم و بە هەشتەکەتان لێ دەکەم بە دۆزەخ. "چراکانی ئاوایی هەڵدەبن. چەند پەنجەرەیەك دەکرێنەوە، دیسان دێهاتییەکان پەیدا دەبنەوە".

دێڵە دێو/ ئافەرین. زۆرم پێ خۆش بوو.

پیاوە دێهاتی 1/ بۆ واز ناهێنن؟ ئاخر ئێوە نەخۆشانتان لە خەو کردین، منداڵانتان ترساندین.

ژنە دێهاتی1/ ڕوح و جەستەی ناشیرینی ئەنگۆ لە ئازارو ئەزیەت زیاتر چ کارێکی تریان لێ ناوەشێتەوە؟

پیاوە دێهاتی 2/ لە بری ئەم کارانە بۆ خۆتان چاك ناکەن.

ژنه دێهاتی2/ ئەگەر ئێوە بەڕاستی میوانن و مەبەستێکی خراوتان نییە بۆچی دەتانەوێ بەزۆر بچنە ماڵی خەڵکییەوە. "دەنگی لێدانی سنج. وێنەکە بە نەگۆڕی دەمێنێ"

گوتیار/ تا ئێرە هەموو ئاگادار بووین کە دێوەکان پەنایان وەبەر چ کارێك برد، بەلام بەسەرهاتی ئەوان لێرەدا کۆتایی نایەت، هەوڵ و تەقەلای ئەوان بەرە بەرە تورەییان زیاد دەکات و وەکو مەیلەو شێتیان لێ دێت.

نێرە دێوەکە لەلایەکەوە بیری لای ئەوە بوو لە پاڵ ژنەکەیدا بخەوێ و ئیسراحەتێك بکات و لەلایەکی ترەوە بیری چوونە ناو باخەك لە کەللەی دەرنەدەچوو. دیوەکان بەملاو بەولادا دەچوون و لە حەژمەتاندا پاژنەی پێی خۆیان دەگەست و زەنگۆڵەکانی قەدیان لێ دەدا، وایان بیر دەکردەوە کە خەڵکانێك حسێب بۆ دەنگی زەنگۆڵەکان بکات. "گوتیار وەدەردەکەوێ".

دێڵە دێو/ "لەسەر زەوی کەوتووەو ماندوێتی بە سیماو چارەیەوە دیارە"

دەزانم کە منی زۆر خۆش دەوێ، بەلام بەستەزمانە بەم وەزع و حاڵەوە خۆی لە نێو دەبات.

نێرە دێو/ بۆچی ورینە دەکەی، چما ئەقڵت لە دەست داوە؟.

دێڵە دێو/ نەخێر ئەقلم لە دەست نەداوە، بەلام دەزانم هەموو ئەم کارانەی ئێمە گەوجانەیە، چونکە هەر چیمان هەیە بە جێمان هێشتووەو لە پێناوی نەوسنی و تەماحکاری زیاتردا هەوڵ دەدەین، بەلای کەمەوە دەبێ بە زەییەکمان بە خۆماندا بێتەوە.

نێرە دێو/ بە چەنەبازییەوە گرتوتە. لەبری ئەم قسانە هەستە شتێکم بۆ حازر بکە دەیاڵلا.

دێڵە دێو/ دیسان چیتە؟

نێرە دێو/ نازانم، وەك بڵێی تەنگەنەفەس بووم، یان شتێك لە ورگمدا گیر بووە، سەریشم دەسوڕێ، بە درێژایی دوێنێ شەو تۆزێ سپیناخ-ی کێویم خواردووە. دەڵێم ناکا ئەمانە بە چاویانەوە کردبم؟.

دێڵە دێو/ تۆ هەمیشە ئەو سەر سوڕانەت لەگەڵ بووە، چاری تۆزێ ئاوی نیلوفەرە.

نێرە دێو/ گوتت ئاوی نیلوفەر؟.

دێڵە دێو/ بەلێ، دەڵێم چۆنە تۆزێ ئاوی نیلوفەڕیان لێ وەربگرین.

نێرە دێو/ خراو نییە.

دێڵە دێو/ "بەرەو دەرگا دەچێت و ڕوو دەکاتە خەڵکی ئاوایی" ئەهای لەگەڵ ئێوەمە ها. ئاوی نیلوفەرتان هەیە؟ تۆزێ ئاوی نیلوفەرمان دەویست؟ "چەند پەنجەرەیەك ڕوناك دەبنەوە".

یەکێك لە خەڵکەکە لە پەنجەرەوە/ دیسان چی بووە؟.

دێڵە دێو/ ئاوی نیلوفەرتان هەیە؟ تۆزێکمان دەویست.

یەکێکی گوند لە پەنجەرەیەکەوە/ وا چاکترە بەبێ ئاوی نیلوفەر بخەون

یەکێکی دی لە پەنجەرەیەکەوە/ تەنگە نەفسییەکەتان هی جرت و فرتی خۆڕاییە.

دێڵە دێو/ "بەنێرە دێو" لەوە ناچێت چ شتێك لەمانە هەڵبکرێنرێ، وەکو دەردەکەوێ تا بەیانیش چاوەڕوان بکەین هەر بێ سوودە.

نێرە دێو/ دیسان کەوتییە چەنەبازی، ئەگەر ئەم رەنج و زەحمەتکێشانەی من نەبێ تۆ رەحەت و ئاسوودە نابیت، ئەسڵەن تۆ مایەی ئەم هەموو سەریەشەیەی.

دێڵە دێو/ بە خۆڕایی خوێنی خۆت تاڵ مەکە، ئەگەر هەندێ مەنتیقی بێ باشترە. خۆشێت نەبووین تا بە خۆت و خۆڕایی دەست لە ئاسوودەیی خۆمان هەڵگرین. بە خۆت دەزانی کە لەبەر کەمترین نارەحەتی دنیا تێك دەنەین و هەموو شوێنان غەرقی ئاوو ئاگران دەکەین، بۆچی هەندێ جار پایەی خۆمان فەرامۆش دەکەیت.

نێرە دێو/ هێواشتر قسان بکە، لەوەیە خەڵکی گوێیان لە قسەکانمان بێت.

دێڵە دێو/ مەترسە، چ کەسێك لێرە نییە. مەگەر لە بیرت نییە کە هێزێکی زۆرمان لەوبەری ئۆقیانووسەکانەوە خەریکی کۆکردنەوەی رژاو پژاوەکانی ئێمەن، فەقیرانە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە گیانیان لە پێناوی ئێمەدا لە سینی دڵسۆزی داناوە. بێ ئەوەی پرسیارێك بکەن یان بە تەمای شتێکی ئەوتۆ بن.

نێرە دێو/ مەبەستت چییە، منیش قەناعەتم وایە کە ئەوانە سەربازی باشن، چ ئەوان و چ خەڵکانی دی کە بە دڵ و گیان خەریکی کۆکردنەوەی باجن بۆ ئێمە. .

دێڵە دێو/ چ مەبەستێکم نەبوو. تەنیا لە بیری ئەوەدا بووم کە ئێستا بەم شەوە خەڵکی لە خەوی خۆشدان و چەندین ئاوایی ئارام و خۆش لەم دنیایەدا هەن، کەچی نارەحەتی و نیگەرانی ئێمە ئەوە نییە کە چ بەردێکمان لەبەر پێی بەندەیەکی خودا لا نەداوە، بەڵکو زۆر کەسیشمان نارەحەت کردووە، هەر بیرش ناکەینەوە کە بۆ ئەمە دەکەین؟

دێهاتییەك/ وا چاکە بەر لەوەی سەر لە نوێ بڕیار بدەن کە هەراو هەنگامە بنەنەوە، بۆ خۆتان بخەون.یان ملی رێ بگرن و برۆن.

دێهاتییەکی دی/ بەڵێ، بەسە، ئێمە شەڕمان لەگەڵ کەسدا نییە. زەرەرمان بۆ کەسیش نابێ.

نێرە دێو/ عوزر لە قەباحەت خراتر "بە دەست ئیشارەت بۆ بیابان دەکات" کەواتە ئەم رێگە دوورو درێژەی کە بریمان، و ئەم عەرەبانە فریشقەیەی رامان کێشاوە، لەسەر حیسابی کێ بێ.

دێهاتی 1/ ئێمە چ حیسابێکمان لەگەڵ ئێوەدا نییە، چ کەسێکیش دەعوەتی نەکردوون.

نێرە دێو/ ئەو قسانە بە گوێم دا ناچێت و بۆ دوا جار پێتان دەڵێم کارێکی وەهامەکەن بە جۆرێکی دی رەفتارتان لەگەڵ بکەین. .

دێڵە دێو/ ئێمە داوای شتێکی گەورەمان لێ نەکردوون کە بەو جۆرە خۆتان سەخڵەت دەکەن.

نێرە دێو/ دەزانن چییە... ئێوە نابێ بەم وەزع و حاڵەوە بمێنن. ئێمە دەکوژین، دەبڕین، هەموو شتێك وێران دەکەین. حاڵی بوون.

پیاوێکی دێهاتی 1/ بەڕاستی قسەیەکی ناهەقە.

ژنە دیهاتی 2/ بەڕاستی جماعەتی دێوان نا حاڵی و بێ مەنتیقن.

نێرە دێو/ "بە دێڵە دێو" گوێت لێیە چ دەڵێن، ئەمانە، ئەم هیچ و پوچانە. .

دێڵە دێو/ دڵ لە دڵ مەدە "بە خەڵکی ئاوایی" راست دەکات ئێوە چۆن دڵتان دێت بەمجۆرە بەگژ ئەم بەستەزمانەدا بچنەوە.

نێره دێو/ تۆ پێیان بڵێ.

دێڵه دێو/ چونکه ئێمه قسه ناکەین هیچ ناڵێین ئەمانه یەکجارەکیان کردووه، خەریکن دیقی پێ دەکەن هەی نەدیو بدیانه.

نێره دێو/ ئەوانه تورەیان کردوم.

دێڵه دێو/ ئەگەر دەرگاکان بکەنەوه چ دەبێ... ئێوه چۆن روح تەسلیم به عزرائیل دەکەن؟

نێره دێو/ خۆم دەرەقەت تان دێم.

دێڵه دێو/ دەم مەخه دەمی ئەو ناحاڵیانه دێوی ئازیزم، کەس دڵی به ئێمه ناسوتێ خۆمان نەبێ.

نێره دێو/ منیش ئیدی دڵم به کەس ناسوتێ.

دێڵه دێو/ باشه باش، (کەمێ دەنگی نزم دەکات" بەڵام ئێمه به جۆرێ دنیامان له خۆمانو له خەڵکی تاریك کردووه که خۆیشمان چاومان نابینێو هەرچی هەوڵیش دەدەین به هیچ کوێڕا ناگەین.

نێره دێو/ مەبەستت چییه؟.

دێڵه دێو/ مەبەستم ئەمەیه وێڕای ئەوەی که هەمانه ، نه دڵمان تێر دەبێو نه چاومان تێر دەبێو وەکو ئەوەی هیچمان نەبێ هەر له هەوڵو تەقەلای زیاترداینو دەڵێی بووین به گۆڕستانو هەرچییەکی تێ دەرێژن هەر پڕ نابن.

نێره دێو/ دیسان چیته. کتوپڕ کەوتییه وڕینه؟.

دێڵه دێو/ بۆ؟ هەر لەبەر ئەوەی ئەم قسانه دەکەم؟

نێره دێو/ تۆ ئەوشۆ شتێکت لێ دێ. دەبزرکێنێو قسەی بێ سەروبەر دەکەی.

دێڵه دێو/ ئەم قسانه بێ سەرو بەر نین دێوی ئازیزم

نێره دێو/ من ئەم شتانەم به گوێدا ناچێ. ئێمه هەر دەبێ بچینه ئەم ئاواییەوه.

دێڵه دێو/ ئاخر چۆن؟

نێره دێو/ ئاخرو ماخری ناوێ، تا ئێستا دیوته ئێمەمانان شتێکمان بوێو خەڵکی نەیدەن.

دێڵه دێو/ راسته ئەمه پێچەوانەی مەرامی ئێمەیه، بەڵام ئەوه عەرزو ئەوه گەز، جارێکی دی دووبارەی دەکەمەوه که هەر کارێك رێو جێی خۆی هەیه.

نێره دێو/ یانی چی رێو جێی خۆی هەیه، چما ئێستا عەیبی چییه؟.

دێڵه دێو/ عەیبەکەی ئەوەیه که ئەم گرێیه ئێستا ناکرێتەوه، با ئێستا بڕۆین، جارێکی دی بیبینەوه.

نێره دێو/ "قاقا لێدەداتو ددانەکانی دەردەخات" جارێکی تری چی ژنەکه، تۆ خۆت پێ بچووکه.

دێڵه دێو/ بەڵام بەم درەنگه شەوه؟

نێره دێو/ دەزانی چییه، تۆ بێ ئەقڵی به خۆڕایی قسەی زیاد مەکه. .

دێڵه دێو/ یانی هیچ نەڵێم، ها؟ ئاوات دەوێ.

نێره دێو/ نه ء هیچ مەڵێ، قسەکانی تۆ پەرێشانم دەکات. من پیاوم و دەبێ کاری خۆم بکەم.
"بەرەو لای گالیسکەکە دەڕوات و لە پشت گالیسکەکەوە سەندووقێکی هەندێ گەورە دێنێ"..
دێڵە دێو/ دیسان چ بیرێك لە کەللەی داویت؟
نێره دێو/ ئێستا وەختی کارە، ئیدی وەختی خەو نەماو دەبێ خۆمان بنوێنین. ئەمانە بە تەنێ بە گیریان هێناوین، خەروارێك کورتە باڵا بە خۆڕایی لەو سەندووقەدا نەخەوتوون. ئێستا حاڵییان دەکەم. تۆش هەستە بڕۆ بەرەو ئۆقیانووس و لەوێ "جەنگ"و "تەماح" گاز بکە بابێن.
دێڵە دێو/ باشە "بەرەو کۆتایی شانۆکە دەچێ و بانگ دەکات" جەنگی جەنگی، تەماح، تەماح هۆوو "دێڵە دێو دەگەڕێتەوە" بانگم کردن، هەر ئێستا پەیدا دەبن.
"لەم کاتەدا جەنگ بە شێوەو ڕوخسارێکی تایبەتییەوە، پەڵە خوێن بە جلەکانییەوە دەست بە چەك دێت و وەکو ڕێزو قەدرزانی کڵاوەکەی دادەگرێ".
جەنگ/ قوربان لە خزمەت دام، هەر کە جوابت نارد وێڕای ئەوەی لە جێیەکی حەساسدا بووم، خۆم گەیاندە حزورتان. "تەماح، بە پەلەو بە ورگی زلەوەو بە سەرو قژی لوول و بژەوە لەلای چەپی شانۆکەوە وەژوور دەکەوێ".
تەماح/ سڵاوی دڵسۆزانەی بەندەی تەماح لە ئێوەی سەروەران.
نێره دێو/ خۆشحاڵ بووم, کەواتە هاتن، چاوەنۆڕتان بووم
"پێدەکەنێ"
دێڵە دێو/ نەمگوت مایەی نیگەرانی نییە.
نێره دێو/ تاقەتی درێژدادڕیم نییە، هەر وەختیشمان نییە "سەیری ئاسمان دەکات" با یەکسەر بچینە سەر باسەکەمان "ئاواییەکەیان نیشان دەدات". تەماشایەکی ئەمانە بکەن، بزانن چۆن ئەمانە ئێمەیان خستۆتە ئەزیەتەوە.
جەنگ/ هەر خەمتان نەبێ قوربان منی نۆکەرتان لێرەیە و بفەرموون چ بووە؟
تەماح/ قوربان هەرچییەکتان دەوێ ئێمە لە خزمەتتانداین، هیچ بووە؟
نێره دێو/ جا دەتانەوێ چ ببێ؟ ئێمە لەم بیابانەداو بەم وەزعەو حاڵەوەین کەچی ئەو باخ و ئاواییە خۆشە لەوێیەو دەرگایان لە ڕوومان داخستووە.
دێڵە دێو/ ئەگەر کەمەر بەندەکانمان بکەینەوەو بە سەریاندا بدەین، دەبن بەمارو بەرەو خۆمان دەگەڕێنەوە.
نێره دێو/ تا زووە دەبێ دەست بەکار بن، حاڵی هەن؟
جەنگ/ "دەست بە سکی خۆیدا دێنێ" قوربان نەبێ بە بێ ئەدەبی لە ڕوتاندا، خۆ شوکر ئێوە کەمتان باغ و کۆشك و سەیرانگەو شوێنی خۆشتان نییە. "ڕوو دەکاتە تەماح و پێدەکەنێ".
نێره دێو/ "پێدەکەنێ" بەڵام هەبوون ڕێگە لە ویستن ناگرێ.
تەماح/ "بە پێکەنینەوە" کە قسەیەکی جوانە، لە ڕاستیدا وایە.
دێڵە دێو/ تیرەی دێوان تەبیعەتیان وایە کە تا گیان لە لەشیاندایە هەموو شتێکیان هەر بۆ خۆیان دەوێ.

تەماح/ لە دوا ئەنجامدا ئەگەر هەموو دنیاش بخەینە سەر ئەو باخ و کۆشکانە، هێشتا هەر کەمە.
"نێرە دێو و دێڵە دێویش بە پێکەنینەوە پشتیوانی ئەو قسەیە دەکەن".
نێرە دێو/ ئافەرین "دەست دەخاتە سەر شانی جەنگ" دۆستانی ئێمە مەسەلەکان لە ئێمە باشتر دەزانن، تۆش لە کوشتن و بڕینی دژمنانی ئێمەدا وەستای.
جەنگ/ قوربان، پەروەردەی دەستی ئێوەم. ئایا دەستوراتی ئێوە بە بێ ئامادەبوونی بەندە چ پێشکەوتنێکی بەخۆوە دیتوە، لە کام شەڕی سەدان ساڵی بەر لە ئێستادا گیانم لەسەر لەپم نەبووە، سەربازەکانمان کە هەمیشە سەرفراز بوون بۆ فیداکردنی گیانی ئازیزو نازەنینی خۆیان ئامادەو لەسەر پێ بوونەو هیچ درێغییەکیان نەکردووە.
نێرە دێو/ قسەی تۆیە.
دێڵە دێو/ "پشتیوانی دەکات" ئێمە لە ئەنگۆ رازینە. زۆر بە چاکی ئەرکی خۆتان ئەنجام داوە.
نێرە دێو/ بەڵام ئێستا کاتی ئەم قسانە نییە. خێراکەن، خۆشی و شادی ئەم خەڵکە بکەن بە شەڕو شێوەن. ئاگرێکی شەڕ بە جۆرێ هەڵگیرسێنن کە خۆشمان بێینە جۆش "بە قاقا پێدەکەنێ، جەنگ و تەماح-ش پێدەکەنن".
دێڵە دێو/ "بە خەڵکی ئاوایی" دەبینن کە کارەکە خەریکە دەگاتە کوێ لە بیرتان بێ کە خەتای ئێوە بوو کە هەموومانتان خستە ئەم زەحمەتەوە.
نێرە دێو/ وازیان لێ بێنە -ئیدی قسەی چ دەکەی "لەگەڵ جەنگدا بۆ لای گالیسکەکە دەڕۆن، نێرە دێو سەندقێك لە نێو گالیسکەکە هەڵدەگرێ، تۆزێ بەسەر دەستییەوە رایدەکرێ و پاشان بە پێکەنینەوە دەیداتە دەستی جەنگ، جەنگ زۆر بە ئەسپایی لەسەر عاردی دادەنێ، بە هێواشی دەرکەکەی لا دەبات، چەندین پیاویژیگەی دارین لە شێوەی سەربازدا لە سەندووقەکە دەردێنێ و لەسەر عاردەکە ریزیان دەکات".
جەنگ/ "بە نێرەدێوو دێڵە دێو" قوربان ئامادەن، هەر ئەوەندە ماوە فوویان پێدا بکرێ.
تەماح/ هەناسەی گەرمی ئەنگۆ دەیانخاتە جوڵە.
نێرە دێو/ "ئیشارەت بۆ دێڵە دێو دەکات، لە تەنیشت یەکەوە چۆك دادەن، بە هەناسەی دەنگدارەوە فوو دەکەنە پیاویژیگەکانەوە "قاقا لێدەدەن" پیاویژیگەکان، پەیکەرەکان بەن بەسەرباز، دەور دەوری ئێوەیە. رۆژ رۆژی جوامێری ئەنگۆیە. شەڕ دەستی پێکردووە "هەڵدەستن و هەنگاوێك بۆ پاشەوە دەچن".
جەنگ/ سەربازانی فیداکارو بە غیرەت، ئێمە حاڵی حازر لە وەزع و حاڵێکی یەکجار ناسك و چارەنووسسازو خەتەرداین شەرەف و ئابڕووی ئێمە بەندە بە فیداکاری ئێوەی سەربازانی دلێرەوە.
تەماح/ هەرنەپێش بۆ فەتح، ئەمڕۆ رۆژێکە هەرگیز لەمێژوودا فەرامۆش ناکرێ. "دەنگی تەپڵ، هەراو هەنگامەی مەیدانی شەڕ".
دێڵە دێو/ بەم درەنگەشەوە لە ئیسراحەت بووین. دەترسم دێوی ئازیزم دووچاری نەخۆشییەکی شوم بووبێ.

نێرە دێو/ "بە دێڵە دێو" حەز دەکەی یان نا، ئەم دیمەنەت پێ خۆشە؟ "بە جەنگ" ئەم سەربازانە دەڵێی دەرگای باخەکەیان کردووە بە نیشانە؟

جەنگ/ بەڵێ قوربان، بۆ ئەوەی لە وێوە بچنە ناو ئاوایی، بەڵام زۆر قایمیان کردووە.

دێڵە دێو/ دێوی ئازیزم لە حاڵێکدام نە بۆنی خوێن دێ نە بۆنی هیچ شتێکی دی، بەڵام لەوێدا کوندێك لە خۆڕا لەسەر بەردەکان هەڵنیشتووەو تەماشای ئێمە دەکات.

نێرە دێو/ لێگەڕێ با بێ، چ دەبێ؟ "هەڵوەستەیەك" ئەم تەماحە لە کوێیە؟ ئەهای تەماح لە کوێی؟

تەماح/ "دێتە پێشێ" لە خزمەتتدام قوربان. سەیری ئەم دیمەنە جوانەم دەکرد.

نێرەدێو/ چۆنە؟ دیارە دەبێ زۆر جوان بێ؟ "لە خۆشیاندا دەرەقسێ"

تەماح/ هەڵبەتە جوانە، من عاشقی بووم. "لە ئاواییەوە هەندێ شت دەگرنە سەربازەکان"

نێرە دێو/ وا چاکە بڕۆیو بەڵێنی بەخشینی میدالو خەڵات بە سەربازەکانمان بدەیت. بڕۆو هانیان بدە کە چاك بجەنگن، خۆت دەزانی کە دەبێ چ بکەی "هەردووکیان بە نائومێدی پێدەکەنن"

تەماح/ بە سەرچاو قوربان، هەر چۆنێ ئێوە بتانەوێ "بەرەو لای سەربازەکانو جەنگ دەڕواتو دەستەکانی دەجوڵێنێو لەبەر خۆوە شتان دەڵێ".

"دیمەنی شەڕو هەراو زەنا بەردەوامە. پاشان جەنگ بە نارەحەتیو هەناسە بڕکێ دێت بۆ لای نێرە دێو".

جەنگ/ قوربان، نازانم بۆچی سەربازەکان ئەوەندە گۆڕاون، هیچ ئارەزوویەکی شەڕیان پێوە دیار نییە، ورەیان باش نییە.

نێرە دێو/ یانی یاخی دەبن؟ تەماحم نارد تا ڕێکیان بخاتو تەماحیان بخاتەبەر، ئەگەر دەزانی هیچی لە دەست نایەت بە خۆت تەمبێیان بکە، ماتەڵی چیت، وەختەکە بە فیڕۆ مەدە.

جەنگ/ بەچاوان قوربان، هەر ئێستا بەڵام

نێرە دێو/ بەڵامی ناوێ، بڕۆ "جەنگ دەڕوات" شتێکی عەجایەبە، ئەم سەربازانە وا نەبوون، ناکا پیلانێکیان لە من کردبێ "بە دێڵە دێو" تۆ هەست بە چ دەکەی؟ .

دێڵە دێو/ نازانم چی بووە، ڕەنگە ماندوو بنو خەویان بێت.

نێرە دێو/ ماندووی چی، ئەوانە نابێ ماندوو بن.

دێڵە دێو/ من وای دەبینم کە لە ناچاریداو چونکە ناتوانن سەرپێچی حوکمی تۆ بکەن، لەو دیووەوە هەڵدێن.

نێرە دێو/ ئاخر بۆچی؟ ئەم کارە چ پێشینەیەکی نەبووە؟.

دێڵە دێو/ دێوی ئازیزم پێم گوتیت ئەمشەو وازبێنە، وازت نەهێنا، بەڵام قەیدی نییە، سەبر دەکەین با بزانین چۆن دەبێ.

تەماح/ "بە هانکە هانك دێتە بەرەوە" قوربان سەربازەکان نازانم چییانە، هەرچییەکیان پێ دەڵێم بە گوێیاندا ناچێت، دەڵێن ئێمە شەڕ کردنمان نایەت، لە پێناوی چیداو بۆ کێ شەڕ بکەین؟

نێرە دێو/ یانی ئێستا کارێك ناکەن.

تەماح/ نەخێر، تەنانەت خەریك بوو دەست بنەنە یەخەی ئێمە.

نێرە دێو/ بڕۆ بەڵێنیان بدەیە، پەیمانی چاكو بەڵێنی چەور، بڕۆ ماتەڵ مەبە. "دەڕوات"..

دێڵە دێو/ من وا هەست دەکەم ئەوانە ئاستی فامیدەییان چۆتە سەرێ.

نێرە دێو/ دەتوانی چ بکەین، ئەوانە دەستی ئێمەیان خوێندۆتەوە. دوور نییە ئەم بێ مروەتە ناشیرینانە هەر لێرەدا منو تۆش بکوژن.

نێرە دێو/ بەڵام ئەمەیان مەحاڵە. چما نازانی ئێمە دێوین.

دێڵە دێو/ دێوی ئازیزم من دەمێکە هەستم بەمە کردووە، بەڵام هیچم بە تۆ نەگوت، ئێمە ئێستا بە تەنیاین، کەسمان بە دەورەوە نەماوە، ڕۆژگار گۆڕاوە.

نێرە دێو/ کەواتە دوو ڕوویيت کرد، ها؟ یان هۆیەکی دیکەی هەیە. .

دێڵە دێو/ بە خۆڕایی خۆت سەغڵەتو نا ڕەحەت نەکەی، وا چاکە باوەڕ بە حەقیقەت بکەی.

نێرە دێو/ ئەی پەتیارە، وا دیارە تۆ سەرچاوەی هەموو ئەو شتانەی، تامی دەمم ناخۆشە، بێگومان مەعجونەکەم بە هەڵە خواردووە، ناکا شووشە مەعجونەکانت تێکەڵ کردبێ و دەرخواردی منت دابێ لەبەر ئەوەی کە هەناسەم لە کار کەوتبێ. جاران هەر کە فویەکم دەکرد هەموو سەربازەکانم دەخستە ڕێ کەچی ئێستا دەڵێی فووم لە کار کەوتووەو سەربازەکانیش فێری سەر پێچی بوون. .

دێڵە دێو/ هەرچی دەڵێی بیڵێ، بەڵام هیچ قسەیەك لەم قسانەت حەقیقەت نییە، بە خۆڕاییش بەینی خۆمان تێك مەدە. ئێمە هیچمان لێنە هاتووە، سەربازەکان گۆڕاون.

پیاوە دێهاتی1/ "لە یەکێك لە پەنجەرەکانەوە شتێکیان تێدەگرێ، دێڵە دێوو نێرە دێو دێنەوە سەرخۆ" دروستە، ئەمانە چاوو گوێیان کراوەتەوە.

ژنە دێهاتی 1/ ئەوانە ئیدی لەوە بێزار بوون کە لە پێناوی ئێوەدا ئەو هەموو کوشتو کوشتارە بکەن.

پیاوە دێهاتی2/ ئاخر بە چ ئەقڵێکەوە ئەوانە لە پێناوی ئێوەی دێوی بیابانیدا گیانی خۆیان بە فیڕۆ بدەن.

ژنە دێهاتی 2/ لەو ڕۆژە بترسن کە چاوو گوێی خەڵکی بکرێتەوە.

نێرە دێو/ بەسە، نامەوێ چیتر دەنگتان بژنەوم. تەماح لە کوێیە؟ "بە دێڵە دێو" خێرا گازی بکە.

دێڵە دێو/ ئەهای تەماح لە کوێی ، خێرا وەرە خزمەتی جەنابی دێو

تەماح/ "دیچێ و ئیکلامێك دەکات" فەرموو قوربان، لەوێندەر لە ناو جەرگەی مەیدانی شەڕدا سەرقاڵ بووم چەناگەم شکا، قوربانو وابزانم بێفایدەیە.

نێرەیە دێو/ ئەدی بە تۆم نەگوت "جڵەوی خۆی دەگرێ، بە دەنگێکی دۆستانەتر لەسەری دەڕوات" من پێم گوتیت تەنانەت ئەگەر پێویست بوو،دەتوانری چاو لە هەندێ بەرژەوەندیمان بپۆشین، سەربازەکان هەرچی کەموکوڕییەکیان هەیە بۆیان جێبەجێ بکەن، کاری بکە کە ڕازی

بن‌و نەکەونە سەر ڕێگەی سەرپێچی و یاغی بوون، ناشێت تۆش بۆ مەرامی خۆت بە کارت هێنابن؟

تەماح/ قوربان چۆنتان دەستوور فەرموو وام ئەنجامدا.

نێرە دێو/ باشە، بڕۆ بەردەوام بە "بە نە بە دڵی دەڕوات– نێرە دێو بە دێڵە دێو" پێم وایە کاتی ئەوە هاتووە کە دۆستانی دیکەمان ئاگادار بکەین، وا نییە؟.

دێڵە دێو/ بیرێکی خراو نییە "بەرەو گالیسکەکە دەڕوات، هەندێ دەنگ دەردێنێ، نەزانی، مەرگی، نەزانی، مەرگی، نەزانی مەرگی، هەڵوەستەیەك"

نەزان/ سڵاو قوربان،من نەزانم چ فەرمایشتێکتان هەیە؟ هەر ئەمرێکتان لە مەڕ بێ مێشکی و گەوجی خەڵکانەوە هەیە بفەرموون، تا ئەنجامی بدەم، من ئەو کەسەم کە چاك‌و خراو لە یەك تەرازوودا دادەنێم‌و خراو بە چاك‌و چاك بە خراو پیشان دەدەم‌و خۆم بە هەموو ئاگرێك دادەدەم‌و هەموویان ناچاری ملکەچی‌و گوێ ڕایەڵی دەکەم.

نێرە دێو/ لە وەختی خۆیدا گەییشتی. بڕۆ وا دیارە ئەو ناوەندە زۆر پێویستی بە تۆیە. بڕۆ و بزانم چ کارێك دەکەی "نەزان دەڕوات. لەلای گالیسکەکەوە مەرگ دێتە پێشێ‌و دەموچاوی هەر دەڵێی ئێسکە پەیکەرە. عەبایەکی تۆخ‌و کلاوێکی لە ڕەنگی عەباکەی لەبەرە، داردەستێکی درێژیش بە دەستێکییەوەیە".

نێرە دێو/ بەخێرهاتی دۆستی ئازیزمان، چەند شوێنی بە تاڵت بە ئێرەوە دیارە، چاوەڕوانی تۆ بووین.

مەرگ/ من لە خزمەتام قوربان، بە خۆتان باش ئاگادارن کە منیش سەرم قاڵە، بەڕاستی دەرفەتی ئیسراحەت زۆر کەمە، کاریش دوایی نایەت، نەخوازەڵڵا ئەم کارەی ئێمەش.

نێرە دێو/ "پێدەکەنێ" ڕاستە، هەق بەتۆیە. بەڵام لە دەرفەتێکی دیکەدا دادەنیشین‌و پێکەوە گفتوگۆو دەردە دڵ دەکەین، بەڵام هەنوکە کاتی کارو فیداکارییە دەزانی چ خەبەرە؟ واچاکە زووتر بچیتە مەیدان‌و ئەوەی دەیزانی بینوێنی، بڕۆ بزانم چ دەکەی؟

مەرگ/ بەڵێ قوربان، پاشان دێمەوە خزمەتتان "دەڕوات".

دێڵە دێو/ "بەرەو گالیسکەکە دەچێت. ئاو دەخواتەوە، ناڕەحەت دێتە بەرچاو، بە نێرە دێو" ئاو دەخۆیەوە؟

نیرە دێو/ نە ء، مێشکم خراپ بووە، هەموو جۆرە بیرێکی تاڵ‌و بێهودە بە کەللەم دادێ‌و دەچێتە دەرێ.

دێڵە دێو/ ئێ بیرمەکەوە.

نێرە دێو/ ئاخر بە دەستی خۆم نییە. چۆنە جەنگ بانگ بکەی‌و پرسیاری وەزع‌و حاڵی لێ بکەین‌و هەندێ نەخشەشم بە بیردا هاتووە دەمەوێ لە گەڵیا باسی بکەم. یەکێك لەو بیرانە ئەوەیە کە هەموو زەلامۆکەکان پێکەوە بخەینە گەڕ، پاشان.

دێڵە دێو/ من حاڵم باش نییە، دڵم تێك هەڵدێ‌و سەرم دەسووڕێ، ئەگەر کارێکت هەیە، وا چاکە بە خۆت گازی بکەی.

نێرە دێو/ دیسان چیتە، تۆ هەمیشە لە کاتی راوا.... "بە پەستی بەملاو بەولادا دەڕوات. دێڵە دێو بەبێ تاقەتی سەیرێکی پاشەوەو سەیرێکی ئاوایی دەکات، هەندێ شت لە ئاواییەوە بەسەرو روویدا دەڕێژرێ، لە نزیکی گالیسکەکە دادەنیشێت" ئەهای جەنگ، ئەهای لە کوێی "هەڵوەستە" بۆ وەڵام نادەیەوە هەی نەحەلەتی "بەرەو لای گالیسکەکە دەڕوات، بە دووی شتێکدا دەگەڕێ. نایدۆزێتەوە. دەگەڕێتەوە. تەماح لە کاتێکدا کە خۆی کۆ دەکاتەوە لە حاڵی هەڵاتندا دەبینرێ، نێرە دێو دەبینێ، بەڵام بەلەز رەت دەبێتو لەسەر شانۆ دەچێتە دەرێ". ئەهای بوەستە بزانم "نێرە دێو بۆ ساتێك سەیری دەکاتو دیسان سەرگەرمی گالیسەکە کە دەبێت، ئاوڕ لە دێڵە دێو دەداتەوە" بینیت، خەریك بوو هەڵدەهات.

دێڵە دێو/ بەڵێ دیتم خەریك بوو هەڵدەهات "بە تەوسەوە پێدەکەنێ. لەم کاتەدا نەزان وەژوور دەکەوێو تەماشایەکی دەوروبەری دەکاتو دەچێتە دەرێ". هێی، ئەم یەکەش. "جەنگ-ش بە شەپرێوی وەژوور دەکەوێو لەو سەرەوە دەچێتە دەرێ".

نێرە دێو/ هێی بوەستە بزانم دەتەوێ کێوە بچیت. ئەدی تەگبیری ئەمانە چییە "هەندێ شتان بە تورەیی لە گالیسکەکەوە دەڕێژێتە دەرێ، رەفتارو کرداری بەرە بەرە شێوەی شێتان دەگرێتە خۆ، بەلەقە بەر دەبێتە سەندوقەکان. هەڵبەزو دابەز دەکاتو زەنگۆڵەکانی دەزرنگێنەوە، بوتڵێك لە گالیسکەکە دەردێنێو بینی پێوە دەنێ" ئەمانە هەموویان هەڵاتن، دڵم لە قەڵافاتی ئەم زەلامۆکانە تێك هەڵدێ "لاقی هەڵدەبڕێو پێی لەسەر سەری یەکێکیان دادەنێ، بە دێڵە دێو" دەڵێم ناکات من گوناحێکم کردبێو ئەمە سزاکەی بێ "پێدەکەنێ" وەك بڵێی بەرە بەرە هەموو شتەکان ئارام ببنەوە، دێڵە دێو ئەوە تۆ لە کوێی، خەوتوی یان بە خەبەری، خۆ هێشتا رۆژ نەبووەتەوە؟ "ماتو ماندوو لە تەنیشت ژنەکەیەوە لەسەر عاردی دادەنیشێت" دەنگی هەناسەت دەژنەوم. چ زوو خەوت لێکەوت. "باوێشك دەدات، کێشمانێکی خۆی دەدات، مەرگ بە هەمان سیماو قەڵافاتەوە وەژوور دەکەوێ، نیگایەکی دەوروبەری خۆی دەکات، لەولاوە دەوەستێ، نەزان-ش دێتو هێواش هێواش وەدەردەکەوێ، مەرگ دێتە دیار نێرە دێو و دێڵە دێو، حازرو چاپوك هەندێ هەوڵ دەدات. دەنگی مۆسیقا- شانۆ تاریك دەبێت".

گوتیار/ "بەیانی کە هەتاو هەڵهاتو هەموو شوێنێکی روناك کردەوە، خەڵکی ئاوایی دەرگاکانیان کردەوە، کە تۆزێ گەڕان لە رەخی کەندێکی پیسدا کەلاکی دوو دێویان بینی کە بەتەنیشت یەکەوە کەوتبوونو تۆپی بوون. وەدەر دەکەوێ".

سەرچاوە:
مجموعە نمایشنامە
دوستی، سەماهی، غولو ابادی.
شیروموش.
منصور خلج
چاپ اول 1370
مرکز هنرهای نمایشی وزارت فرهنگو ارشاد اسلامی

# له جیاتی پێشەکی

حەمە کەریم عارف

((1))

وشەو بەرد، ئەو دوو شتە گرنگە بوون کە مرۆڤی کۆن لە پاش خۆی بە جێیهێشتن و بوونە یارمەتیدەر بۆ ناسین و دۆزینەوەی شارستانیەتی مرۆڤ و دیاریکردنی قۆناغە هەوەڵینەکانی هزری تیرەی بەشەر. جا ئەگەر بەرد لە بەردەم فاکتەرو هۆکارە سروشتییەکاندا خۆی نەگرتبێ و زۆربەی فەوتابێ و رێژەیەکی زۆر کەمی مابێتەوە بۆ ئەوەی ببێ بە گەواهی موعجیزەکاری ئاوەزی بەشەری و داهێنانەکانی، ئەوا وشە لە ویژدانی مێژوودا بە زندوویەتی ماوەتەوە تا ببێ بە کلیلی کردنەوەی دەرگای هەقیقەتەکان و گەورەترین سەرچاوەی تیشکدانەوەی هەست و هزر لە بەرە بەیانی مێژووەوە تاکو ئەمڕۆ، بۆیە هیچ سەیر نییە کە وشەی ئەفسانە لەلای گریکەکان (Myth) یان (Mythos) مانای وشەی درکێنراوی گەیاندووە، دیارە (درکێنراو) لێرەدا هەموو درکێنراوو درکاندێکی ئاسایی ناگرێتەوە، بەڵکو لەم بوارەدا شێوەو مەبەستی هەرە تایبەتی هەبووە، هەم وشەکە وشەیەکی جادووییەو هەم ئەرکەکەشی ئەرکێکی جادووییە. کەواتە ئەفسانە هەموو وشەیەکی درکێنراو نییە.

بەڵکو وشەیەکە هەست و سۆز تیایدا زاڵە بەسەر ئەقڵ و ئاوەزدا، وشەیەکە پڕە لەو وێنانەی کە دەچنەوە سەر کانگەی لاشعوری دەستەجەمی، چونکە ئەگەر ئەم وشە جادووییانە، وشەی سەرڤەو سەرڤەو ناچیزە بوایەن، لە ویژدانی مرۆڤدا نەدەمانەوەو پشتاوپشت بۆ مرۆڤ نەدەمانەوەو شێوەو فۆرمی ئەفسانەیی جیاوازیان وەرنەدەگرت. بە هەر حاڵ مرۆڤایەتی قەرزارباری وشەیەو بە تایبەتی ئەم وشە جادووییانە هەر لە هەوەڵین قۆناغەکانی شارستانیەتی مرۆڤەوە، لەگەڵ مرۆڤدا هاتووەو هونەرمەندان لە چاخە جۆراوجۆرەکاندا وەکو سەرچاوەی ئیلهام و سەرۆی داهێنانە هونەری و ئەدەبییەکانی خۆیان تەمەشایان کردووەو مامەڵەیان لە تەکدا کراوە. هزرڤانانیش لە دێرزەمانەوە کەوتوونەتە پرس و جۆ دەربارەی بایەخ و رۆڵی ئەفسانە لە مێژووی هزری بەشەریدا. وا دیارە ئەفسانە لە جەوهەرو کرۆکی خۆیدا، وێڕای جیاوازی فۆرم و شێوەی، بینای هزرو بیری بەشەری لە هەر شوێن و کات و سەردەمێکدا کەشف دەکات و بەرجەستەی دەکات، هەڵبەتە بەرجەستە کردنێکی ئەفسانەیی نەك ئاسایی.

((2))

ئەفسانە جۆرە چیرۆکێکی هەرە تایبەتییەو بە ئاسانی لەگەڵ جۆری خوراق یا جادوییدا تێکەڵاو نابێ. ئەفسانە حیکایەتێکە گوایە رووداوی زۆر کۆن دەگێڕێتەوە، دیاردە گەردوونی و لە دەسەڵات بەدەرەکان شرۆڤە دەکات و هۆی سەرهەڵدانیان لێك دەداتەوە. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە هەر حیکایەتێك لە رەگ و ریشەو بنج و بناوانی شتان گەڕا ئەوە ئەفسانەیە، چونکە پێویستە ئەفسانە پاشخانێکی مێژوویی هەبێ، واتە دەبێ قارەمانە سەرەکییەکانی لە زومرەی خوداوەندان بن. ئەگەر حیکایەتێك خوداوەندو نیمچە خوداوەندانی تێدا نەبێ، ئەوا لە خانەی ئەفسانەدا جێی نابێتەوەو دەچێتە خانەی جۆرە چیرۆك و حیکایەتێکی میللی دیکەوە.

بە هەر حاڵ ئەفسانە وەکو گوزارشتێکی رەمزی پەیوەستە بە مێژووی ناوچەیی تیرەو تایفەو گەلانەوە، هەر بۆیەش ئەفسانە لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی دیکە جیاواز بووە، هەڵبەتە ئەمە یەکێکە لەو رایانەی دەربارەی ئەفسانە گوتراوەو دەگوترێ. دیارە زۆر راوبۆچوونی دیکەش هەن یەکێك لەوانە ئەوەیە کە بنج و بناوانی ئەفسانە بریتییە لە وردبوونەوە لە سیستەمی گەردوون و لە دروست بوونی مرۆڤ و ئەمەش بابەتێك بووە هەر لە کۆنی کۆنەوە مرۆڤی مژۆل کردووەو بووە بە کەڵکەڵەو خولیای مرۆڤ و دەیان پرسیاری لەلا دروست کردووە وەکو: من کێم؟ لە کوێوە هاتووم و ئەم گەردوونە چۆن دروست بووە؟ بوونەوەران بۆ بەم شێوەیەن؟

هەڵبەتە ئەم جۆرە رامان و تێفکرین و کەڵکەڵەیە رەگی دەچێتەوە سەر فەلسەفە، بۆیە هەوادارانی ئەم بۆچوونە پێیان وایە: ئەفسانە دەکاتە هەوەڵین قۆناغی تێفکرین و هزرینی فەلسەفی. ئەم هەوەڵین قۆناغی فەلسەفییەش، وەکو قۆناغەکانی دیکەی فەلسەفە، لە ئەنجامی رامان و هزرین لە دیاردەکانی گەردوون و پەیوەندی ئەم دیاردانە بە ژیانی مرۆڤەوە لەسەر رووی زەوی، دروست دەبێ و هەڵدەقوڵێ. رامان، سەرسامی لێدەکەوێتەوە، سەرسامی پرسیاری لێدەکەوێتەوەو پرسیاریش وێڵی دوای وەڵام دەبێ و تا وەڵام نەدۆزرێتەوە دەروونی مرۆڤ کەوی نابێ و ناحەوێتەوە. جا مرۆڤی کۆن کە لە ئەفسانەکانی سەرەتای خۆیدا خوداوەندان و ململانێی نێوان خوداوەندانی وێنەگرتووە، ئەمەی تەنیا لەبەر خاتری بایەخدان بە خوداوەندان نەکردووە، بەڵکو بۆیە ئەمەی کردووە چونکە خوداوەندانی بە سەرچاوەی دیاردەو رووداوە گەردوونییەکان و رێکخەری ئەو دیاردە گەردوونیانە زانیوە. مرۆڤ کە پرسیاری سەرچاوەی ئەو دیاردە گەردوونیانەی کردووە کە خێریان بۆ هێناوە وەکو باران و کشتوکاڵ و روناکی و هەروەها کە پرسیاری سەرچاوەی دیاردە گەردوونییە شەڕانییەکانی وەکو هەورە تریشقەو قات و قڕی و بوومەلەرزەی کردووە، هەر هەموو ئەم دیاردانەی، بە خێرو شەڕیانەوە، بە هێزی غەیبانییەوە بە ستوەتەوە، واتە ئەو هێزانە زاڵن بەسەر ئەو دیاردانەوەو ململانێی توند لە نێو ئەو هێزانەدا هەیەو زۆر جار ئەم ململانێیانە بە جۆرە هاوسەنگییەك لە نێوان خێرو شەڕدا دەشکێتەوە.

کەواتە ئەفسانە بەم پێیە هۆیەکە لەو هۆیانەی مرۆڤ ویستویەتی لە رێگەیەوە جۆرە شەقڵێکی هزری بە ئەزموونی خۆی ببەخشێت و ترس و نیگەرانی لە خۆی بڕەوێنێتەوە.

((3))

دیاره راوبۆچوونی جیاواز لەمەڕ ئەفسانەو سەرهەڵدانی ئەفسانە هەن، بۆ نموونە ماکس مولەر کە دیارترین زمانەوانی سەدەی نۆزدەیەمە پێی وایە ئەفسانە نەخۆشییەکی زمانەوانییە، مرۆڤی سەرەتایی لە ڕێگەی ئەفسانەوە دەدوا نەك لە ڕێگەی زمانەوە، چونکە هێشتا توانای ئەوەی پەیدا نەکردبوو زمان بۆ دەربڕینی حەزو ئارەزووە پەنهان و نادیارەکانی خۆی بەکار بێنێ، بۆیە وای هاتۆتە بەرچاو کە تیشکی خۆر قامکی خواوەندەو هەوری باران ئامێز گوانی پڕ شیری چێڵە. بەم پێیەو لە ڕوانگەی ئەمانەوە ئەفسانە دەکاتە قۆناغێکی پاشکەوتووی هزرو فیکری مرۆڤانی. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە گاڤێ مرۆڤ توانای پەیدا کردو توانی ڕاستەوخۆ زمان بەکاربێنێ بۆ دەربڕینی هەستی خۆی دەرهەق بە گەردوون و ئەو شتانەی مامەڵەیان لە تەکدا دەکات، ئیدی ئەفسانە بایەخ و ئەرکی خۆی لە دەستدا.

جیمس فریزر-یش کە ڕابەری قوتابخانەی تطویریة-یە لە ماکس مولەر پتر دەست دادەگرێت و پێی وایە تیرەی بەشەر لە گەشتی پەرەسەندنی شارستانی خۆیدا بە سێ قوناغاندا تێپەڕیوە: 1- قۆناغی سیحرو جادوو، 2- قۆناغی ئایین، 3- قۆناغی زانست. بەم پێیە ئەفسانە پەیوەستە بە قۆناغی جادووەوە. جادوش نمایشێکی ڕەمزی جۆرە سرووتێکی تایبەتیە کە مرۆڤی سەرەتایی بۆ دوور خستنەوەی شەڕ لە خۆی و لە جەماعەتەکەی و بۆ وەدەستهێنانی خێر بۆ خۆی و بۆ جەماعەتەکەی ئەنجامی داوەو پاشان و لە قۆناغێکی دواتردا ئەم نمایشەی گێڕاوەتەوەو ئەفسانەی لێکەوتووەتەوە.

مالینوفسکی ڕێبەری قوتابخانەی وەزیفی، بە پێچەوانەی فریزر-ەوە پێی وایە جادوو بەند نییە بە قۆناغێکی سەرەتایی و هۆڤیانەی شارستانیەتەوە، بەڵکو جادوو ئاوێتەو تێکەڵاوی چەلەنگی و چالاکیە ڕوحی و هزرییەکانی دیکەیە کە دەکاتە ئایین و زانست. جادووش ئەرکی خۆی هەیەو پێداویستییەکی سایکۆلۆژی مرۆڤ پاراو دەکات، وەکو چۆن ئایین ئەرکی خۆی لە ژیانی شارستانیدا هەیە، واتە ئەفسانە تەنیا گوزارشت نییە لە قۆناغی پاشکەوتنی هزری کە قۆناغی جادووە، بەڵکو پەیوەستە بە هەموو ئەو چالاکی و چەلەنگییە فیکری و کۆمەڵایەتیانەی شان بە شانی دێن.

بە هەر حاڵ ناکرێ هەر هەموو ڕاوبۆچوونە جیاوازو ناکۆکەکان لەمەڕ ئەفسانە بخەینە ڕوو، بەڵکو دەکرێت وەکو ئەنجامگیرییەکی گشتی بگوترێت ئەفسانە هەوڵێکی مرۆڤانییە بۆ حاڵی بوون لە سیستەمی گەردوون.

پاشان کە توێژەران دەرکیان بەوە کرد کە ئەفسانە گەلێك مانای پەنهانی لە ڕازو ڕەمز پێچراوەی تێکچڕژاوی لە خۆ گرتووە، کەتنە بایەخدان و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەو کەشفکردنی ئەم ڕەمزە ئەفسانەییانە، کە پاش توێژینەوەی قووڵ و ورد بۆیان دەرکەوت کە ئەفسانە تەنیا خەیاڵ نییە، یان خەیاڵی بێ جڵەو نییە، بەڵکو گەلێك فاکتەرێن دەروونی و شارستانی ئاڵۆز ڕۆڵی تێدا دەگێڕن، بۆیە قوتابخانە سایکۆلۆژییەکانیش کەوتنە شرۆڤەو تەفسیری خۆیان بۆ ئەفسانە، ئەفسانەش وەکو خەون، بەرجەستە بوونی هاندەرەکانی ناخن. مادامێکی خەون ڕەنگدانەوەی کێشە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکانی مرۆڤ بێ، کەواتە ئەفسانەش لە ڕوانگەی قوتابخانەی

شیکاری دەروونییەوە، لە سەرووی هەموویانەوە فرۆید، هاوتای خەونە، ئەگەرچی رەگەزی تەئلیفی تێدا رێك و پێکترە.

زندوویەتی ئەفسانە لەوەدایە کە وەکو رەمزێکی جەماعی لە ویژدانی کۆمەڵدا گیرساوەتەوەو مرۆڤ هەمیشەو بەردەوام بەشێك لە خودی خۆی تێدا دەبینێتەوە.

کەواتە ئەفسانە حیکایەتێکی بە ئانقەست دروستکراو نییە، بەڵکو لە ئەقڵ و ئاوەزی مرۆڤدا دەژی و دەکرێت وەکو دەقێك لە میانەیەوە بینای ئەقڵی بە شەری کەشفبکریٚ.

هەڵبەتە لیفی شتراوس-ی پێشەنگی تەفسیری شارستانیانەی ئەفسانە، رای تایبەتی لەسەر ئەفسانە هەیەو وەکو دەقێکی زمانەوانی لێی دەڕوانیٚ و پێی وایە هزری سەرەتایی قۆناغێك لە قۆناغەکانی پەرەسەندن نانوێنیٚ، بەڵکو لۆجیکی هزری تیرەی بەشەر لە هەموو زەمان و شوێنێکدا دەنوێنیٚ و دەگەیەنیٚ و بیری سەرەتایی لەلای لیفی شتراوس هێڵە بنەڕەتییەکانی فیکری بەشەری شارستانی-مان پێشکەش دەکات و، هەروەها رای وایە کە پەیوەندی نێوان شێوەکانی گوزارشت و شارستانیەتی کۆمەڵگە بەر لە هەر پەیوەندییەکی دیکە، پەیوەندییەکی بینائییە. بێگومان میتۆدی رێچکەی بینائی لە شیکردنەوەی ئەفسانەدا وەکو رێچکەی سایکۆلۆژی، رواڵەت دەبەزێنیٚ بۆ ناوەوە تا لەوێوە جۆری گشتی رەفتارو هزرین هەڵێنجیٚ، ئیدی کار گەییە ئەوەی ئەفسانە وەها هەڵسەنگێنریٚ کە بینای هزری مرۆڤانی و تایبەتمەندییەکانی کەشف دەکات. هەڵبەتە ئەم بۆچوون و رایانەی لیفی شتراوس-ش دوا بۆچوون نین و نابن و وەکو هەر راوبۆچوونێکی دی رەخنەو تەنانەت رەتکردنەوەش هەڵدەگرن، واتە بۆچوونەکانی لیفی شتراوس لە ئیرادو رەخنە بەدەرنین. یەکێك لەو ئیرادانە ئەوەیە کە کاتیٚ ئەفسانە شیدەکاتەوەو دەیەوێت ناکۆکییەکانی ناو دەقەکان دەربخات و بەمەبەستی لابردنی ئەو ناکۆکی و نا تەباییانە چارەسەرێکی مامناوەندی پێشکەش بکات، ئەوا بەم کردارە شیلەی ئەفسانەکە دەگریٚ و تویٚ دەدات و شێوە هونەری و ئەرکە ئەستاتیکییەکەی ئەفسانە لە خودی ئەفسانەکە دادەبڕێت. دیارە ئەمەش کارێکی یەجگار خراوە، چونکە ئەرکی ئەستاتیکی بەلای کەمەوە هەستکردن بە یەکێتی بوون دەخولقێنیٚ، پەیوەندی روحی لە نێوان مرۆڤ و گەردووندا تازە دەکاتەوە هەڵبەتە ئەم بۆچوونە بە قازانجی رایەکانی (کاسیرر)دا دەشکێتەوە کە پێناسەی ئەفسانەی بەوە کردووە کە دەکاتە یەکێتی فۆرمی بینائی روحی مرۆڤانی، هەر بۆیەش داوای یەکێتیی تەفسیری ئەفسانەی کردووە، ئەو تەفسیرەی لە چوارچێوەی یەکێتی ئەرك و یەکێتیی ژینگەی شارستانی و یەکێتیی فۆرم و بینادا دەیخاتە بەر وردبینی و لێکدانەوەو شرۆڤەوە.

((4))

مرۆڤ کە شتی بینیوە هەستی پێکردووە، بەڵام ئەم هەستکردنە بە تەنیا سوکنایی پێنەبەخشیوەو عەودالّی مانا بووە، بۆیە لە قۆناغی حسییەوە چووە بۆ قۆناغی مەعنەوی، لە گشتەوە بۆ تایبەت، لە شتی روون و دیارەوە بۆ شتی ئاوس بە ناوەڕۆکی پەنهان... مرۆڤ بوونە وەرێکی فیکردارە، لە جیهانێکی تەژی سۆزو ترس و ئارمانج و وەهم و خەیاڵاندا دەژی. ئیدی ئەو

جیهانـە دەیجـوڵێنێ‌و ناچـاری دەکـات لـە قـاڵبی زمانەوانیـدا خـۆی پـەروەردە بکـات‌و خـۆی بگێڕێتەوە، جا ئەم پرۆسەی خۆ پەروەردەکردن‌و خۆ گێڕانەوەیە، لـە وێنـەی هونـەری، لـە ڕەمـزی ئەفسانەیی‌و سرووتی ئایینیدا بەرجەستە بووەو خـۆی نوانـدووە. ئـەم دەسـتکەوتانەش پێکـەوە تـۆڕی ڕەمـزان پێکـدێنن، جا ئـەم حەقیقەتـە جیهـانی مـرۆڤ لـە جیهـانی حـەیوان جـودا دەکاتـەوە. حەیوان زۆر زاتیانە تەعبیر لـە خـۆی دەکات، بـەڵام مـرۆڤ لـە میانـەی بابەتـەوە گوزارشـت لـە خـۆی دەکات. واتە لە میانەی وێنەو ڕەمزێن بەرجەستەوە. جا بەم پێیە دەکرێت بگوترێ مرۆڤ نەك هـەر حـەیوانێکی ئەقڵـدارە، بـەڵکو حـەیوانێکی ڕەمزسازیشـەو ئـەقڵی بەشـەری بـە سروشـتی خـۆی پێویستی بە ڕەمزانە، چونکە ئەو ڕەمزو ڕەمزسازییە، ژیانی مرۆڤ دەوڵەمەند دەکات‌و گوڕو تینی پەرەسـەندن‌و تازەبوونـەوەی دەداتـێ.. بۆیـە ئەفسـانە زادەی زانیـارێن مرۆڤانییـەو هـەر توێـژەرێك بیەوێ دەلالەتی ڕەمزی ئەفسانەیی کەشف بکات، دەبێ ئەو زانیاریانـە دەربکـات تـەنیا لـە ڕێگـەی شرۆڤەو شەرحی ئەرکی ڕەمزەوە تەفسیری ڕەمز بکات.

بـە هـەر حـاڵ ئەفسـانە بـە هێزتـرین بەڵگـەی بلیمـەتی مرۆڤـە. ئـەو مرۆڤـەی تـوانی گـەردوون شـەق بکات، بەوپەڕی ئازادییەوە موناقەشەی بکات، لـە قوڵایی هەسـتی خۆیشـیدا هەسـت بـە یـەکێتیی گەردوون‌و کەون بکات.

------------------

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

1- مضمون الاسطورة في الفكر العربي، د. خليل احمد خليل ط 1- 1973

2- مغامرة العقل الاولي/ فراس السواح ط4- 1985

3- الموسوعة الصغيرة (54) – 1979 الاسطورة/ د. نبيلة ابراهيم

# چەند چیرۆکێك
# لە ئەفسانەی یۆنانییەوە

(1)

## شاری تەرِوادە و لایومیدون پاشا

لیو، لە نێو حەوشەدا تۆپێکی بە دەستەوە بوو، تۆپەکەی هەڵدایە حەواو دەیگرتەوە، لیای خوشکی سەیری دەکردو دایکیشی کتێبی دەخوێندەوە. لیو، رووی کردە خوشکەکەی و گوتی:

– ئەگەر بتوانی تۆپەکەم لێ بگریتەوە، بیست لیرەت دەدەمێ.

دایکی سەری لەسەر کتێبەکە هەڵبری و گوتی: ئەدی ئەگەر بیست لیرەت نەبێ چ دەکەی؟.

– بەلاّم من دڵنیام کە "لیا" ناتوانێ تۆپەکە بگرێتەوە و لێم بسەنێ"!

– ئەدی ئەگەر بە رێکەوت لێتی بسەنێ چ دەکەیت؟ هەنگینێ دەبێ وەکو لایومیدون بکەیت.

– دایکە، لایومیدون کێ بوو؟

– پاشا بوو.

– چی دەکرد؟

– پاشایەك بوو گفتی دەداو، قسەی خۆی نەدەبردە سەر.

– سەربوری لایومیدونم بۆ باس ناکەیت؟

پاشان دایکی، بۆی باسکرد:

لە عەیامو زەمانی زۆر کۆندا لە کیشوەری ئاسیادا، لە نزیکی دەریادا، شارێك هەبوو پێی دەگوترا تەراودە، پاشای تەراودە نێوی ئیلوس بوو. ئەم پاشایە لە بەزرترین شوێنی شاردا کوشك و بارەگای بۆ شازادان و ماڵ و خانووی بۆ سەربازان و پەرستگەی بۆ خەڵکی تەراودە دروست کردبوو.

گەرەکێك لەم شارەدا بوو، نێوی ئیلیون بوو، ماڵەکانی ئەم گەرەکە لە هی گەرەکەکانی دی گەورەترو جوانتر بوون، شەقامەکانی بەرین تر بوو، پاشای تەراودە کورێکی هەبوو نێوی شازادە لایومیدون بوو. لایومیدون کورێکی جوان و بەهێز بوو بەلاّم نەیدەتوانی قسەی خۆی بباتە سەر،

بیٚ بەڵێن بوو.

رۆژێك ئیلوس مردو لایومیدون بوو بە پاشای تەراودە. لایومیدون بیری کردەوە: ئەگەر شورایەك بە دەوری ئیلیون دا بکێشریٚ ماڵ و کۆشك و پەرستگەکان، سەلامەترو ئەمینتر دەبن، ئەوسا دژمنان ناتوانن بێنە شارەوە، مەگەر شوراکە بروخێنن.

لایومیدون، کە بە چاکی بیری کردەوە، دوو خواوەندی کۆشك و بارەگاکەی خۆی، کە یەکەمیان ئەپلوی خواوەندی هەتاو و دووەمیان پوسیدونی خواوەندی ئاوو دەریا بوو، گاز کردو گوتی: ئەی خواوەندان گویٚ بگرن، حەز دەکەم شورایەك بە دەوری ئیلیوندا دروست بکریٚ. دیوارەکە دەبیٚ بەرزو بلند بیٚ تا دژمنان نەتوانن بەسەریدا ئامدیو بن، جا ئێوە دەتوانن دروستی بکەن؟

هەردوو خواوەندەکە وەڵامیان دایەوە: بە دڵ و بە گیان دروستی دەکەین، بەڵام کە دیوارەکە تەواو بوو، دەبیٚ هەقدەستەکەمان بدەیتیٚ.

لایو گوتی: دڵنیا بن دەتاندەمیٚ و پارەیەکی باشیشتان دەدەمیٚ، من نامەویٚ بە خۆڕایی کار بکەن.

خواوەندەکان جل و بەرگی بەناییان لەبەر کردو دەستیان بە کارکردن کرد. هەر کاریان کرد و کاریان کرد. پاش یەك ساڵ کار کردن دیوارێکی بەرزو مکومیان بە چوار دەوری ئیلیوندا دروست کرد. ئەو جا هاتنە نك پاشاو گوتیان: کارەکەمان تەواو کردو دیوارەکەمان دروست کرد.

– دیوارەکە تەواو بوو؟

– بەڵیٚ تەواو بوو تەنانەت لەسەر دیوارەکە قوللەشمان دروست کردووە. هێندە بەرز و مکومە، کە دژمنان بە هیچ جۆریٚ ناتوانن. بیروخێنن.

– زۆر چاکە، سوپاستان دەکەم.

بەڵام کاتیٚ کە داوای پارەیان کرد، لایومیدون کە هیچ کاتیٚ لەسەر قەول و قەراری خۆی نەبووە، ویستی پەلپ و بیانووان بدۆزێتەوە. لە ئەنجامدا پێی گوتن کە پارەی نییە.

لیو، لە دایکی پرسی: جا پارەی هەبوو یان نەی بوو؟

– رەنگە نەی بووبیٚ، بەڵام نەدەبوو قەولیان بداتیٚ.

کاتیٚ ئەپولۆ و پوسیدون پێیان داگرت و سوور بوون لەسەر داوای هەقدەستی خۆیان، لایومیدون ی پاشای تەراودە تورە بوو، بەبیٚ نەزاکەتی دەریکردن. واتە پێی گوتن: ئەگەر نەڕۆن، دەست و پێتان دەبەستم و وەکوو کۆیلە لە دوورگەیەکی دوورە دەستدا دەتان فرۆشم، بەر لەوەی ئەم کارەش بکەم بە شمشێر گوێتان دەبڕم تا لە تاو ئازار هاوار بکەن. کەواتە تا زووە لێرە وەدەرکەون!

ئەپولۆو پوسیدون، بە تووڕەییەکی زۆرەوە ملی رێیان گرت و رۆیشتن، پوسیدونی خواوەندی دەریا، دەستووری بە دەریادا تا بێتە سەر زەوی، ئاو مەزراو کێڵگەی گەنمانی گرت. شەقام و مەیدانەکان بوون بە رووبار و دەریاچە. ماڵەکان پڕ بوون لە ئاو. منداڵان لە سەرماو لە برسێتی دا دەگریان، چونکە هیچ شتێکیان نەبوو بۆ لەبەر کردن و بۆ خواردن. لایومیدون، کەلەگەڵ منداڵەکانی دا هاتبووە بەرزترین ژووری کۆشکی پاشایەتی، لە ترۆپکی قەڵاوە، بە نائومێدی

پوسیدونی بانگ دەکرد:

– پوسیدون، پوسیدون، پوسیدون، رزگارم بکە.

بەڵام پوسیدون، دەنگ و رەنگی نەبوو، دەریاش هەر لە پێشڕەوی خۆیدا بوو و ماڵ و مەزرایانی غەرق دەکرد.

– پوسیدون، پوسیدون، رزگارم بکە. ئەهای پوسیدون هەرچیت بوێ دەتدەمێ!

لەو کاتەدا، کە پاشا لەگەڵ پریام و هیسیونەی کوڕ و کچیدا، لە ترۆپکی قەڵاکەدا بوو، پیرەمێردێك پەیدا بوو، ردێنێکی درێژو چەرمووی هەبوو، شەنەیەکی سێ لقی بە دەستەوە بوو. ئەو پیاوە پوسیدونی خواوەندی دەریا بوو.

پاشا دەپاڕایەوە:

– چیت دەوێ لەبری ئەوەی کە هەر هەموومان رزگار بکەی؟ ئێمە برسین و هەموو شتێکمان کەوتۆتە ژێر ئاوەوە.

پوسیدون گوتی: من دەتوانم دەستور  بە دەریا بدەم کە بکشێتەوە. پاشا بەڵێنی دایێ: ئەگەر ئاوەکە بگەڕێتەوە نێو دەریا، هەر چییەکت بوێ ئەنجامی دەدەم!

– دەتەوێ باوەڕ بە قسەی تۆ بکەم؟ تۆ جارێك درۆیانت کرد و ئیدی باوەڕت پێناکەم! تا سەعاتێکی دیکە ئاوەکە دەگەڕێتەوە نێو دەریا تۆ دەبێ لە ماوەی دوو سەعاتدا هیسونەی کیژت ببەیت و بە پەتێك لەسەر تاوێرێکی رەخی رووبارەکەدا بیبەستیەوە  و  بە تەنێ لەوێندەری بە جێ بهێڵی تا یەکێك لە جووتە ئەژدیهاکانی من بێن بیخۆن.

– هیسیونە؟ چی؟ هیسیونە دەڵێی؟ ناتوانم کیژەکەمت بدەمێ! داوای شتێکی دیکە بکە پوسیدون!

– ئەگەر لە ماوەی دوو سەعاتدا هیسیونە بە تاوێرێکی رەخی دەریاوە نەبەستی، ئاوەکە دووبارە دێتەوە و ماڵ و مەزراکانتان غەرق دەکات و ئەوساکە هەمووتان دەمرن.

پوسیدون، ئەو قسەیەی کرد و غەیب بوو. ئاو، لە ماڵ و مەزراکانەوە گەڕایەوە. پیاوو ژن و منداڵان هەموو لە خۆشیدا هاواریان دەکرد. هەموو لەسەربانان هاتنە خوارەوە و گەڕانەوە ماڵەکانیان. پادشا نە قسەی دەکرد و نە لە جێی خۆی دەجوڵا.

تەنانەت وەڵامی پرسیاری هیسیونەشی نەدەدایەوە کە لە نزیکییەوە بوو

– بابە بۆ دەبێ بمرم؟ بۆچی پوسیدون دەیەوێ من بمرم؟

مۆڵەتی سەعاتەکە تەواو بوو. ئاو گەڕابووەوە دەریا. خانوو و ماڵەکان خەریك بوو وشك دەبوونەوە. سەعاتێکی دیکەش تێ پەڕی. ئاوەکە بە کاوەخۆ دووبارە کەوتەوە هەستان. پیاوان و ژنان بەترسەوە هاواریان دەکرد. هیسیونە لە پەنجەرەکەوە سەری کێشایە دەرێ. بینی ئاوەکە لە حاڵی هەستاندایە.

– بابە پێویستە بچم بۆ رەخی دەریا، ئەگەر ئەمە نەکەم هەموو خەڵکی تەراوەدە دەمرن. بابە تۆ خەمی منت نەبێ. من ناترسم.

هیسیونە، بابی ماچ کرد. پریامی براشی کە زۆری خۆش دەویست، ماچ کرد و بەرەو رەخی

دەریـا وەڕێ کـەوت. لافـاوی ئـاو کشـایەوەو نیشـتەوە. کـە گەییـە ڕەخـی دەریـا. بـە یـەکێك لـە تاوێرەکانـەوە بەسترایەوە. ئـەو جا هـەموو ئەوانـەی لـە گەڵیدا چـوو بـوون، ناردنییـەوە بـۆ ماڵی خۆیان و بە خۆیشی لەوێندەر چاوەڕوان بوو.

لەم کاتەدا لە کۆشکی پاشادا هەمووان دەگریان. تەنانەت لایومیدونی پاشای تەراوەدەش دەگریا. پریـامی کـوڕی پاشـاش دەگریـا. دۆسـتان و خزمـەتکاران کـە خوویـان بـە هیسـیونەوە گرتبـوو، دەگریان. لەنکاو لەنێو هەراو هوریای گریانەوە دەنگێکی هەورە تریشقە ئاسا هاتە گوێ.

– پاشـا کـوا؟ پاشـا کـوا؟ هـەموو ئاوڕیـان بـۆ لای دەنگەکـە دایـەوە. پیـاوێکی کەتـەیان بـینی کـە کەوڵی شێری لەبەر کردبوو و دارعەسایەکی گەورەی گرێ گرێی بە دەستەوە بوو. بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشا. هەر هەمووان تەنانەت ئەوانەش کە تا ئەوسا دێویان نەبینی بوو. بـە کـەوڵی شـێرەکەو دار عەساکەدا حاڵی بـوون کـە ئـەو پیـاوە هەرقڵە. هـەرقڵ بـە هـەنگاوی قـورس دەهاتە پێشێ و خەڵکەکە ڕێیان بۆ دەکردەوە. کەگەییە بەردەم شا گوتی:

– ئەگەر هیسیونەی کیژت نەجات بدەم چیم دەدەیێ؟

پاشا وەڵامی دایەوە: یەك سەندوق زێڕت دەدەمێ.

هەرقڵ سەندوقە زێڕی ناوێ. خەڵکی بەهێز و توانا پێویستی بە سەروەت و سامان نییە.

لایومیدون، وەڵامی دایەوە: چەکی جوان و کوتاڵی نایابت دەدەمێ.

– چەکی من کوتەك و جل و بەرگم کەوڵی ئەو شێرەیە کە کوشتومە.

– کەواتە بە خۆت سەرپشك بە و چیت دەوێ داوا بکە؟ هەرچییەك داوا بکەی دەتدەمێ.

– ئەگـەر جـوانترین ئەسـپم بـدەیێ، واتـە ئـەو ئەسـپە ڕەسـەنە جاویدانانـەی کـە لەلایـەن زیوسـی خواوەندی پیاوان و خواوەندانەوە، پێت بەخشراون، ئەو ئەسپەم بدە پێ هیسیونە ڕزگار دەکەم.

– ئەسپەکانت دەدەمێ.

هـەرقڵ چ قسـەیەکی نـەکرد. بـە هـەنگاوی قورسـەوە بـەرەو ڕەخـی دەریـا ڕۆیـی. لـەنێو ئاوەکـەدا، ئـەژدیها خـەریك بـوو شـازادە خـانم هـەڵ بلووشـێ، سـەوز و ڕەش، پێـی زەرد و چـاوانی سـوورو ئاگرین، زاری تەواو کردبووەوە و کەفێکی ڕەشی لێوە دەردەهات. هیسیونە چاوانی نوقاندبوو تا ئەژدیهاکە نەیبینێ، هەرقڵ خۆی گەیاندە هیسیونە، هـەر کـە ئەژدیهاکـە بـە تـەواوی نزیـك بـووەوە، هەرقڵ خۆی هاویشتە سەری‌و بەدەم نەعرەتەوەو بەهەموو هێزو توانایەوە بەر بووە سـەرو چاوو پشتی. ئەژدیهاکە دەی هاڕاند، کلکی لە عاردی دەدا. ئاوەکەی بـە هـەر چـوار لادا دەپرژاند، زاری بۆ وەژەن دەکردەوە، پێیەکانی بۆ چنگ لێدان دەکردەوە. بەڵام لـە ژێـر ئـەو هـەموو هێـزەی هـەرقڵ دا، بـەرە بـەرە، تـۆپی. سـێڵاوی خـوێنێکی ڕەش لـە زامەکانییـەوە هەسـتا. ئـاوی ئـەو دەورووبـەرە ڕەشو تاریك بوو. ئەنجام جوڵەی لەبەر براو تۆپی. وەکو بۆقێکی پیس، کەوتە سەر ئاو.

ئەوجا هەرقڵ، ئەو پەتانەی کردەوە کە شازادە خانمیـان پـێ بەسـتبووەوە و پێکـەوە چـون بـۆ لای پاشا.

– ئەوە کیژەکەت لایومیدون، کوا ئەسپەکانم بدەیێ.

لیا، کە بە وردی گوێی دەگرت، گـوتی: من دەڵێم ئەسپەکانی نـاداتێ، لیـو پرسـی: دەیـداتێ یـان

نایداتیێ؟

پاشا گوتی: سبەینێ ئەسپەکانت دەدەمێ.

رۆژێ دوایی هەرقلێ گەڕایەوە و گوتی: لایومیدون، ئەسپەکانم نادەییێ؟

پاشا، هەرقلی برد بۆ تەویلەی ئەسپەکان و گوتی: ئەوە ئەسپەکانمە هەر کامیانت دەوێ هەڵی بژێرە.

هەرقلێ، سەیری هەر هەموو ئەسپەکانی پاشای کرد، بەڵام ئەو ئەسپانەی ئەو بۆیان دەگەڕا دیار نەبوون، چونکە لایومیدون شەوێ، بە دزییەوە ئەسپە باشەکانی ناردبوونە دەرەوە.

– من داوای ئەو ئەسپانەم لێکردبووی کە زیوس بە دیاری بۆی ناردبوویت، بە خۆشیت بەڵێنیت دامێ ئێستاش بۆت نییە پەشیمان ببیتەوە. بنێرە با بیان هێنن.

لایومیدون، کە ئەسپەکانی بۆ مێرگێکی دوور ناردبوو، وەڵامی دایەوە: من ناتوانم ئەو ئەسپانەت بدەمێ، چونکە نەم ماون.

هەرقلێ بە تورەیی هاواری کرد: لایومیدون، تۆ منت فریودا، بەڵام ئاگادار بە، وای بە حاڵی ئەو کەسەی بێ قەول بێ، درەنگ یان زوو ئاکامەکەی وەردەگرێ، من خەڵکیت لێ دەکەم و هەموو خەڵکەکەت پەخسیر دەکەم.

هەرقلێ، لە تەویلەکان وەدەرکەوت، لە کۆشکەکە وەدەرکەوت، لە تەراودە چووە دەرێ. چووە لای دۆستەکانی و حاڵ و حیکایەتی فریوکاری پاشای بۆ گێڕانەوە.

پاش ماوەیەك لەگەڵ دۆستەکانی دا گەڕایەوە بۆ تەراودە بۆ شەڕی پاشای شار.

لایومیدون، بەوکارە نالەبارەی خۆی خۆشحاڵ بوو، وایدەزانی هەمیشە سود لە تەڵەکەبازی وەردەگرێ! هەرقلێ رۆیی و ئەسپەکان بۆ ئەم مایەوە!

لەنکاودا سەربازێك، نارەحەت و شڵەژاو، وەژوور کەوت و گوتی: ئەوا دەستەیەك لە دژمنان بەرێبەری هەرقل بەرەو تەراودە دێن.

پاشا گوتی: باوەڕناکەم ژمارەیان زۆر بێ، هەر دەیانکەین بە پۆڕی خوراو. ئەوەی لەبیر چوو بوو کە هەرقل بە تاقی تەنێ بە ئەندازەی یەك لەشکر بەهێز بوو، پاشا مەتاڵ و کڵاوخودی هەڵگرت و بۆ شەڕ وەدەرکەوت.

خەڵکی تەراودە، لەسەر دیوارەکانی شارەوە بەرد و تیریان دەهاویشتە هێرش هێنان. بەڵام هەرقل بەگورزێك دەروازەی شاری شکاند و تلامونی دۆستی کە پاشای سالامیس بوو وەناو شار کەوت. پاش ئەوەی سەربازانی نۆبەتچی کوشتن، هەرقلیش وەناو شارکەوت. هەرقل بە دووی لایومیدون دا دەگەڕا، کە دۆزییەوە دەڵەکی داو بەعاریدادا و چۆکی خستە سەر سینەی و گوتی: لایومیدون، ئێستا ئەسپەکانم دەدەیتێ؟

– سوێندت بۆ دەخۆم. دەت دەمێ، هەرچیت بۆی دەتدەمێ. بەڵام مەمکوژە.

– سوێندێکی دیکەش بخۆ، هەر سوێند بخۆ، بەڵام من ئەمجارە بە جۆرێ پێستت دەگروم کە ئیدی نەتوانی سوێند بخۆی، پاشای بێ ئەدەب و خوێڕی.

ئەوجا لایومیدون ی کرد بەقوربانی کوتەکێك، ئەوجا چوو بە دووی هیسیونەدا، کە دۆزییەوە بە

دیاریی دای بە تلامیونی پاشای سالامیس.

بەڵام هیسیونە کە بینی هەموو خەڵکی تەراودە ئەسیر بوون، دەستی بەگریان کرد و گوتی:

– هەرقل، بۆ رزگارت کردم؟ بۆچی ئەژدیهاکەت کوشتو نەت هێشت بم خوات؟ دەبوایە وازبێنی من بمرم، تا شارەکەم وێران نەبێ.

هەرقل وەڵامی دایەوە: لایومیدونی بابت تەراودەی بە وێران بوون گەیاند. بەڵام چونکە تۆ کیژێکی چاك و ئازایت، دەمەوێ دیارییەکت بدەمێ. یەکێك لە ئەسیرەکانی تەراودە هەڵبژێرە و هەرچییەکت دەربارەی دەوێ بۆتی بکەم.

هیسیونە، پریامی برای لەنێو زیندانییەکاندا بینی، ئەوی لە یەخسیری و زیندان رزگار کرد، ئەوسا بەرەو سالامیس رۆیی. شووی بە تلامون کرد و بوو بە شابانۆی سالامیس.

لیو پرسی: پاشان چی بوو..

– پاشان پریام بوو بە پاشای تەراودە

لیا، پرسی: ئەدی پاشان.

– پاشان حیکایەتێکی دیکەتان بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام رۆژێکی دی.

"2 "

## شازادە پاریس وورچ

هەبوو نەبوو پاشایەك هەبوو نێوی پریام بوو، ئەم پیاوە حوکمڕانی شاری تەراودەی دەکرد. کاتێ کە پریام پاشا بچووك بوو، هەرقل شاری تەرِوادەی گەمارۆ داو شازادە پریامی دە زیندانێ نا. بەڵام پاشان لە بەرخاتری شازادە خانم هیسیونە، پریام لە زیندان بەربوو و ئیدی لەوساوە بوو بەپاشای تەراودە.

پریام، لە زەمانی پاشایەتی خۆیدا شازادە خانمێکی بەنێوی هکوبا خواست، ئەم ژنە منداڵێکی زۆری بوو، ئەوەندە زۆر بوون ناتوانم نێوی هەموویان بڵێم، پەنجا منداڵ بوون.

لیا گوتی: زۆر بوون!

– منداڵەکانی پریام پاشا هەموو بە هێز و داروبار و جوان بوون، پاریس لەهەر هەموویان جوانتر بوو، پاریس لە کۆشکی پاشایەتی داو دەگەل داکو بابو براکانیدا نەدەژیا.

لیو و لیا پرسیان: بۆ!

– چونکە بەرلەوەی شازادە پاریس لە دایك ببێ، دایکی "دۆتمێر هکوبا" خەونێکی سەیری دیتبوو. شەوێك کە خەوتبوو هەستی کرد مەشخەڵێکی گەورەی ئاگر لە ناخ و هەناویدا هەموو شتێکی دەسووتاند، ئاگرەکە بەرە بەرە گەورەتر دەبوو و بەرەو دیواری تەراودە دەڕۆیی وشاری دەسوتاند، بەترسەوە لەخەو راپەڕی. پاشای گاز کرد و خەونەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە.

پریام شا، بە کەمێك دوو دڵیەوە گوتی: خەونێکی سەیرە. دەبێ زانایانی تەراودە ئاگادار بکەین و بزانین بۆچون و لێکدانەوەیان لەمەڕ ئەم خەونە چییە؟

کە ڕۆژ بووەوە، پریام جلە تونیکەکانی خۆی لەبەرکرد.

لیا پرسی: تونیك؟

– بەڵێ تونیك جۆرە کراسێك بوو کە جاران لەبەریان دەکرد. بەهەر حاڵ تونیکە سپییەکەیو عەباکەی لەبەر کردو دار عاسای پاشایەتی هەڵگرت و چوو بۆ لای زانایان تا لە حاڵو حیکایەتی خەونەکە ئاگاداریان بکات.

گەورە گەورەکان یەك یەك هاتن. زۆر پیر بوون. هەموو سەرو ردێنیان سپی بوو. چوونە هۆڵێکی گەورەوە. لەوێندەر پاشاو شابانۆ چاوەنۆڕیان بوون. بە شێوەیەکی بازنەیی لەسەر کورسی جوان دانیشتن. شابانۆ، کە لەنزیکی پاشا دانیشتبوو، دەستی بە گێڕانەوەی خەونەکەی کرد. ردێن سپیان بە کری گوێیان گرت، کاتێ شابانۆ هکوبا قسەکەی تەواو کرد. پیرترینیان بەدەم سەر دانەواندنەوە هەستاو گوتی: شابانۆ خەونەکەی تۆ، خەونێکی ناخۆشە، ئەو منداڵەی کە دەتبێ، دەبێتە باعیسی هەڵایسانی ئاگرێکی گەورە کە تەراودە دەسوتێنێ. من وای بۆ دەچم، ئەوانی دیکەش هەستان، سەریان دانەواندو گوتیان، شابانۆ، خەونەکەت خەونێکی ناخۆشە، ئەومنداڵەی کە دەتبێ دەبێتە باعیسی هەڵایسانی ئاگرێکی گەورەو تەراودە دەسوتێنێ، ئێمەش وای دەبینین.

ئەوجا ردێن سپیان یەك یەك هەستان و لە کۆشکی پاشا وەدەرکەوتن.

شاو شابانۆ بەتەنێ لە هۆڵەکەدا مانەوە و هکوبا گریا. پاشاش غەمگین بوو، لێ هەوڵی دەدا دڵی هاوسەرە بێچارەکەی بداتەوە.

ئەنجام نیازی خۆی پێگوت:

– ئێمە منداڵی زۆرمان هەن، دەتوانین چاوپۆشی لەمە بکەین کە بەرێوەیە، ئەگەر راست بێ و لەبەر خاتری ئەو دەبێ تەراودە بسوتێ، ئەوا هیچ راست نییە لەلای خۆمان گلی بدەینەوە.

– ئەدی ئەگەر زانایان بە هەڵەداچووبن؟ ئەگەر خەونەکەم وا دەرنەچوو و شتێکی دیکە دەرچوو؟

–زانایان هیچ کاتێ هەڵە ناکەن، بینیت هەموویان هەر هەموویان قسەیان کرد. نە، ناتوانین لای خۆمان گلی بدەینەوە، کە لە دایك بوو دەیبەین بۆ بێشەیەکی دوور و فرێی دەدەین. بەمجۆرە تەراودە رزگار دەکەین.

– بەڵام ساوایەکی بەستەزمان بەتەنێ لە بێشەدا چ بکات؟ بێگومان دەمرێ، ئێمە دەبینە باعیسی مەرگی ئەو.

ئەوجا پریام شا بۆ شابانۆ هکوبای روونکردەوە کە پاشا دەبێ بیر لە وڵاتەکەی بکاتەوە ئەوجا بیر لە منداڵەکانی بکاتەوە.

– هەر پاشایەك یەك دنیا ئەرکی دەستۆیە، یەکێك لە ئەرکەکانی ئەوەیە کە وڵاتەکەی لە دەستدرێژی دژمنان بپارێزێ. بێ غیرەتییە ئەگەر من جورئەتی رزگارکردنی شارەکەمم نەبێ، ئەگەر ئەمە بە مەرگی منداڵەکەشم بێتەدی.

شابانۆی بەلەنگاز قەناعەتی کرد. کە پاریس لە دایك بوو، لەنێو سەبەتەیەکی دانا کە بەتایبەتی بۆ ئەوی دروستکردبوو، بە دەسرازەیەکی گوڵدوزی کراو لەنێو بەتانییەکی خوری نەرم و گەرمدا پێچایەوە. چەند جارێکی ماچ کرد و مات و غەمگین بۆ هۆدەکەی خۆی گەڕایەوە.

پریام شا، شازادەی ساوای وەرگرت و یەکێکی بە دووی شوانێکدا نارد کە نێوی ئیژلایوس بوو.

شا گوتی: ئیژیلایوس، ئەمە منداڵێکە کە دەبێ بمرێ، بیبە بۆ کێوی ئیداو دوور لە ماڵان و شار بە تەنێ لە سەرلوتکەی کێوەکە فڕێی بدە.

ئیژلایوس، بەدەم کڕنۆشەوە وەڵامی دایەوە: گەورەم، فەرمانت بەسەر سەر.

ئەوسا منداڵەکەی وەرگرت و دوور لەهەموو ماڵەکان وشار، بردی بۆ لوتکەی ئیداو لەوێندەر فڕێی دا. ئەوسا بۆ کوختەکەی خۆی کە لەدامێنی کێوەکەدابوو گەڕایەوە.

لێ شتێکی عەجیب روویدا، هەموو بەیانییەك ورچێك بە بەر کوختەکەی ئیژیلایوس دا رەت دەبوو، دەچوو بۆ کێوەکە و شەوێ دەگەڕایەوە. ئەو ورچە کە وەکو مرۆڤ باش و ئارام بوو، بۆچی دەچووە لوتکەی ئەو کێوە؟ ئیژیلایوس بۆ ئەوەی بزانێ ورچەکە لەو سەرە چ دەکات، هێواش هێواش دووی کەوت و ورچەکەی بینی وەختێ گەییە لوتکەی کێوەکە، لە قولێنەکەی پاریسی ساوا نزیك بووەوە، بەسەریدا هەڵتروشکا و تێر شیری دایێ و گەڕایەوە. ئیژیلایوس، بەسەرسامی بۆ ماڵ گەڕایەوە و هەموو شتێکی بۆ ژنەکەی باس کرد و گێڕایەوە. ژنەکەی گوتی: ئەمە موجیزاتە، مانای وایە خواوەندان شازادەی چکۆڵەیان خۆش دەوێت، ئێمە نابێ بێڵین بمرێ. ئیژیلایوس گوتی: هەق بە تۆیە. من دەچم دەیهێنمەوە.

گەڕایەوە بۆ کێوی و منداڵەکەی بە قولێنەکەوە هێنایەوە، هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتبوو کە منداڵێکی ئاوها جوان و نازدار کە شازادەش بێ، هەڵبگرنەوە و بە خێوی بکەن.

لیا، پرسی: باشە چییان لێکرد و قسەی زاناکان بە کوێ گەیی؟

– دێینە سەر ئەوەش.

شازادە پاریس، لە ماڵی ئیژیلایوس دا گەورە بوو، وای دەزانی ئەو ژن و مێردە بەراستی داك و بابین و بە دایکەو بابە گازی دەکردن، کە تۆزێ هەراش بوو کەوتە شوانی. هەمیشە لەگەڵ منداڵانی دیدا لەسەر شوانی لێی دەبوو بەشەڕو بەزم. هەمیشە لە گەمەی "غاردان و بازدان"دا براوە بوو، هەرکاتێ گەمەی دەفر هاویشتنیان دەکرد، لە هەموو هاوەڵەکانی دەبردەوە، خولاسە بوو بە بەهێزترین و جوانترین شوان.

لە کێوی ئیدادا کیژێك هەبوو بەنێوی ئوینونە، هێندە جوان بوو کە ئەپولوی خواوەندی هەتاو، دیارییەکی دابویێ، تا بەر لە هەر رووداوێك لەو رووداوە ئاگادار ببێ و پێی بزانێ.

رۆژێك بەیانی زوو ئوینونە بۆ چنینی وەنەوشە و گوڵە مینا بەو مێرگوزارەدا رەت بوو کە پاریس و رانەکەی لەوێندەر بوون. جلکێکی سپی لەبەر بوو، تاجە گوڵینەی وەنەوشە بە قژو دەست و کەمەرییەوە بوو، کە بە مێرگوزارەکەدا رەت دەبوو، بەدەم گوڵ چنینەوە گۆرانی دەگوت.

کە پاریس، کیژۆڵەکەی بینی بەوێدا رەت دەبێ، بە شمشاڵ ئاوازێکی لێدا کە ئیژیلایوس فێری کردبوو. هەر کە ئوینونە لێی نزیك بووەوە دەستی لە ئاواز لێدان هەڵگرت و بەرەو پیری چوو تا

قسەی دەگەڵ بکات. ئوینونەش دڵی چووە سەر شمشاڵ و ئاوازی شوانە و بە میهرەبانییەوە دەگەڵی ئاخافت. پاشان دوو بە دوو بەرەو کانی ئاوی چوون و ئاوی ساف و زوڵاڵیان بە دەستان خواردەوە.

لەو رۆژە بەدواوە ئوینونە هەموو رۆژێ دەچو بۆ ئەو مێرگوزارە و لە نزیکی کانییەکە یان لە سێبەری درەختێك دا دادەنیشت و گوێی لە ئاوازی شمشاڵ دەگرت. یان لە گەڵ شوانەدا گۆرانی دەگوت. باڵندەکان دە هاتنە دەرووبەریان و دەیانخوێند. هەندێ جار ئوینونە گوڵی بۆ تاجە گوڵینەکەی دەچنی و پاریسش بە نێو مێرگوزارەکە دەکەوت و بۆ گوڵە وەنەوشە دەگەڕا.

بەیانییەکی بەهاری کە باڵندە و مەلان دەیانخوێند و گوڵان لە شەونمدا دەدرەوشانەوە و چیمەن لەبەر بادا شەپۆلی دەدا، پاریس و ئوینونە زەماوەندیان کرد. وەکو هەمیشە لە گەڵ ئەودا چوو بۆ ژێر درەختێکی گەورە و بە چەقۆکەی لەسەر قەدی درەختەکە هەندێ وشەی نووسی تا ئوینونە بیانخوێنێتەوە. لەوێندەر نووسرابوو، زەمانێ پاریس دەتوانێ بەبێ ئوینونە هەڵبکا و بژی کەئاوی ئەگزانتو دووبارە بگەڕێتەوە بۆ نێو کانییەکە و سەر بەرەو ژوور بڕوات.

لێو گوتی: ئەگزانتۆ؟

– بەڵێ. ئەگزانتۆ رووبارێك بوو لەو نزیکانە.

لیو پرسی: مانای نووسینەکەی پاریس چی بوو؟

– ئاوی رووبار هەمیشە سەر بەرەو خوار دەڕوات، واتە لە چیاوە لەو شوێنەوە کە هەڵدەقوڵێ و دەست پێدەکات بەرەو خوار بەرەو دەریا دەڕوات، ئاوی روبار هەرگیز بە هەوراز و سەربەرە و ژووردا ناڕوات.

لیو گوتی: نە.

– یانی پاریس دەیویست بڵێ کە هەرگیز ناتوانێ بەبێ ئوینونە بژی. چونکە هەرگیز ئاوی رووباری ئەگزانتۆ بۆ سەرچاوەی خۆی ناگەڕێتەوە. حاڵی بووی؟

– بەڵێ حاڵی بووم. تەواوی بکە.

رۆژگار دەڕۆیی و پاریس و ئوینونە هەمیشە پێکەوە بوون و یەکتریان خۆش دەویست.

لیو گوتی: پێم وایە کۆتایی ئەم حیکایەتە هەندێ غەمگین دەبێ.

– بەڵێ، کەمێك.

– مەزەندەم بۆی چوو بوو. بەڵام بۆ چ کەسێك غەمگین دەبێ؟ بۆ ئوینونە؟

– پێم وایە. بەڵام ئەمڕۆ ناتوانم حیکایەتەکەتان بۆ تەواو بکەم. چونکە زۆر درێژە. سبەینێ تەواوی دەکەم.

"3"

## حیكایەتی پاریس و ئوینونە و سێوی زێڕین

لیو و لیا گوتیان: حیكایەتەكەی ئوینونە تەواو ناكەی؟

– ئوینونە وپاریس بوون بە ژن و مێرد. بە خۆشی دەژیان. هیچ خۆزیایەكیان نەبوو ئەوە نەبێ كە ژیانیان بەو جۆرە بەردەوام بێ. بەڵام ڕۆژێك لە ئۆلەمپدا، واتە لەمەڵبەندی خواوەندی یونانەدا، قەرەباڵغی و هەراو هەنگامەیەك پەیدا بوو كە ئەو سەری دیار نەبێ.

تیتس كە یەكێك بوو لە خواوەند بانۆكانی دەریا و لەگەڵ پلیوسی "پاشای فتیا"دا زەماوەندی دەكرد و هەموو خواوەندان بۆ زەماوەندەكە هاتبون و دیارییان دەگەڵ خۆدا هێنابوو.

هفایستوس، كە خواوەندی ئاگر بوو دەیتوانی جوانترین خشڵی هەموو دنیا دروست بكات، قەڵغان و ڕمێكی دا بە پلیوس. پالاس ئاتنای خواوەندی جەنگ و حیكمەت كڵاو خودێك و نێزەیەكی بە دیاری بۆ هێنابوو. پوسیدونی خواوەندی دەریا و ئەسپ، دو ئەسپی بە هەیبەتی جادویی كە مردنیان نەبوو لەگەڵ خۆدا هێنابوو. ئافرودوتی خواوەندی ئەشق و جوانی دەستێك جلكی سەیر و زۆر جوانی پێشكەش بە تیتیس كرد.

لیو پرسی: تیتیس كێ بوو؟ ژن بوو؟

– بەڵێ.

– یانی خواوەندیش بوو؟

– بەڵێ.

– ئەدی ئەو كابرایەی كە نێزە و ئەسپیان بۆ دێنا خواوەند نەبوو؟

– نە، مرۆڤ بوو. تیتس حەزی نەدەكرد كەشوو بە ئادەمیزادێك بكات و هیچ خواوەندێكیش قایل نەبوو بیخوازێ. چونكە خواوەندان دەیانزانی ئەو منداڵەی كە لە تیتس ببێ لە بابی بە هێز تر دەبێ، خواوەندان نەیاندەویست منداڵەكانیان لە خۆیان بەهێزو تواناتر بێ. بەڵام ئادەمیزاد بەپێچەوانەوە حەز دەكەن منداڵیان لە خۆیان بە تواناتر بێ. بۆیە تیتیس ناچار بوو شوو بە ئادەمیزادێك بكات كە نێوی پلیوس بوو پاشای فتیا بوو و ئەو منداڵەی كە لە پلیوس بوو، لە خودی پلیوس و هەموو ئادەمیزادێكی دی بەهێزتر بوو.

– ناوی منداڵەكەی چی بوو؟

– نێوی ئاشیل بوو. بەڵام ئێستا دێینەوە سەر بەزمی زەماوەندەكە و دیارییەكان.

بەهار، دەم بە خەندە و پڕ لە گوڵ و گوڵزار هات. هاوین بە قەرتاڵەی گەورەی پڕ لە میوەی بۆن خۆش و هێشوی زێڕین، پایز بە هێشوە ترێ و سێوە لاسورەی كێوییەوە، بە دوای یەكدیدا

هاتن. لاوانی دەنگ خۆش گۆرانیان بە تیتس و پلیوس دا هەڵدا. پەنجا کیژ "ریزە" خوشکانی تیتس، دەستی یەکتریان گرتبوو و لەسەر لمی پرشنگدار دا دەرەقسین و هەڵدەپەڕین.

خێر ون، یەکێك بوو لە خواوەندانی ئەسپ شێوە، هاتبووە زەماوەندەکە دەربارەی "ئاشیل" ئەو منداڵەی کە لە تیتس دەبوو، وەکو قارەمانێکی قژ زەرد کە هەموو دنیای بە ئازایەتی خۆی سەرسام دەکرد، قسەی کرد. پاشان گانیمیدی خۆشەویستی زیوس، لە کوپەی زێڕان، هەنگوین و شەربەتی بۆ خواوەندان تێکرد. پاشان خواوەندان شادو خۆشحاڵ، هەموو دەستیان بە خواردن و خواردنەوە کرد.

ئیروس ی فەرزەندی ئەفرودێتش لەنێو داوەتکراوەکاندا بوو. وەکو دایکی خواوەندی ئەشق و جوانی بوو. منداڵێکی قژ زەردی جوانی زیتەڵ بوو کە سوعبەت و شۆخییانی دەگەڵ هەمووان‌دا دەکرد و هەمیشە تیروکەوانی پێ بوو. هەر کاتێ ئادەمیزادێك یان خواوەندێك بیویستایە زەماوەند بکات، یەکێك لە تیرەکانی دەهاویشت، تیرەکەی بەر هەر کەسێك بکەوتایە، دەبووایە ببێ بە هاوسەری ئەو کەسەی کە ئیرۆس دەیویست. ئیروس لە شاییەکەدا لە نزیکی بووکێوە دانیشتبوو، دەیڕوانییە دەوروبەر تا کەسێکی دەعوەت نەکراو یان ئاژاوەچی بۆ شاییەکە نەهاتبێ، لەنکاو چاوی بە ئیریس کەوت. جوان دیقەتی دایێ. بەڵێ ئیریس بوو دەیویست شەڕو ئاژاوە بنێتەوە. ئیرۆس نەیدەویست ڕێگەی ئەو کارانەی بدات، چونکە چەندین جار عەیشو نۆشی لە هەمووان تێك دابوو.

ئیرۆس بیری کردەوە: ئیریس بۆچی هاتووە؟ ئەو تەنیا شەڕ و ئاژاوە نانەوەی گەرەکە. دەیەوێ قسەی ناشیرین بکات و خۆی بنوێنێ و تاخەڵکەکە وەڕەز نەکات واز ناهێنێ. کەواتە باشتر وایە لێرەی وەدەرنێم.

ئیروس، بە گورجی و بێئەوەی چ کەسێك ببدینێ، چوو بۆ لای ئیریس.

– بۆچی هاتووی؟ ئێمە هەموومان لێرە خۆشحاڵ و شادین و نامانەوێ شەڕو ئاژاوە بقەومێ. ئەمە جگە لەوەی کە تۆ دەعوەت نەکراوی!

بێ تەربێتییە بۆ شوێنێ بچی کە دەعوەت نەکرابی!

– تۆ من فێری تەربێت دەکەی هەتیوەی بێ ئەقڵ! ڕێك لەبەر ئەوەی دەعوەتیان نەکردوم ویستم بێم بۆ ئێرە. بەرای تۆ ئەمە بێ تەربێتی نییە کە منیان دەعوەت نەکردووە؟ هەمووان من دەناسن. دەزانی چەندین جار داومن بە شەڕا!

– بەڵێ، بەڵام ئەمڕۆ باشترە کە لێرە بڕۆی، تەمەشای ئەوێندەر بکە، لەناو پیاوەکاندا، هۆو دوو منداڵە، کە خەریکن بە یارییەکانیان بە هێمنی وازی دەکەن، بچۆ لای ئەوان، هەرکە هەستیان کرد لێیان نزیك بویەوە، کچەکە یاری لە براکەی دەوێ و براکەی نایەوێ بیداتێ، کچەکە بە زۆر دەیبا، لە ئەنجامدا دەبێ بە شەڕیان و تۆش بۆ خۆت پێیان پێدەکەنی. برو لێرە برۆ. ئەمڕۆ وا چاکە تۆ لە ئۆڵەمپ دوور بی.

ئیریس بەدەم بۆڵە بۆڵەوە ڕۆیی و گوتی: من چ هەقم بەسەر ئەو منداڵانەوەیە کە بۆ خۆ گەمان دەکەن! من دەمەوێ لەو خواوەندانەی کە دەعوەتیان نەکردووم و لە ئیرۆس کە دەریکردووم تۆڵە

بسەنمەوە. بەڵێ تۆڵەی خۆم هەر دەکەمەوە. تۆڵەی خۆم دەستێنم، ڕێیەك هەر دەدەۆزمەوە و تۆڵەی خۆم دەستێنم، ئۆو، زۆر چاکە دۆزیمەوە. با ئەنجامی بدەم. ئیرۆس!

ئیریس، خۆی هەڵدایە باخێکەوە. باخێکی چڕو پڕو بەرەونەق بوو، دارێکی تێدا بوو سێوی زێڕی دەگرت. یەکێك لەو سێوە زێڕانەی کردەوە، شتێکی لەسەر نووسی و بۆ ئۆڵەمپ گەڕایەوە. لەوێندەر زیرەکانە و بێ ئەوەی بێڵێ ئیرۆس بیدینێ، سێوەکەی هەڵدایە سەر مێزەکە و یەکسەر هەلات.

لیو و لیا پرسییان: بۆ؟

– هەنووکە بۆتان دەردەکەوێ بۆ، کە خواوەندان ئەو سێوەیان لەسەر مێزەکە بینی، و یستیان هەڵی بگرن و نووسینەکەی سەری بخوێننەوە و بزانن چی لەسەر نووسراوە. وەکو منداڵی لاسار و بێ تەربێت یەکتریان دەڵەك دەدا.

– ئەمە چییە؟

– سێوی زێڕینە.

– کێ هێناویەتی؟

– بۆ کێیە؟

– با منیش بیدینم.

– هەوەڵجار، من دەمەوێ بیدینم!

– نا نۆرەی منە!

– نەخێر نۆرەی منە!

خواوەندان، بۆ خۆ خەریکی مشت و مڕ بوون، هانکە هانکیان پێکەوتبوو، هاواریان دەکرد، بەشەڕ دەهاتن، یەکیان دەڵەك دەدا، ئیریسش تۆزێ لەولاترەوە تەماشای دەکرد و کەیفی دەهاتێ.

لیا پرسی: بۆچی؟

– چونکە توانی بووی، نەخشەکەی خۆی ئەنجام بدات، یانی لە ئۆڵەمپدا ئاژاوە بنێتەوە، ئەنجام زیوسی بابی مرۆڤان و خواوەندان سێوەکەی هەڵگرت و نووسینەکەی سەری خوێندەوە.

لیو: چی لەسەر نووسرابوو؟

– نووسرابوو: "پێشکەش بە جوانترین خواوەند بانۆ" کاتێ زیوس نووسینەکەی خوێندەوە. خواوەندانی ژن هەموو بێدەنگ بوون، خواوەندانی پیاویش هەر بێدەنگ بوون. بەڵام هەر پاش تۆزێك مەگەر خوا بزانێ چ هەراو هەنگامەیەك کەوتە نێو خواوەندانی ژن، خواوەندانی ژن بەتایبەتی سێ جوانترینەکانیان، واتە پالاس ئاتنا، هورای هاوسەری زیوس و ئافرۆدێت، لە هەموویان پتر دەیانقیژاند. ئیریس لە دوورەوە وێستا بوو نیگای دەکردن و لەزەتی لەو ئاژاوەیە دەبینی کە نابویەوە. لەپڕ دەنگێکی هەورە تریشقە ئاسا ئۆڵەمپی هێنایە لەرزە. هەموو بێدەنگ بوون. دەنگی زیوس بوو کە دەیگوت: – جوانترین خواوەند بانۆ ئەم سێوە زێڕینە وەردەگرێ. بەڵام کێ دەتوانێ لەناو ئەم سێ خواوەند بانۆیەدا، "ئاتینا، هورا، ئافرۆدێت" دا داوەری بکات و

پێمان بڵێ کێهەیان جوانترە؟ ئاشکرایە من ناتوانم و هیچ یەکێك لە خواوەندەکانیش ناتوانن، کەواتە دەبێ داوەرێك هەڵبژێرین کە جاویدان نەبێ.

لیو پرسی: یانی چی جاویدان نەبێ؟

– یانی کەسێك بێت کە چارەنووسی مردن بێ، واتە ئادەمیزاد. چونکە خواوەندان نامرن، بۆیە جاویدانن.

زیوس گوتی: لە دەشتێکدا، لە بناری کێوی ئیدادا، لاوێکی زۆر جوان بەنێوی پاریس هەیە. بەخۆی پێی وایە کوڕی ئیژیلایوسی شوانە، بەڵام لە حەقیقەتدا شازادەیە، کوڕی پریام شای پاشای تەراودەیە، پاریس دەکەین بە داوەری ئەم حاڵە. ئاتینا، ئافرودێت و هورا بچن بۆلای ئەو و هرمیسش لەگەڵیاندا بچێ.

لیا پرسی: هرمیس کێیە؟

– هرمیس خواوەندێك بوو کە باڵی هەبوو و سەروکاری کاروباری خواوەندانی دەکرد. زیوس سێوە زێڕینەکەی دایە دەستی هرمیس، هرمیس هەرسێ خواوەند بانۆکەی بەرەو کێوی ئیدا رێنوینی کرد و ئارامی باڵی بەسەر ئۆڵەمپدا کێشا و شایی و زەماوەند بەردەوام بوو.

پاریس، لە ژێر پیرە درەختێك دا لەسەر سەوزە گیا دانیشتبوو، ئوینونەش بۆ گوڵچنین چوو بووە لێڕی. پاریس، چاودێری پەزەکانی دەکرد و بیری لە ئوینونەی ئازیزی دەکردەوە و هەستی بە خۆشحاڵی وئارامی دەکرد. لەم کاتەدا یەکێکی بێگانەی لە بەردەم دا قوت بووەوە، ئەو بێگانەیە هرمیس بوو. سێوێکی زێڕینی بە دەستەوە بوو و لاقی باڵیان پێوە بوو. کاتێ دەگەڵ پاریس قسانی دەکرد، دەتگوت دەمێ ساڵە دەیناسێت.

هرمیس گوتی: پاریس، مەترسە، بۆ ساتێ پەزەکانت بەجێ بێڵە و لەگەڵ مندا وەرە بۆ لای خواوەندەکان کە لە ئاسمانێ ڕا هاتوون بۆ لای تۆ. خۆیان نیشانی تۆ دەدەن تا بزانی کامیان جوانترە. ئەم سێوە بدە بەوەیان کە جوانترە، دیارە ئەو خواوەند بانۆیەش لە تۆ رازی دەبێ.

لیو کە پەلەی بوو پرسی: سێوەکەی دایە کێ؟ من دەڵێم بە ئاتینای دا، چونکە پێی جوانتر بوو.

– ئێستا گوێ بگرن، پاریس سەری هەڵبڕی. بە دیتنی ئەو سێ ژنە جوانە سەرسام بوو، تا ئەو ساتە هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئەو پیاوێکی ئەوەندە گرنگ و گەورە بێ. بەڵام ئێستا وای هاتە بەر زەین کە کەسێکی دییە، یانی زرنگترین و بەشانسترین پیاوی دنیایە. لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە کە دەبێ زۆر بەختەوەر بێ و ئەم خواوەندە جوانانە هاوڕێ لەگەڵ خواوەندێکی باڵدارا هاتوون بۆ لای ئەو. بەڵام بە پێچەوانەوە، ئیدی لەو رۆژەوە سەریەشەکانی پاریسی بەلەنگاز دەستیان پێکرد.

لیو و لیا: بۆچی؟

– سەبر بکەن، هەنووکە پێتان دەڵێم. پاریس بە بێدەنگی دەیڕوانییە ئەوان ئەوجا ئاتینا دەستی گرت و گوتی:

– وەرە کوڕی پریام. وەرە خواوەندی جەنگ و حیکمەت پەسند بکە. تۆ دەبێ بەگری لە تەراودە بکەی. ئەگەر سێوەکە بدەیتە من کارێکی وا دەکەم بگەیە پلەی حیکمەت و فرەزانی. ئەگەر

سێوەکە بدەیتە من، من شارەکەت رزگار دەکەم و دەتکەم بە بەهێزترین جەنگاوەر.

هیرا گوتی: پاریس، سەیری من بکە، من هاوسەری زیوسی بابی خواوەندانم، تۆ شازادە و کوڕە شای، ئەگەر سێوەکە بدەیتە من، من دەتوانم بتگەیەنمە پاشایەتی و بتکەم بە پاشایەکی گەورە. هەموو ئاسیا دێتە ژێر رکێفی تۆوە. فرەزانی و بە هێزی بە چ دەچێت. گرنگ ئەوەیە فەرمانڕەوا بی و فەرمانڕەوایی خەڵکی بکەیت، وڵاتانت هەبێ و بێ ئەندازە دەوڵەمەند و زەنگین بی.

لیو گوتی: پێم وایە هیرا شتێکی دروستی نەگوتبێ.

– منیش پێم وایە.

لیا: منیش پێم وایە.

پاش هیرا، ئافرۆدێت قسەی کرد، ئەی پاریس، تۆ بڕوانە ئافرۆدێت، خواوەندی ئەشق، بەهێزی و فرەزانی بەکەڵکی چی دێ؟ فەرمانڕەوایی و دەوڵەمەندی چییە؟ کوڕی شا، تۆ دەبێ رابوێری، ئەگەر سێوە زێڕینەکە بدەیتە من، بیدەیتە ئافرۆدێت، ئەوا ئافرۆدێت کارێکی وا دەکات جوانترین ئافرەتی دنیا، واتا هێلین ببێ بەهاوسەرت، بۆ خۆت خەنی دەبیت، چونکە هیچ شتێك لەوە خۆشتر نییە کە لەگەڵ ژنێکی جواندا بژی.

– گوتت ببێ بە هاوسەری؟ ئەدی پاریس پێشتر ئوینونەی نەخواستبوو؟

– با بەڵام لەو دەورزەمانەدا پیاوان دەیانتوانی لەیەك هاوسەر پتریان هەبێ. بزەی ئافرۆدێت بەراسی لەبەرچاوی پاریس جوان بوو. ئەنجام ئافرۆدێت گرەوی بردەوە و پاریس سێوە زێڕەکەی دا بەو. هیراو ئاتینا، بۆ ساتێ بە بێدەنگی لێی ورد بوونەوە و بە نیگای رق دایانبێژت، پاشان هەرسێکیان غەیب بوون. هیرمسیش غەیب بوو و هەموویان بۆ ئۆڵەمپ گەڕانەوە. کە ئەوان رۆیشتن، ئوینونە بە چەپکە گوڵ و لاولاوەوە بەغار هاتەوە بۆ لای پاریس.

پاریس گوتی: ئوینونە دەزانی کە من کوڕی شای تەروادەم؟ خواوەندبانۆیان ئەمەیان پێ گوتم.

ئوینونە گوتی: من ئەمەم دەزانی.

– ئەدی بۆ پێت نەدەگوتم؟

– چونکە باشتر بوو نەیزانی. بۆ کەسێکی وەکو تۆ باشتر وابوو وەکو شوانێك بژی. ئاوا بەختەوەرتری. کێ دەڵێ لە کۆشك و بارەگای پادشادا بەختەوەر دەبیت و دەتوانی بە خۆشی بژی.

ئوینونە تاجە گوڵینەیەکی نایە سەر سەری پاریس و لە تەنیشتییەوە دانیشت.

– پێم بڵێ ئەو سێ ژنە بۆچی لە ئۆلەمپەوە بۆ ئێرە هاتبوون.

پاریس، حاڵ و حیکایەتەکەی لە نووکەوە بۆ گێڕایەوە. بەڵام بۆ ئەوەی ئوینونە زیز نەبێ، هیچی دەربارەی هیلین نەگێڕایەوە.

– ئاتینا، قەولی چی دایتێ؟

– قەولی دامێ کە بە هێز و دانا و فرەزانم بکات.

– ئەدی هیرا بەڵێنی چی داییتێ؟

– بەڵێنی دامێ کە بمکات بە پاشا.

– ئەد ئافرۆدێت؟

پاریس نەیدەویست وەڵام بداتەوە، چونکە قەناعەتی وابوو کە هەڵبژاردنەکەی دروست نەبووە، ئیدی نامەوێ بیر لە قەول و بەڵێنی ئافرۆدێت بکەمەوە. دەمەوێ قەول و بەڵێنەکەی فەرامۆش بکەمو هەمیشە لە گەڵ تۆدا بم.

ئەوسا پاریس و ئوینونە دیسان وەکو جاران لەگەڵ یەکدیدا درێژەیان بە ژیانی خۆدا.

لیو پرسی: بۆ هەمیشە پێکەوە مانەوە؟

– سبەینێ ئەمەت بۆ باس دەکەم. ئەمڕۆ ئیتر بەسە.

"4"

## پاریس و جەژن و ئاهەنگەکانی تەراودە

پاش ئەوەی هرمیس وخواوەند بانۆیان بۆ ئۆڵەمپ گەڕانەوە، ئوینونە و پاریس وەکو جاران بەیەکەوە درێژەیان بە ژیانی خۆیان دا. لێ پاریس ئیدی وەکو جاران نەبوو. چونکە بۆی بەدیار کەوتبوو کە داك و بابی شوان نەبوون. بەڵکو بابی پریام شاو دایکی هکوبای شابانۆی تەرواده بوون. بۆیەبیری تازە لە کەللەی دا.

بیری دەکردەوە، کە من کوڕە پاشا بم بۆچی دەبێ شوانی بکەم؟ بۆ دەبێ ئوینونە بخوازم و بیکەم بە هاوسەر، نە بەنێو بانگە و نە کەسێك دەیناسێ، ئەگەرچی زۆر جوانیش بێ.

کە بەتەنێ دەبوو هەمیشە بیری لەو شتانە دەکردەوە، لێ کاتێ کە ئوینونە بۆ لای ئەو دەگەڕایەوە و چەپکە گوڵی بۆ دێنا، ئەو دەمە وای بیر دەکردەوە کە تەنێ لەگەڵ ئوینونەدا دەتوانێ بەختەوەر بێ.

ڕۆژێ هەواڵی زانی کە پریام شای تەراودە، کە ئاهەنگێکی پێشبڕکێی راکردن و بازدان و زۆرانی لە نێوان شواناندا سازداوە، هەر هەموو ئەو لاوانەی لە خۆیان رادەدیت بۆیان هەبوو بەشداری ئەو ئاهەنگە بکەن، پاریس، بیری کردەوە کە ئەویش بەشداری بکات. – من کوڕی پریامم، نابێ لیاقەت و لێهاتووی و ئازایەتی خۆم پیشانی بابم بدەم؟ من کە بابو داکم شاو شابانۆن، لێرە دانیشم چاودێری پەزان بکەم و لاوانی دێ بڕۆن زۆرانبازی بکەن؟ منیش دەچمە ئەو پێشبڕکێیە، بێ چەند و چۆن دەچم. ئەگەر سەرکەوم، ئوینونە دەبینی خەڵاتی جوان جوانت بۆ دێنمەوە! ئوینونە بە دەنگی گیراو و غەمگینەوە گوتی: ئەگەر براوە بی، ئیدی گوێ بە من نادەیت و تا ماوەیەکی زۆر بۆ کێوی ئیدا ناگەڕێیتەوە لەوێندەر، لە کۆشکی بابت دا دەمێنییەوە. پاشان بەرەو هلاس دەچی و لەوێندەرەوە دەچیت بۆ ئەسپارتا و پاشان هیلین، واتە جوانترین ژنی دنیا دەبینی و دەیخوازی و دەیکەیت بە هاوسەری خۆت.

پاریس، بەسەرسامی پرسی: ئەم شتانە لە کوێ دەزانی؟

– من ڕووداوانی ئاینده دەبینم، من دەزانم کە تۆ بۆ ئەسپارتا دەچیت و هیلین لەگەڵ خۆتدا دێنی و تەراودە لە ئا گردا غەرق دەبێ و دەسووتێ.

– من هەرگیز بۆ ئەسپارتە ناچم. من دەمەوێ بۆ تەراودە بچم، دەمەوێ بزانم کە ئاخۆ چ کەسێك هەیە لەمن بەهێزتربێ؟ دەمەوێ بەسەر شازادەکاندا سەربکەوم، دەمەوێ باب و دایك و براکانم بناسم. ئۆینونە تکای لێکرد: مەڕۆ! ئەگەر بزانی بەم کارەت چەندە زەرەر بە باب و داك و براکانت دەگەیەنی! لێرە دەمێنییەوە، من دڵنیام بۆ ئەوێندەر ناچیت! و پاشان لە کۆشکی شادا ژیانێکی ڕەحەت و ئاسوودەت دەبێت و سست و خاو دەبیت، لە کاتێکا لێرە بەهێز و چابوکی، ڕاستە تۆ بەسەر شازاداندا سەردەکەوی، بەڵام هێز و چەلەنگیت لە دەست دەدەی.

پاریس، باوەڕی بە قسەکانی ئۆینونە نەکرد، وای بیر دەکردەوە: ئاساییە ئەو بەمجۆرە قسان بکات، ئەو شازادە نییە. ئافرەتێکی دێهاتییە و هەموو شتێك لە خەتەردا دەبینێ! نابێ گوێ لە قسەکانی بگیردرێ.

پاریس گوێی بە قسەی ئۆینونەدا و چوو بۆ میهرەجانی تەروادە. ئۆینونە بە تاقی تەنێ لە کێوی ئیدادا مایەوە و گریا. چونکە دەیزانی پاریس ویستی سست دەبێ و ناتوانێ جڵەوی خۆی بگرێ و نەچێ بۆ هەلاس. درەختەکان کە ئۆینونەیان خۆش دەویست، هەوڵیان دەدا بە سێبەرەکانیان و ورشەی گەڵاکانیان دڵخۆشی بدەنەوە. مێرگوزارەکان هەوڵیان دەدا بە گوڵی جوان خۆشحاڵی بکەن. بەڵام نە ورشەی گەڵاو نە جوانی گوڵان سوکناییان بە دڵی ئۆینونە نەدەدا و هەر دەگریا و دەگریا.

لیو پرسی: پاریس گەڕایەوە بۆلای؟

– بەڵێ گەڕایەوە، بەڵام پاش چەندین ساڵ. تیرێکی ژەهراوی پێکەوتبوو و دەیزانی تەنێ ئۆینونە دەتوانێ ئەم زامەی مالیجە بکات. خۆی گەیاندە سەر کێوی ئیدا، هەستی کرد مێرگ و درەختەکان باسی ئەو ڕۆژگار و ساڵانە دەکەن کە ئەو شوانکارەیەکی سادە و ساکار بوو، کە گەییە بن درەختە پیرەکە، شەکەت و ماندوو کەوتە سەر زەوی و نەیتوانی درێژە بە ڕێی خۆی بدات.

کەسێکی بە دووی ئۆینونەدا نارد، ئۆینونەش بە پەلە هات بۆ ڕزگار کردنی.

کە گەییە دیار پاریس، زۆر درەنگ بوو بوو، پاریس مرد بوو، جەنازەکەی لەنێو گوڵە میناو وەنەوشەی سێبەری پیرەدارەکەدا کەوتبوو. ئۆینونە کە ئەوی بینی خەمێکی گەورە سەراپای گرت و خۆزی خواست کە ئەو ژی بمریت.

با ئەمە لێرە بە جێ بێڵین و بچینە تاقیبی میهرەجانەکەی تەراودە. پریام ڕای گەیاند بوو کە هەر کەسێك دەیەوێ دەتوانێ بەشداری پێشبڕکێیەکە بکات، خەڵکی لە هەموو لایەکەوە بۆ دیتن و بەشداری کردن لە ئاهەنگەدا هاتن، لاوانی بەهێز لە دوور و لە نزیکەوە دەهاتن، زۆریان کەس نەیدەناسین. هەشیان بوو چەندین جار براوە بوو بوون و خەڵکەکە ناویان دێنان و هورایان بۆ دەکێشان: بژی! بژی!

کوڕانی شاش دەیانتوانی بەشداری بکەن و خەڵاتی هەمە جۆر و گرنگ بەدەست بێنن.

پاریس لەگەڵ کەسانی دی دا چووە پێش، گەییە مەیانێکی زۆر گەورە، تەخت و کورسی داریان بە دەوری مەیدانەکەدا دانابوو لەنێو شوێنی تەماشا کەرانەوە، شوێنێکیتایبەتی بۆ پریام شاو هکوبای ژنی، بە گوڵ رازێنرابووەوە و کۆمەڵێك لە شازادەکان بە جلی پۆشتە و پەرداخ و شاهانەوە لەوێندەر بوون.

ئەو شوێنەی کە پاریسی لێ بوو و کورسی تیا نەبوو، خەڵکی بە پێوە وێستا بوون و پێکەوە قسانیان دەکرد. تەماشای شازادەکانیان دەکرد و ناویانیان لە یەکدی دەپرسی:

– ئەو گەنجە گەورەیەی کە بە پێوە و لەنزیکی شا وێستاوە کێیە؟

– ئەوە هکتوری کوڕی شایە، رامکەری ئەسپانە، بە هێزترین جەنگاوەری تەراودەیە.

– ئەدی ئەو پیاوە جوانەی کە زۆر گەنج نییە و لە نزیکی شابانۆوەیە؟

– ئەوە ئانخیسە، پس مامی شایە بە هەرزەکاری سەرپەرشتی گاگەلەکەی شای دەکرد، پاشان خواوەندی جوانی "ئافرۆدێت" ئاشقی بوو.

– بەڵێ راستە، بیستوومە، دەڵێن "ئاینەئاس" ی کوڕی لە ئافرۆدێتە.

– ئەها، ئەوەش "ئاینەئاسە" ئەوەی کە هەنووکە گەڕایەوە و لە گەڵ هکتوردا قسەی کرد.

– چەند جوانە! کوڕی خواوەندی جوانی، دەبێ جوان بێ.

– بێدەنگ، بێدەنگ! ئەو لاوانەی بەشداری پێشبڕکێی یەکەم دەکەن خۆیان دەناسێنن.

کۆمەڵە لاوێك خۆیان بۆ پێشبڕکێی یەکەم کە پێشبڕکێی غاردان بوو، ساز دەکرد.

هەوەڵجار دوو کوڕی شا، پاشان غاردەرێکی نێودار، پاشان لاوانی دی کە کەمتر ناسرابوون، هاتنە بەرەوە، پاشان، لە دوای هەمووانەوە پاریس هات، پاریس جلوبەرگی هەژارانەی لەبەرکردبوو، کراسێکی خوری ئەستووری درێژی تۆخی لەبەر بوو، کە لەنێو کراسی سپی ئەوانی دیکەدا وەکو پەڵەیەکی رەش دەینواند. خەڵکی دەیانگوت: ئەو پیاوە هەژارە کێییە وا زاتی پەیدا کردووە کە لە پێشبڕکێی شازادان دا بەشداری بکات. دەکەوێتە دوای دواوە، ئێستا دەی بینن. دەبوایە کەڵکەڵەی ئەم پێشبڕکێییە لەسەری خۆی دەربکات.

لاوەکان، کراسەکانیان داکەند و لەشی خۆیان بە رووتی و چەوری خستە ئەو گۆڕە.

لیا پرسی: بۆچی بە رووتی و چەوری؟

– یونانییەکان، لە پێشبڕکێی غاردان و زۆرانبازیدا خۆیان رووت دەکردەوە و بۆ ئەوەی بە ئاسانی نەکەونە دەستی حەریفی خۆ و لە دەستیان بخزێن بە دەنی خۆیان چەور دەکرد تا لووس ببێ. کە هەموو لاوەکان، بەبەدەنی رووت و چەورەوە خۆیان ناساند یەکێك لە خەڵکەکە گوتی: بەڕاستی ئەو کورە هەژارە کە ئێستا جلەکانی داکەند ناشیرین نییە. با بزانین چ کارێك دەکات.

ئیشارەت درا، غاردەران وەکو تیر بۆی دەرچوون. هەوەڵجار هەموویان پێکەوە بوون، پاشان هەندێك تاویان سەند و هەندێك پاشکەوتن.

لە کۆتایی یەکەم دەورەدا، پاریس، بە گوژمێك، وەکو تیر دەرپەڕی و پێشی دەستەیەك لە غاردەرەکانی دایەوە و هەنگینێ رکەبەری کەوتە نێوان خێراکانەوە. ئێستا یەکێکیان ساتمەی

داو کەوت، یەکێکی دی ڕووبەڕووی لەمپەر بووەوە هاوسەنگی خۆی لە دەستداو کەوت و لە تەپوتۆزدا غەرق بوو. تەنێ سێ کەس مابوونەوە کە ئومێدی بردنەوەیان هەبێ، ترویودسی کوڕی شا، پولیتس و پاریس ئەمانە سێ پەرەسێلکەی باڵدار بوون و زەویان لە دووی خۆیانەوە دەکێڵا.

لیا گوتی: بەڵێ، دروستە. کە پەرەسێلکان زۆر بە نزمی دەفڕن، مانای وایە کە باران دەبارێت. لەنکاو و لەنێو دڵەراوکێ و کپی و خامۆشی خەڵکەکەوە، پاریس پێشی دوانەکەی دی دایەوە. ئیشارەت دراو بە براوە دانرا. هەراو زەنا کەوتە مەیدانەکە، چەپڵەلێدان و هاواری خەڵکەکە دەنگی دایەوە:

– بژی، بژی.

– ئەوە کێیە، نێوی چییە؟

– ئەوەیە کە جلی شوانی لەبەربوو!

– بژی شوانە بژی.

– نێوی چییە؟

– کێ دەیناسێت؟

– دەمانەوێ ناوی بزانین! بژی شوانە!

– حەز دەکەین ناوی بزانین.

لەنێو چەپڵەلێدان و ئافەرین و ستایشەوە، پاریس بەرەو لای شا ڕێنوێنی کرا تا خەڵاتەکەی وەربگرێ. ئەسپێکی ڕەشی جوانی سەراپا بە زێڕو زیو ڕازاوەی درایێ. پاشا دوای ئەوەی خەڵاتەکەی دایە پاریس، لێی پرسی: تۆ کێی؟

– لە کۆتایی یارییەکاندا پێتان دەڵێم. بەر لەوەی کە بزانیت من کێم، پێویستە بزانی کە چ کاروبارێك بەڵەدم.

ڕۆیی تا خۆی بۆ پێشبرکێی دووەم ئامادە بکات، ئێستا نۆرەی هەڵدانی قورس بوو، ئیدی قورسی بەرد یان ئاسن.

یاریزانەکان، یەك لە دوای یەك قورسەکەیان هەڵدەگرت و بە هەموو هێز و توانای خۆیانەوە هەڵیان دەدا. حەشاماتەکە هاواری دەکرد، ئافەرین! باشە!

بەڵام هەموو حەشاماتەکە دڵیان لای ئەوە بوو کە بزانن ئەو لاوە نەناسراوە چۆن قورسەکەی هەڵدەدا.

پاریس، دوا کەس بوو، کاتێ پاریس قورسەکەی هەڵگرت، حەشاماتەکە کپ و کڕ بوو. پاریس لە حەوادا هەڵی سوڕاند، ئەوجا بە دەستە بەهێزەکەی هەڵیدا، کاتێ قورسی بەردەکە کەوتە سەر زەوی دەنگی دایەوە. لەهەموو قورسە هەڵدراوەکانی دی هێوەتر ڕۆیی بوو، هێندە دوور کەوتبووەوە کە ئیدی نەدەبینرا. جارێکی دی حەشاماتەکە ستایشی کابرای براوەیان کرد. حەشاماتەکە هێشتا سوور بوون لەسەر ئەوەی ناوی ئەم لاوە بزانن. پاریس بۆ جاری دووەم چوو بۆ لای پاشا تا خەڵاتەکەی وەربگرێ. کڵاوخودێکی پۆڵاو چەپکێك پەڕی زێڕین و

سەرنێزەیەك بوو.

شا گوتی: ئەی نەناس، نێوی خۆتم پێ بڵێ، چونکە زانیم چ کارێك بەڵەدی.

پاریس وەڵامی داوە: هێشتا هەموو شتێکت نەزانیوە. ئەی پاشا، تەنێ لە پاش تاقیکردنەوەی (بازدان) نێوی خۆم دەڵێم. پاریس، پاش ئەوەی عەرەقەکەی لەشی وشك کردەوە، خۆی شۆرد و لەشی خۆی چەور کرد، ئەوجا تەیار بوو بۆ پازدانێ. لەم میهرەجانەی تەروادەدا باشترین پاریزانی پازدانێ لە هەموو وڵاتە نزیکەکانەوە هاتبوون، یەك بە دوای یەکدا غاریان دەدا، کە دەگەیینە شوێنی دیاریکراو، لەسەر دوو پێیان دەوەستان و بە هەموو هێزێکیانەوە پازیان دەدا. حەشاماتەکە چەپڵەیان بۆ باشترینیان لێ دەدا. هەموو چاوەنۆڕ بوون تا بزانن ئەو کابرا نەناسە چ کارێکی دەکات.

پاریس، پازێکی سەیری هەڵدا: پازێکی خێراو گەورە. بۆڕی هەموو پاریزانەکانی دی دا. بە نێو چەپڵە ڕێزانی خەڵکەکەدا بۆ جاری سێیەم بۆ لای پاشا چوو. پاشا خەڵاتێکی دایێ بریتی بوو لە: کەوانێکی ئێسقان و خورجێکی پر لە تیر. ئەوجا بۆ جاری سێیەم لێی پرسی:

– ئەی جەوان! تۆ کێی؟ نێوت چییە؟

پاشان پاریس ئەو پریاسکە بچوکەی کردەوە کە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، پریاسکەکە هەندێ دەسرازەو پەتۆی تێدا بوو کە شابانۆ هکوبا، خستبوونییە نێو ئەو قوڵێنەیەوە کە کوڕەکەیان تێنابوو بەرلەوەی لە بێشەو لێڕاندا فرێی بدەن.

پاریس گوتی: ئەی پاشای تەروادە، پریامی مەزن، ئەی شابانۆی تەروادە، هکوبای بەڕێز، من پاریسی کوڕی ئێوەم. ئەو نۆبەدارانەی کە لە نزیکی شا بوون، ڕوویان کردە ئاپوراکەو هاواریان کرد:

– قارەمانی براوەی یارییەکان پاریسە، کوڕی پریامە.

دەم ودەست هاواری شادی لە حەشاماتەکەوە هەستا: بژی پاریسی کوڕی شا!

شا بانۆ بە دەم گریانەوە لە ئامێزی گرت، چونکە پێشتر وایدەزانی کوڕەکەی مردووە.

لیا پرسی: بۆچی دەگریا؟

– چونکە خۆشحاڵ بوو، لە خۆشیاندا دەگریا.

لیو گوتی: بەڵام خۆ هەر ئەو بوو کە منداڵە ساواکەی وەدەرنا.

– ئەدی بیرت نییە چەند بەو کارە نارەحەت و غەمگین بوو؟

– بەڵام ئێستاش نەدەبوو خۆشحاڵ ببێ، چونکە تەراودە دەسووتێ.

– ئێستا بیری لەوە نەدەکردەوە، ڕەنگە بیری چووبێ! ئیدی پاریس لە تەروادەدا مایەوە و چوو تا لەگەڵ باب وداك و براو خوشکەکانی دابێ. چوو تا لە کوشکی شادا بژی. بەڵام ژیانی تازەی وەکو خەون دەهاتە بەرچاو، وای دەهاتە بەرچاو کە لە ئۆلەمپدا و لەماڵی خواوەندانە، هیچ کاتێك کۆشکی ئەوەندە جوان، شازادەی ئەوەندە شیك و جوان و جلوبەرگی ڕێکی نەدیتبوو! زۆر خۆییانە ڕەفتاریان لەگەڵ ئەودا دەکرد. هەموو شتێك بۆ پاریس گۆڕابوو، کۆخەکەی ئیژیلایوس، ئوینونە، پەزان، و مێرگوزاران شتانی زۆر دوور بوون و ئەو نەیتوانی بوو تەسەوریان بکات.

هەندێ جار وەبیری خۆی دێناوە: "ئوینونە کێ بوو؟ شوانکارەیەك بوو، ئەگەر بهاتبایە کۆشکی شا سەرسام دەبوو، بێگومان ئێرەی بە دڵ نە دەبوو. ئەو بێشەو جەنگەڵانی پێ خۆش بوو، ئەگەر لەگەڵ خۆمدا بمهێنابایە لە کۆشکی شادا نەدەمایەوە".

پاریس نەیدەویست جارێکی دی بۆ کێوی ئیدا بگەڕێتەوە وباب و داك و خۆشك و براکانی بەجێبهێڵێ. پاریس بەردەوام قەناعەتی بەخۆی دەکرد کە لە تەروادەدا بمێنێتەوەو بۆ لای ئوینونە نەگەڕێتەوە.

لێ ئوینونە، بەتاقی تەنێ لە کێوی ئیدادا دەگریا و نەیدەتوانی دڵی خۆی بداتەوە.

لیو،کە دڵی بە ئوینونە دەسووتا، گوتی: بەڵام حیکایەتی پاریس چەند بە ناخۆشی تەواو بوو!

– تەواو نەبوو، هێشتا حیکایەتێکی دی ماوە: حیکایەتی پاریس و هیسیونە. دەزانی هیسیونە کێ بوو؟ خوشکی پریام شابو. ئەو کەسەی کە هەرقل لە چنگی ئەژدیها رزگاری کرد و بە هاسەوری دای بە تیلامونی پاشای سالامیس.

– ئەمەشمان بۆ باس دەکەی؟

– ئەمڕۆ نا، رۆژێکی دی.

"5"

## حیکایەتی پاریس و هیسیونە

پاریس لە تەروادەداو لە کۆشکەکەی بابیدا دەژیا. هەموو خۆشیان دەویست. هەموو ستایشی جوانی و لێهاتوییان دەکرد. کە بە شەقامەکاندا رەت دەبوو. خەڵکی دەوەستانو تەماشایان دەکرد و دەیانگوت: چەند جوانە، لە سەرەتاوە مەعلوم بوو، رەفتارو هەڵس و کەوتی وەکو ئەوانی دی نەبوو، وەکو براو خوشکەکانی بە ئەتەکێت نەبوو. خراپ نانی دەخوارد...

لیا گوتی: بێگومان بە دەم نان خواردنەوە دەمی دەکردەوە. ئاخۆ چەند زەحمەتی کێشاوە تا فێر بووە لە کاتی نانخواردندا دەم نەکاتەوە.

لیو گوتی: گرێو دەکەم، کە لەکاتی نانخواردندا، ئێسقانی مریشکی بەدەست دەگرت و دەیخوارد.

– بەداخەوە وایە، بەڵام ئەوی راستی بێ لە زەمانی پاریس دا پاشایانیش ئێسقانی مریشکیان بە دەست دەگرت و دەیانخوارد... چ کارێکی تریان لە دەست دەهات؟، خۆ ئەوان مراك و چەتاڵیان نەبوو. تا ئەوکاتانە کەس کەوچك و چەتاڵی دانەهێنابوو. بە دەست نانیان دەخوارد، بەڵام بە زۆری لەکاتی نانخواردندا خۆیان پاك دەهشت.

پاریس هێدی هێدی فێر بوو کە رەفتاری خۆی باش بکات، ئەگەر جاران دەچووە شوانی، ئێستا خەریکی رم ومەتاڵ بوو، ئەگەر جاران مامۆستایەکی وەکو ئێژیولاسی هەبوو، ئەوا ئێستا

پیاوانی بەهێزترو داناتری تەرواده، تەعلیمیان دەدا و ئەوەیان فێر دەکرد کە شایستەی شازادەیەك بوو.

کە پریامی شای تەرواده، زانی کوڕەکەی تەربێتی شازادان فێر بووه، گازی کرد و گوتی: پاریس، تۆ قسە کردن، چەك بەکار هێنان، ئەسپ سواری باش دەزانی و ئێستا وەختی ئەوەیە کە کارێك بکەی.

پاریسی جوان، وەڵامی دایەوه، فەرمان لە تۆو جێبەجێ کردن لەمن،

– تۆ دەزانی کە هەرقڵ ساڵانێکی زۆر لە تەروادەدا شەڕی کرد، بابمی کوشت، هیسیونەی خوشکمی بە زۆر برد و کردی بە هاوسەری تیلامونی شای سالامیس.

– ئاگادارم پریامی گەوره.

– هەرقل مردووه، بەڵام تیلامون هێشتا زندووه، کەواته بڕۆ بۆ سالامیس و داوا لە پاشا بکە کە خوشکەکەم وێداتەوه. ئەگەر نەیویست بیداتەوه، لە بری ئەوه زێڕ و زیوت بداتێ یان یەکێك لە جوانترین لاوەکان، کەواته بڕۆ و هەوڵ بدە گوفتار و کردارت شایستەی شازادەیەك بێ.

پاریس بە قسەی کرد، کەشتی و چەك، و زەلامی ئامادە کرد، ئارد، شەراب، گۆشت، چەك‌و جلی زۆری لە کەشتییەکان بار کرد، ئەوجا بەرەو دورگەی سالامیس وەرێکەوت.

پاش ئەوەی لە دەریای ئیجە و دورگە پەراگەندەکانی تێپەڕی، گەییە سالامیس. بەڵام بە درێژایی سەفەرەکە، کەشتییەکانی چەندین جار وەستان تا ئاو لەگەڵ خۆدا هەڵگرن. سەوڵ لێدەرو و شازادەکان لەو دەمانەدا کە ئامانەکانیان لەسەرچاوەکان پڕ دەکرد چەند جارێك گوێیان لە دەنگی ژنێك بوو بە نێوی هیلین کە هاوسەری منلایوسی پاشای ئەسپارتە بوو. ئەوەی کە هیلینی دیتبوو دەیگوت: " هیچ ژنێك لە دنیادا بەقەد ئەو جوان نییە" ئەوەی کە نەیبینی بوو، پڕ بەدڵ حەزی دەکرد بۆ ئەسپارتە بچێ تا بتوانێ بیدینێ.

کە پاریس ئە هەموو ستایشەی هیلینی گوێ لێ دەبوو، قسەکەی ئافرودێتی بیر دەکەوتەوه. بەهەر حاڵ گەیینە دورگەی سالامیس. پاریس لە کەشتی دابەزی، ویستی هەوەڵجار و بەر لە هەر شتێك زیارەتی پەرستگەی ئافرۆدێت بکات.

بەرەو پەرستگەکە وەڕێکەوت. بەدەم رێوە گوێی لە ئاوازێ بوو گەنجێکی قژ زەرد، کە سازێکی بە دەستەوە بوو، گۆرانی دەگوت. یونانیانی قەدیمی پێیان دەگوت "ئاشق" .

لیو پرسی: گوتت چی؟

– ئاشقا، ئاشقان هەم شاعیر بوون و هەم موسیقازان، خەڵکانی وەکو ئەو ئەمشارو ئەوشاریان دەکرد. بەدەم ساز لێدانەوە گۆرانیشیان دەگوت. ئەو ئاشقانە خەڵکانێك بوون کە شیعری زۆر جوانیان بەگۆرانی دەگوت. داستانی خواوەندان، شازادە وقارەمانیان بە شیعرو ئاوازەوە دەگوت، هەم لەبەر کولبەی هەژاراندا و هەم لەبەر بارەگای پاشایاندا گۆرانی و ئاوازیان دەگوت، خۆشەویستی هەمووان بوون. پاریس کە لەرەخی دەریاوە بەرەو پەرستگەی ئافرۆدێت دەڕۆیی، گوێی لە دەنگی گۆرانی لاوێك بووکە دەیگوت:

" کێ هیلینی، کیژی زیوس، شابانۆی ئەسپارتەی نەدیوه، کێ هێلینی خواوەندی نێو

خواوەندانی ستایش نەکردووە؟ بێگومان ئەوکەسەی کە هیلینی نەدیوە، نازانێ جوانی چییە، ئەو کەسەی کە هیلینی نەدیتووە نازانێ مانای بەختەوەری چییە؟ خۆش بەحاڵی ئەوکەسەی کەتۆی مەبەستە. بەختەوەر دەبێ ئەوپیاوەی تۆ بزەی بەروودا بدەی! دڵی تەژی شیرینی دەبێت و روحی لەنورا دەدرەوشێتەوە."

پاریس گوێی دەگرت و لە دڵی خۆیدا ئارەزووی دیتنی هیلینی نازداری دەکرد کە ئافرۆدێت قەولی دابوویێ بیکات بە هاوسەری. خۆی بە پەرستگەکەی ئافرودیتداکرد، چەندین دیاری بۆ خواوەند هێنابوو: کاروژولەیەکی سپی، دوو کۆتری رازاوە بە گوڵی روزو شمشاد. دیارییەکانی لەسەر مێزە تایبەتییەکەی پەرستگەکە دانا و وەدەرکەوت و بەرەو کۆشکەکە، واتەبەرەو بارەگای تلامون پاشا رۆیی.

– تیلامون، پاشای سالامیس،من پاریسی کوڕی پریامم و لەلایەن پریامی پاشای تەروادەوە هاتووم.

تیلامون شا، کەلەسەر تەخت و لە تەنیشت شابانۆ هیسیونەوە دانیشتبوو پرسی:

– پریامی پاشای تەروادە چی لەمن دەوێ؟

– دەزانی کە هیسیونەی خوشکی پریام، کاتی خۆی هەرقل رفانی و دای بەتۆ، چونکە پریامی شای تەروادە، لەبری هیسیونە نە زێڕی هەبوو نە زیوو نە جلوبەرگی زێڕدۆزی و نە کەنیزەکی جوان، جا ئێستا هیسیونە بدەوە بە شای تەروادە و ئەگەر نایدەیتەوە لەبری ئەوە زێڕ و زیوو، کەنیزەکی جوانو جلوبەرگی زێڕدۆزی بدە، تا من لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوەو بابم خۆشحاڵ بکەم.

تیلامون، ملی بۆ داواکانی پریام نەداو گوتی:

– تۆ زۆر گەنجی، ئەی شازادە، رەنگە بە باشی نەزانی ئەو سەربورە چۆن بوو، هیسیونەی هاوسەری ئازیزم، راستەلەلایەن هەرقلەوە درا بەمن، بەڵام هەرقل بۆیە دای بە من چونکە لەشەڕدا سەرکەوتبوو. ئەوەیان پێ نەگوتووی؟ لایومیدونی بابی باوکت، قەولی بە هەرقل دابوو کە ئەگەر هیسیونە رزگار بکا ئەو دوو ئەسپە سیحراوییەی بداتێ کە زیوس بە دیاری دابووی پێی. بەڵام باپیرت ژیوان بووەوە. ئەوسا هەرقل لە تەروادەدا شەڕی کرد، لایومیدونی کوشت و هیسیونەی بەدیلی گرت و ئەمەش هەقی خۆی بوو، خۆ ئەگەر من بەهاوسەری قەبوڵم نەکردبایە دەبووا کارەکەری بکات. جا بۆیە من هیچ شتێك بە پریام نادەم ئەی شازادەی لاو. بڕۆ و ئەم پەیامەم بە بابت، شای تەروادە رابگەیەنە.

پاریس، ویستی وەڵام بداتەوە، بەڵام لەو کاتەدا شابانۆ هەستاو بە دەنگێکی ناسك گوتی:

– پاریس، برازای خۆشەویستم، لەوەی پتر لە سەری مەڕۆ. من و پریام ئەسیری جەنگ بووین، دەشیا چارەنووسمان لەمە دژوارتر بێ. بەڵام تیلامون داوای لەمن کرد کە شووی پێ بکەم و کردمی بە شابانۆ و من توانیم یەکێك لە دیلەکان کە پریام بوو لە زندان ئازاد بکەم. پریام ناتوانێ داوای هیچ لە تیلامون بکات. بڕۆ ئەی شازادەی گەنج و جوان، بە پریام بڵێ کە خوشکەکەی هەتا هەتایە خۆشی دەوێ.

پاریس لە کۆشکی پاشا ودەرکەوت و بەرەو رەخی دەریا کە کەشتیوانان لەوێندەر چاوەنوڕی

بوون، وەرێکەوت. لە رەخی دەریادا ئاشقە لاوەکە بەدەم سازلێدانەوە، ئەم ئاوازەی دەگوت: " چ کەسێك هیلینی شابانۆی ئەسپارتە، گوڵی جوانیی نەدیتوە؟ هیلین بە بزەی شیرینی، هیلین بەبێ پەچە، کاتێ لەنێو هاودەمانی خۆیدا هەنگاو دەنێ. لەتۆ وایە مانگەو لەنێو ئەستێران دا بە تاقی ئاسمانەوە دەدرەوشێتەوە. هیلین بە قژی وەکو تریفەیەوە، بە چاوانی وەکو دەریایەوە، بە قەد خواوەندان و وەکو ئەوان نەمرو جاویدانە".

پاریس سواری کەشتی بوو، پڕ بەدڵ حەزی دەکرد هیلین ببینێ. پاریس بە هاورێیانی گوت: هەنووکە وەختی حەرەکەتە. پەتەکان بکەنەوە و چارۆکەکان بەرز بکەنەوە. هاورێیان بە گوێی فەرماندەیان کرد، پەتەکانیان کردەوە. بەیداخەکانیان راست کردەوە، چارۆکە سپییەکانیان راکێشایەوە. بایەکی خۆشی هەڵکرد و چارۆکەکان کەوتنە شەکانەوە. ئاوی شین ئاوازی دەریای دەگوت. هەتاو لە ناوەندی ئاسمانێ بوو. ئاو لە پشت سەوڵەکانەوە وەکو زیوی رەوان و زێڕ دەدرەوشایەوە. ئاشقەکە هەر بەو دەقەوە گۆرانی دەگوت و سازی لێدەدا.

– فەرمان بدە ئەی کوڕی پریام، بەرەو کام رەخ، کەشتیانی رەش بە چارۆکەی سپی بگێڕینەوە؟

– بەرەو کەناری هیلاس بگەڕێنەوە. دەبێ لە کەنارەکانی لاکەدایمون، لە وڵاتی شامیلایوس و شابانو هیلین لەنگەر بگرین، سەوڵ لێدەران، بە هەموو تواناوە کەوتنە سەوڵ لێدان و بایەکە کەشتییانی رەشی بەرەو لاکەدایمون هێدی هێدی دەبرد. وەکو چۆن کە کەشتییەکان دەچوونە پێشێ و پاریس و خەڵکی تەروادای بەرەو هیلین دەبرد، منیش حیکایەتێکی دیکە دەربارەی منلایوس و خێزانەکەی باس دەکەم.

"6"

## حیکایەتی ماڵباتی مینلایوس

لەزەمانی زۆر کۆندا، لە وڵاتێکی زۆر کۆندا، دوو برا هەبوون. یەکێکیان نێوی تییست و ئەوی تریان کە زاوای شا بوونێوی ئاتیرە بوو.

ئاتیرە وتییست بەخوێنی سەری یەکدی تینوو بوون. تییست، هاوسەرەکەی ئاتیرای رفاندبوو و ئاتیراش برا خیانەتکارەکەی ترۆ کردبوو و لە وڵات وەدەری نابوو. تییست بێ ماڵ و ماڵبات لەم دنیایەدا سەرگەردان بوو بوو. بەڵام ئاتیرا هەر بەوەندە سوکنایی دڵی نەدەهات کە براکەی بەسەرگەردانی و دەربەدەری ببینێ. دەیویست تۆڵەیەکی سەختتری لێ بسەنێ.

سێ منداڵی تییست لە کۆشك و بارەگای ئاتیرەدا دەژیان: دوو کوڕ و کیژێکی منداڵ. ئەم منداڵانە لەگەڵ منداڵەکانی ئاتیرەدا دەژیان و پێکەوە گەمەو هەڵسوکەوتیان دەکرد. پاش ئەوەی بابیان وەدەرنرا، ئەوان هەر لە کۆشکی پاشایەتیدا مانەوە. ئەمانە هیچیان لەمەڕ خیانەتکاری بابیانەوە نەدەزانی، ئیدی هاپۆ ئاتیرە و ئاگامەمنون و مینلایوس ی ئامۆزایان خۆش دەویست.

رۆژێ ئاتیرە، هەر پێنج منداڵەکەی بینی کە بۆ خۆ سەرگەرمی گەمە و کایە بوون. بیرێکی زۆر زاڵمانە لەکەللەی دا وئیدی وازی لێنەهێنا. دەیویست گۆشتی منداڵەکانی تییست، دەرخواردی "تییست" بدات. بەڵێ ئەمە جۆرە تۆڵەیەك بوو. یەکێك لە سەربازەکانی گاز کرد و گوتی:
دەمەوێ دوو منداڵە هەراشەکەی تییست بمرن. پاش ئەوەی هەردووکیانت کوشت بیانهێننە نك من. پاشان بچۆ بە دوی تییست ی برام داو بە زمانی منەوە پێی بڵێ کە دەمەوێ مەسلەتی دەگەڵ بکەم ولەگەڵی ئاشت ببمەوە و دەعوەتی بکە بۆ کۆشکەکەم.
سەربازەکە، هەردوو منداڵە گەورەکەی تیستی کوشت و هێنانییە لای ئاتیرە و شای بێ رەحم و بەزەیی هەردوکیانی کوت کوت کرد و میوانییەکی گەورەی سازدا. تییست هاتە کۆشك. ئاتیرە بەدەم ئەم قسانەوە "ئیدی هەموو شتێك سڕایەوە و دەبێ دۆستی یەکدی بین" خوڵکی نان خواردنی کرد.
"تییست"یش باوەڕی کرد و دەعوەتەکەی قەبوڵ کرد. خەڵکێکی زۆر دەعوەت کرابوون.
ئاتیرە، لەسەر مێزەکە کوتە گۆشتی بنیادەمی لەت لەتکرد و خوڵکی میوانەکان و براکەی کرد کە بخۆن. میوانەکان لەو گۆشتەیان هەڵگرت و خواردیان. تییستیش لەو گۆشتەی خوارد. بە ئاسوودەییەوە دەیخوارد. چونکە وای بیردەکردەوە کە بەڕاستی ئەمە میوانداری ئاشتبوونەوەیە و بەم بەخشندەییە خۆشحاڵ بوو.
لێ لەپڕ روانییە دەموچاوی براکەی. براکەی پێدەکەنی. پێکەنینێکی سامناك. خوێن لە دەمارەکانیا وەستا. لە هەموو شتێك حاڵی بوو. دەستی لەخواردن کێشایەوە. پارووەکەی دەمی تفاندەوە. بەدەم هاواری سامناکەوە خۆی بە عاریدادا. دەنگ و حاڵی ترسناك بوو. تووك و نەفرینی دەکرد کە خراترین دەرد و بەڵا بەسەر ماڵ و ماڵباتی ئاتیرەدا ببارێت. بەدەم هاوارەوە، لەسەر عاردەکە تلی دەدا. ئەوجا بەدەم هاوارەوە هەستا. ئەوێندەری بەجێهێشت. دوبارە وەکو سەگێك وێڵ و دەربەدەر بوو. زۆر لە ئاتیرە بەداخ بوو. هەرچی بەڵا هەبوو بۆ ئەوی دەویست.
لێ ئاتیرە، هێشتا هەر رازی نەبوو، رقی نەدەنیشتەوە. چونکە رق وەکو ئاگرێکی نادیارە کە زنەگی دەخوات و هەستی تۆڵەئەستێنی بەهێز دەکات. تەنیا خۆشەویستییە کە بتوانێ دای بمرکێنێتەوە. ئاتیرە هێشتا قایل نەبوو و هێشتا بیری لە تۆڵەیەکی دی دەکردەوە. ژیانێکی نارەحەت و تاریکی هەبوو. ئەنجام توانی براکەی دەستگیر بکات و لە زینندانی باوێ.
منداڵەکەی دیکەی تییست لە ماڵی ئاتیرەدا گەورە دەبوو و ئاتیرە هێشتی کە لەگەڵ منداڵەکانی خۆیدا، واتا لەگەڵ ئاگامەمنون و مینلایوس دا پەروەردە بکرێ. منداڵەکەی تییست نێوی ئاژیست بوو. ئەم منداڵە گەورە و تۆکمە و بە خۆوە بوو نەیدەزانی بابی کێیە. کاتێ ئاژیست باش گەورە بوو، هێز و توانای پەیدا کرد. دەستی شمشێری گرت، ئاتیرە گازی کرد و گوتی:
ئاژیست، تۆ دەزانی کە براکەم چەند خراپەی دەگەڵ کردووم. ئێستا کێ وا لە زیندانە و بە زنجیر بەستراوەتەوە. بەڵام لە گوینە هەڵێ و مانی ئەو بۆ ئێمە ببێ بە خەتەرێکی گەورە. جا برۆ و تییست بکوژە. پاشان وەرەوە بۆ لای من، دەچمە پەرستگەکە. دەمەوێ قوربانییەك بە خواوەندان پێشکەش بکەم.

ئاژیست، شمشێرە گەورە و جوانەکەی، کە دیاریی  دایکی بوو. هەڵگرت و یەکرێ بەرەو زیندان چوو. کە چووە نێو زیندانەکەوە بینی کە تییست لە سوچێك دا هەڵتروشکاوە. زنجیری ئەستور لە دەست و پێی دا، قژی بژ و شێواو ئاڵۆزکاو، رەنگی قاوەیی، چاوانی پڕ بریقەی رق و تورەیی.. یەکجار بە زنجیرەکانی نارەحەت بوو.

هەر کە شمشێرەکەی بەدەستی ئاژیستەوە بینی، چارەی گۆڕا. لەپڕ تورەییەکەی رەوییەوە و ماسولکەکانی دەموچاوی خاو بووەوە.

ئاژیست و ێستاو بەبێدەنگی تێی ڕوانی.

– ئەی لاو تۆ کێی؟ ئەم شمشێرە کێ داوییە بە تۆ؟

– ئەمە دایکم وێیی داوم. شمشێرێکی تیژە و هیچ هەڵە ناکات، ئێستا دەزانی.

– گوتت، دایکت؟ ئەدی دایکت لە کێی وەرگرتووە؟

– لە بابم کە من هەرگیز  نەمدیتووە.

– بەڵام ئەم شمشێرە هی منە. من بابتم! شەوێك، لە جەنگەڵێکی پیرۆزدا لە پالاس. کە ئاشنایەتیم دەگەڵ دایکت دا پەیدا کرد، ئەو ئەم شمشێرەی لای من دانا. باش سەیر بکە! بڕوانە نزیکی دەسکی شمشێرەکە: گوڵە هەنارێکی لەسەر هەڵکەنراوە: من هەڵم کەندووە. من باوکتم ئێستا حاڵی بووم کە ئاتیرەی برام ویستوویەتی چ بکات، ویستوویەتی کە تۆ بە نەزانستە بابت بکوژی! پاشان پێت بڵێ کە تۆ بابت کوشتووە!

ئاژیست بە بێدەنگی گوێی دەگرت. هێشتا تۆزێ دوو دڵ بوو، بەڵام وێرای ئەوەش تا رادەیەك قەناعەتی هێنابوو.

– وەرە لای منەوە. ئاژیست کوڕی خۆم! وەرە با دەستەکانت بگرم، بڕوانمە چاوەکانت و نەوازشت بکەم، وەرە با پێکەوە بیر لەتۆڵە بکەینەوە،تۆڵە لە ئاتیرە کە بێ بەزەیی ترین پیاوە.

لیو گوتی: هەق نییە تۆڵە بسەنێتەوە؟

– ئێمە نابێ تۆڵە بسەنینەوە، چونکە ئێمە دەزانین کە تۆڵە سەندنەوە شتێکی زۆر ناشیرینە. بەڵام ئەو سەردەمانە خەڵکی ئەوەیان نەدەزانی. خەڵکی ئەو سەردەمانە لە ئێمە خراپتر بوون. هەموو خەڵکی کەمێك کێوی و هۆڤی بوون. یونیانیانی کۆن کە شارستانیترین خەڵکی دنیا بوون. پێیان وابوو کە تۆڵە شتێکی جوانە.

ئاژیست هەنووکە زۆر شتی بۆ دەردەکەوت! ئەو ساتە زۆرانەی بیر دێناوە کە ئاتیرە بەنەفرەتەوە سەیری کردبوو. گوڵە هەنارەکە بەسەر دەسکی شمشێرەکەوە بوو! تەنێ خاوەنی راستەقینەی شمشێرەکە دەی توانی ئەو نیشانەیە بناسێتەوە.

ئێستا تۆڵەکردنەوە ئاسان بوو. ئاتیرە لە پەرستگەکەدا چاوەنۆڕی ئاژیست و هەواڵی مەرگی تیست بوو. ئاژیست بابی ئازاد کرد و شمشێر بەدەست بەرەو پەرستگەکە رۆیی. لەوێندەر ئاتیرەی بینی کە بەرخی بۆ خواوەندان دەکردنە قوربانی. ئاگامەمنون و مینلایوسش لەوێندەر لە دەف بابیان بوون. ئاژیست لەشا نزیك بووەوە تا قسەی دەگەڵ بکات. بەڵام کە تەواو نزیکی بووەوە. بەر لەوەی ئاتیرە بتوانێ زار هەڵێنێ. شمشێرەکەی کرد بە دڵی دا. شا بێ روح و گیان

کەوتەسەر زەوی. رێك بەو زەربەیە کوژرا کە فێری برازاکەی کردبوو. هەراو هەنگامە و هاواری خەڵکی لە پەرستگەکەوە هەستا و زۆر کەسیش بریندار بوون.

بەڵام کە ئاژیست بەدووی پس مامەکانیدا گەڕا، نەی بینین. کێوە چوو بوون؟ لەوەیە خۆیان شارد بووبێتەوە؟

ئاژیست، پرسیاری لە هەموو نۆبەدارەکان کرد. بەڵام هەموو گوتیان کە نەیاندیتوون. تەنێ یەك سەرباز، کە شازادە بچوکەکانی خۆش دەویست دەیتوانی بە ئاژیست بڵێ کە لە کوێ بۆیان بگەڕێ. بەڵام ئەو سەربازە وای نواند کە ون بوون.

"7"

## هەردوو شازادە ئاگامەمنون و مینلایوس

لە ساڵ و عەیامانی زۆر کۆندا، بەیانییەکی پایز کە هەموو شتێك لە شەونمدا دەدرەوشایەوە، دوو کوڕی لاو مات و بێدەنگ بە ڕێگا سەخت و بەردەڵانەکانی کوێستاندا ڕێیان دەکرد. پێ دەچوو برابن. لە راستیشدا برا بوون. هەر دووکیان قژیان زەرد و جوان بوو، غەمبار و چاو پڕ لە فرمێسك بوون. بە تاقی تەنێ بەرەو چیاو کوێستانان دەچوون. بەڵام وەکو خەڵکی کوێستانان کراسی ئەستووری خورییان لەبەر نەکردبوو. کراسە سپییەکانیان لە زێڕدۆزی دا دەبریقایەوە، پێڵاوەکانیان وەکو پێڵاوی پاشایان بە زێڕ رازابووەوە، ڕێیەکی زۆریان بڕی، ماندوو بوون. لەنکاو یەکێکیان کە مندالْ تربوو وەستا.

– ئاگا مەمنون، ئیدی ناتوانم ڕێ بکەم، با تۆزێ تەنیا تۆزێ، ئیسراحەت بکەم. شەوو ڕۆژێکە بەڕێوەین، ماندوو برسیم.

ئاگا مەمنونی براگەورە، ڕوانییە دەوروبەر چ کەسێکی لە کوێرە ڕێگاگەی لێرەواردا نەبینی، جگە لە ورشەی گەڵاو پەلکی داران، لەو بەیانییەدا، چیتر نەدەهاتە گوێ.

– نە چ کەسێك دیارە و نە چ دەنگێك دێ. زۆر لە شارەوە دوورین؟ لە ئاژیست دەترسم. بێگومان دوامان دەکەوێ.

– مینلایوس، براکەم، تۆزێکی دی برۆ، یەك تۆزی دی! لێ مینلایوس، کەوت. چاوانی نوقاندن و چ وەڵامێکی نەدایەوە. ئاگامەمنونی برای زۆر ترسا. وایزانی براکەی مردووە. دەبێ فریای بکەوم! دەبێ ڕێی بدەم ئیسراحەت بکات و خواردنی بۆ پەیدا بکەم.

ئاگامەمنون گوێی هەڵخست، لە دوورەوە دەنگێکی ژنەوت، لە دەنگی چێڵان دەچوو.

– بەڵێ دەنگی چێڵە، کەواتە دەبێ شوانکارە و گاوانان لەم دەروبەرە هەبن، رزگاربوونمان مسۆگەرە! ئاگامەمنون براکەی جوان داپۆشی، دیسان گوێی هەڵخست. ئەوسا بەتاقی تەنێ ملی ڕێگای گرتەبەر. مینلایۆس بە دەنگێکی کز و بێ توانا لە براکەی پاڕایەوە:

– ئاگامەمنون، مەڕۆ، بە تەنیا جێم مەهێڵە!

– بەجێت ناهێڵم، دەچم کەسێك دەدۆزمەوە کە یارمەتیمان بدات. دەنگی چێڵەکان زۆر دوور نییە، گوێت لێیە؟ دیارە شوانکاران لەوێندەر هەن، لەوەیە ڕێگەمان بدەن کە لەماڵی ئەواندا ئیسراحەتێ بکەین. مەترسە میلایۆس. زوو دەگەڕێمەوە.

هەولی دا هەستێ، بەلام نەیتوانی. ئاگامەمنون، بەنێو دار و درەختاندا، بەرەو دەنگەکان، بە کێوەکەدا هەڵگەڕا. هەتاو لە لوتکەی کێوەکانەوە دەدرەوشایەوە. دارستانەکە لەگەڵ شنەبای بەیانیدا دەجولا.

لیو پرسی: چۆن، دەجۆلا؟

– درەختان هەموو بەیانییەك وەکو ئێمە رادەبن، گیاو گوڵ و بنچك و دەوەن و باڵداری بچوك لەزەت لە روناکی و گەرمایی هەتاو دەبینن، لێ ناتوانن بڵێن: ئەی رووناکی، ئەی هەتاو سوپاس بۆ ئێوە! بەلام بە شێوازێکی دی سلاو لە سپێدە دەکەن. باڵندان دەخوێنن و دەفڕن. ئەنجام سەرانسەری دارستان لە نێو هەتاودا دەجولێ. هەموو بەیانی و سپێدەیەك ئەم کارە دەکرێ، ئەو سپێدە پایزییەش هەمووان سلاویان لە هەتاو دەکرد. دەنگی چێڵەکانیش کە ناو بەناو لەگەڵ شنەی شەماڵدا دەهات، لە سلاوی بەیانی دەچوو، بەلام ئاگا مەمنون گوێی لەو سلاوی بەیانییە نەدەبوو، لەزەتی لە کەیف و شادی سپێدە نەدەبینی. ئەو بیری لە بابی دەکردەوە کە بە خیانەت کوژرابوو، بیری لە ئاژیستی هاوڕێی منداڵی دەکردەوە. بیری لە پەرستگەکە دەکردەوە. بیری لەو دیمەنە سامناکە دەکردەوە کە چۆن شمشێرەکە بەدڵی شادا چوو. بیری لە هەراو هەنگامەی نێو پەرستگەکە و لە هاواری "کورینە هەڵێن" دەکردەوە.

ئەو رۆژە سەربازێك بەرێی کردن و بەخۆی گەڕایەوە. پاش ئەوە خۆیان لە کوێرە رێییەکدا بینییەوە. هەر رۆیشتن و رۆیشتن تا لە شار دوورکەوتنەوە. چونکە ئەو سەربازەی پێی گوتبوون کە تییست ئازادە و خەتەرێکی گەورە هەڕەشە لەمان دەکات.

ئاگامەمنون، بە خەمبارییەوە بەنێو درەختانی شکۆداری پڕ لە ئاواز و فرینی باڵندانەوە تێدەپەڕی. بەرە بەرە دەنگی حەیوانەکان نزیکتر دەبووەوە. بارەباری پەزان دەهات. بەرخۆڵەیەکی بچوکی سپی. بەغاردان دەرکەوت. کۆختەیەك لەنێو درەخت و چیمەنەکانەوە بە دیارکەوت. ئاگامەمنون کە خۆی دابووە پەنای دار بەڕوویەکی زەلام نیگایەکی کوختەکەی کرد. لەبەردەم کۆختەکەدا، ژنێکی جحێڵ، لای لایەی بۆ منداڵە شیرەخۆرەکەی دەکرد و رای دەژاند. مێردەکەی لەنێو گیایەکەدا مەڕەکانی دەدۆشی، کچێکی منداڵ بە خۆشحاڵی و بەدەم پێکەنینەوە دووی بەرخۆڵەیەك کەوتبوو تا بیگرێ، کچەکە بەدەم راکردنەوە گەییە ئاستی ئەو درەختەی کە ئاگامەمنون خۆی دابووە پاڵی. تۆزێك سەرسام بوو. پاشان بۆلای دایکی غاریدا.

– دایکە، لەوێندەر، لە پشت دار بەڕووەکەوە پاشایەك بە جلوبەرگی زێڕەوە خۆی مات داوە، وەرە سەیری بکە دایکە.

– مەحاڵە! مەگەر خەونی پێوە بدینی! ئاه، راستە!

ئاگامەمنون لە پەنای درەختەکە هاتەی دەرێ و بەدەم قسەکردنەوە لەگەڵی بەرەو کوختەکە چوو.

ئەو وەزع و حاڵە شوانکارەییە، سام و تامی خۆی هەبوو! نووکە ژن و مێرد هەردووکیان لە نزیکی ئاگامەمنون بوون.

– من شا نیم، تەنیا کوڕە پاشام. من و برایەکم ڕێمان گوم کردوە و ماندووین، دەتوانن یارمەتیمان بدەن و تۆزێ نان و شیرمان بدەنێ تا بگەڕێینەوە؟ ڕێمان دەدەن لە پاڵ ئاگرەکەتان دانیشین؟ زۆرتان لێ مەمنون دەبین. بەڵکو ڕۆژێ لە ڕۆژان بتوانین چاکەتان بدەینەوە.

ژنەکە بەمیهرەبانییەوە گوتی: شازادە، باسی دانەوەی چاکە مەکە. ئەگەرچی هەژارین، بەڵام ئەوەندەش هیچ و پوچ نین دەست بەرووی خەڵکییەوە بنەین. فەرموو ئەو شیرە بخۆ، ببورە لە قاپی سواڵەت دایە. تۆ فێری لە قاپی زێڕ و زیوودا شیر بخۆیەوە. بەڵام ئاگامەمنون ئاگای لە قاپی جوان یان ناشیرین نەبوو. شیرە نیمچە گەرم و دوکەڵاوییەکەی وەرگرت و یەك بین خواردییەوە.

– زۆر سوپاس، بەراستی ئینسانێکی چاکی. تکات لێدەکەم فریای براکەشم بکەوە. لەولایەوە، تۆزێ لێرەوە دوورە، ماندوو و برسی لە عاردی کەوتووە.

ئاگامەمنون بەرەولای مینلایوس کەوتە ڕێ، شوانەکەش بە قاپێك شیرەوە شوێنی کەوت. ژنەکەش بۆ ئەوەی ئاگر بکاتەوە و جێی حەوانەوە بۆ میوانەکان ساز بکات، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی چیلکە و گەڵا.

شوانەکە و ئاگامەمنون، مینلایوس یان لەگەڵ خۆدا هێناو گەڕانەوە. لە خانووە پەرپوتەکەیاندا ئاگر کرابووەوە. ئاگرەکە نێڵە نێل دەسووتا. دەنگی سووتانی دار دەهات. هەموو لەدەوری یەکدی ڕۆنیشتن: کوڕانی پاشا و خانەوادەی شوان.

دایکێ بێدەنگ بوو.

لیو پرسی: پاشان چی بوو؟

– پاشان؟ بوەستە تا ئەوان ئیسراحەت بکەن. چونکە ئەو ڕۆژە کوڕانی پاشا لە نك شوانە مانەوە و سبەینێی ڕۆژی دوایی دووبارە کەوتنەوە ڕێ. لە کۆتاییدا، ئێستا کە زانیت ئاگامەمنون و مینلایوس دۆستیان پەیدا کردووە، دەتوانی بە خۆشحاڵییەوە سەبر بکەی.

"8"

## پاشماوەی سەربوری
## ئاگامەمنون و مینلایوس

ئاگامەمنون و مینلایوس لەماڵی شوانە مانەوە. دڵنیام کە هیچ کاتێك لە ژیانیاندا ئەوەندە خۆشحاڵ نەبوون.

میناڵیوس، قسانی نەدەکرد. زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە بەرە بەرە ئیسراحەتی دەکرد و گەرم دەبووەوە: شوانە و خێزانەکەی لە ئاستی ئەم میوانە گەورانەدا هەستیان بەشەرمەزاری دەکرد و قسانیان نەدەکرد.

بەڵام ئاگامەمنون کە بیری لە داهاتوو دەکردەوە، پرسی: ئەی شوانی میهرەبان، بڵێ بزانم تۆ رێگەی ئەسپارتە، شارە ناوادارەکەی شاتونداریوس دەزانی؟

– بەڵێ چەندین جار بۆ پەنیر فرۆشتن چووم بۆ ئەوێندەر. ئەسپارتە شارێکی جوان و مکومە. چیا دەوری هەر چوار نکالی شارەکەی داوە. تونداریوسی. شای ئەوێندەر پیاوێکی دڵاوا بەخشندەیە. لیدای شابانۆش گەردنێکی درێژی هەیە.

لیو پرسی: گەردن درێژی پەیوەندی بە حیکاتەکەوە چییە، دەبێ ئەوە بزانین کە مرۆڤێکی باشە یان نا.

– راستە شوانەکە هەرچییەکی دەزانی ئەوەی دەگوت. لیدا، بە گەردن درێژی بەنێوبانگ بوو نەك بەباشی. شوانە دەیویست وا بنوێنێ کە ئەویش ئاگای لە هەندێ شتە. خولاسە من وا تێدەگەم کە ئاگامەمنون لە شوانەکە باشتر چاکی و خراپییەکانی تونداریوس و لیدای دەناسی، چونکە هیچ پرسیارێکی لەمەڕ ئەوان نەکرد. تەنێ پرسیاری رێگەکەی کرد.

– بە چەند رۆژ دەگەیتە ئەسپارتە؟ تۆ دەتوانی رێگەکەمان پێ نیشان بدەیت؟

شوانە گوتی: بەسەرچاوان رێگاتان پێ نیشان دەدەم. لێ جارێ دەگەڵ براکەتدا لەم کولبەیەی بەندەدا پشوویەك بدەن. چونکە بەم حاڵەوە توانای سەفەرتان نابێ.

ئەو دووڵاوە ئەو رۆژە و شەوی دواتر لە ماڵی ئەو ماڵباتە هەژارەدا مانەوە، ئەوسا بۆ سبەینێی دواتر بەرەو ئەسپارتە وەرێ کەوتن. هاوسەری شوانەکە، یەك سەبەتە نان و پەنیری بۆ ئامادە کردن تا لە رێگەدا پەکیان نەکەوێ شوانەکەش ماوەیەکی باش لەگەڵیاندا چوو و هاورێتی کردن. ئاگامەمنون و میناڵیوس دووبارە کەوتنەوە رێ. غەمگین بوون. بەڵام بە ئەندازەی رۆژی پێشوو نا، چونکە تووشی ماڵباتێکی میوانپەروەر بوو بوون و ئومێدیان کەوتبووە دڵ کە خەڵکانی دیکەی وەکو ئەو ماڵباتەیان لێ هەڵبکەوێ.

هەر رۆیشتن و رۆیشتن تا لە ئەنجامدا گەییـنە دۆڵ و خەرەندێکی قوڵ کە ئەسپارتە لەوێندەردا دروست کرابوو. لە بەرزییەوە، شاریان بینی کە رووبارێکی وەکو زیو بە ناویدا تێدەپەڕی. لە رەخێکی رووبارەکەدا، لە نێو سەوزە گیادا، کیژانی پارچەڵە، بە جلکی سپییەوە کایەیان دەکرد. ئەو کیژەی کە سەرپەرشتی کایەکانی دەکرد، کلیتم نیسترای کیژە گەورەی تونداریوس بوو، ئەو کیژەش کە لەلایەوە وێستا بوو، قژی لە شێوەی تاجدا بادەدا و دەهۆنییەوە، هیلینی خوشکی کلیتم نیسترا، بوو. ئاگامەمنون و میناڵیوس، درێژەیان بەرێی خۆ دا و بەرەو کۆشکە شکۆدارەکانی شاتونداریوس رۆیشتن و لە نزیکی دەروازەکانی کۆشکدا وەستان. زۆر نەوەستان. شا لە کۆشك وەدەرکەوت و لەسەر یەکێك لە تاوێرە سپی و ساف و بریقەدارەکانی بەردەم کۆشك دا دانیشت. کەستور و پولودیوکیسی کوریشی لەگەڵیدا هاتنە دەرێ. ئەوجا ئاگامەمنون و میناڵیوس چوونە بەرەوە. وەکو عادەت و دابی هەمیشەیی، لە پێناوی داوای

شتێکدا لەبەردەم پاشادا چۆکیان دادا. ئاگامەمنونی برا گەورە گوتی:

– ئەی شای دەسەڵاتدار، توندار‌یوسی مەزن، تکات لێدەکەین، دوو بەدبەختی بێ وڵات و بێ ماڵی بێ باب  و داك، لە لای خۆت گڵ بدەوە. ئێمە لە نێو گەمارۆی دژمنانێکداین کە مەرگی ئێمەیان دەوێ.

ئاژیست ئاتیرەی بابمانی کوشتووە. ئێمە لە مسینیەوە هەڵاتین، دەنا ئاژیست ئێمەشی دەکوشت. ئەی پاشا، رەحممان پێدا بکە، بیکە بە خاتری ئەوەی کە لەلات ئازیزە، بیکە بەخاتری منداڵەکانت، بیکە بە خاتری ئەو خواوەندانەی کە دەیانپەرستی. دەستەو دامێنت بووین و داڵدەمان بدە.

لیو پرسی: چۆن بیکات بە خاتری خواوەندان.

– بەڵێ، نە دەبوو بڵێ مەعز بۆ رەزای خوا. چونکە یونانیانی کۆن یەکتاپەرست نەبوون، بەڵکو چەندین خواوەندیان هەبوو، و باوەڕیان بە هەموویان هەبوو. بۆیە هەمیشە دەیانگوت. بۆ خاتری خواوەندان!

– بەڵێ کاتێ ئاگامەمنون قسەی دەکرد، توندار‌یوس، بەسەرسامی دەیڕوانییە ئەو و براکەی: ئایا بەڕاستی ئەو دوولاوە کوڕی ئاتیرە بوون؟ یانی ئەمانە ئەو دوو کوڕەن کە ئەو چەندین جار لە مەیدانی کایەدا لە نێو چێمەناندا دیتبوونی! بەڵام هەنووکە دەستەو ئەژنۆ دەگریان! جلەکانیان ناسك و تەنك بوو، لێ پێدەچوو لە ڕێگەدا درك کون کونی کردبن، پێڵاوەکانیان بە زێڕ رازابووەوە، بەڵام تەپ و تۆزاوی و دڕاو بوون. هەڵبەتە شا دەیویست یارمەتییان بدات! بەڵام چۆن لەو لاوە تییست بوو بوو بەخودانی مسینی و مەعلوم نەبوو چەند سەربازی لە عۆدەدا بوو، توندار‌یوس، لایەنگری ئاشتی بوو رقی لەشەڕ بووو لە شەڕ بێزار بوو. بۆ یارمەتی دانی ئاگامەمنون و مینلایوس دەبوایە لەشکر و قۆشەنیان بداتێ. توندار‌ویوس بیری لەم شتانە دەکردەوە. ئاگامەمنون کە بینی دو دڵە دووبارە لێی پاڕایەوە:

– ئێستا ژیان و مەرگی ئێمە کەوتۆتە دەستی تۆ. ئەی پاشا فریامان بکەوە. بەخۆت دەزانی هێشتا چەند جەوانین و هەوەڵی عەمرمانە. ژیان جوانە و نوری هەتاو بۆ ئێمە شیرینە، ئەگەر تۆ وەدەرمان بنەی، ناچار دەبین شارەو شار بگەڕێێن و لەوەیە لە جەنگەڵاندا بمێنینەوە و لە برسان بمرین! ئەی پاشا دەستمان پێوەمەنێ! ئەگەر تۆ بمانپارێزی خواوەندانی دۆستی چاکەکاران دەتانپارێزن.

شا گوتی: ئەی لاوان، لە هیلاس دا شایان زۆرن، ئایا کەسێك هەیە کە لەمن باشتر کۆمەکتان بکات؟ من لە ماڵی خۆم گلتان دەدەمەوە. ڕێتان دەدەم ئیسراحەت بکەن. جلك و خواردنتان دەدەمێ. بەڵام کە حەسانەوە و تێر بوون دەتانێرم بۆ لای نیستوری شای پولوس. نیستور بە داوێن پاکی مەنشورە. کەسکێی باش و بە توانایە و هەر کەسێك تەگبیرێکی بوێ دەچێتە نك ئەو. هەم  دەتانپارێزێ و هەم پێتان دەڵێ چ بکەن.

کوڕانی ئاتیرە، بە دەم گریانەوە، جارێکی دی لە توندار‌یوس پاڕانەوە. لەو کاتەدا کە چۆکیان دادا بوو دەپاڕانەوە و دەگریان، دووان لە کیژانی شا وەژوور کەوتن. یەکێکیان کە هەنگاوی

پتەوی دەنا. کلیتم نیسترای کیژە گەورەی پاشا بوو ئەویتریان هیلین بوو. کە بەلای ئەو دوولاوەدا رەت بوون و بەو حاڵەوە بینیانن راوەستان و کلیتم نیسترا بەتەوسەوە نیگای کردن. لیٚ هیلن چوو بۆ لای پاشا و بە سۆز و گودازەوە پرسی:

– ئەوانە چییانە؟ بۆ دەگرین؟

ئاگامەمنون دووبارە سەربوری خەمینی خۆیانی گێڕایەوە. مینلایوس بێدەنگ و رەنگ پەڕیوو، دەیروانییە شازادە هێلین کە لە بەرانبەری دا چۆکی دادابوو و بۆ کوڕانی ئاتیرە دەپاڕایەوە.

– خۆتۆ ناتەویٚ دەست بەرووی ئەم لاوە بەلەنگاز و لێقەوماوانەوەبنەی؟ وا نییە باوکی ئازیزم؟ من لێت دەپاڕێمەوە و پێت دەڵێم کە ئەگەر رۆژێك براکانم لێیان بقەومیٚ و داوای یارمەتی بکەن، بیر بکەوە کەئەگەر پاشایەکی دی یارمەتییان بدات چەند خۆشحالٚ دەبێت؟

هیلین هێندە بە سۆزەوە تکای دەکرد و دەپارایەوە کە تونداریوس نەیتوانی بلٚیٚ نە، جووتە برای دالٚدەدا. جلوبەرگ و خۆراك و چەك و سەربازی دانیٚ تا بتوانن دژی ئاژیست بجەنگن.

ئاگامەمنون و مینلایوس، بەسەرکردایەتی لەشکرێك دووبارە هەمان رێگەیان گرتەوە بەر. مینلایوس لە رێگەدا هەر بیری لە هیلین دەکردەوە. بەلاٚم ئاگامەمنون بیری لە نیگای تەوس ئامێزی کلیتم نیسترا، لە مسینی و لە بابی کوژراوی دەکردەوە. لە دلٚی خۆیدا دەیگوت: من بەسەر ئاژیست تییستدا سەردەکەوم. وەختیٚ سەرکەوتم دەگەڕێمەوە بۆ لای توندارییوس. پاشان دەبم بە پاشای مسینی و لەگەلٚ شازادە کلیتم نیسترادا زەماوەند دەکەم.

"9"

## سەربوری

## شازادە هیلین و شازادە مینلایوس

مینلایوس. بەخەیالٚی هیلینەوە چووە شەڕ و بە هەمان خۆزیا و تاسەوە بۆ ئەسپارتە گەڕایەوە. چونکە کاتیٚ ئەوی بینی بوو کە لەبەردەم توندارییوس شادا چۆکی دادا بوو بۆ ئەو دەپاڕێتەوە، دلٚی پێداچوو بوو و حەزی لێکردبوو. ئەگەر هیلین ئارەزووی گولێکی دەگمەن و نایابی بکردایە. مینلایوس رووی دەکردە مێرگ و لێرەوارانی دوور و بەدووی ئەو گولٚەدا دەگەڕاو بۆی پەیدا دەکرد و دەیهێنا بۆی.

ئەگەر هیلین لە لێرەوار و بێشەدا ئاسکیٚ یان حەیوانەکێویەکی دەبینی و دەیگوت "چەند جوانە، بریا هی من بوایە" ئیدی مینلایوس کێچ دەکەوتە کەولٚی و بەغار دووی ئاسکەکە یان حەیوانە کێویەکە دەکەوت و بۆ هیلینی دەهێنا. لیٚ مینلایوس هیچ کاتێك دەگەلٚ شازادە هیلین دا باسی زەماوەند و هاوسەری نەدەکرد، چونکە دەیزانی هەرچی لاوانی هلاسە، هەچی قارەمانانی بەهێز

هەن، شایانی دەوڵەمەند و زەنگین و کوڕەشا، بەتەمای ئەوەن زەماوەندی لەگەڵ بکەن و چاویان لەوەیە بیکەن بە هاوسەری خۆیان. بەڵام مینلایوس هیچی نەدەگوت. هەوڵی دەدا شایستەی ئەو بێ، ڕۆژ لە دووی ڕۆژ باشتر و بەهێزتر ببێ.

لیا پرسی: شایسە چییە؟

دایکەکە گوتی: لیو، شایسە مانای چییە؟

لیو گوتی: دەیزانم، بەڵام ناتوام ڕوونی بکەمەوە.

لیا گوتی: کێ بۆی شەرح کردویت؟

– کەس، خۆم بەرەبەرە فێری بووم، ئەمە شتێکە کە نایەتە شرۆڤە کرن.

دایکی لیو گیری خواردبوو، بەڵام لەئەنجامدا ماناکەی دۆزییەوە.

– ئەها، واتای شایستە بوون، یانی بتوانێ لایەقی ئەو بێ نەوەسایە لیو؟

– بەڵێ، وایە: لایەقی ئەوە بێ. مینلایوس هەوڵی دەدا بەدڵی هیلین بێ و پەسندی بکاتو پاشان زەماوەندی لەگەڵ بکات.

– پاشان بۆمان بەدیار دەکەوێت کە زەماوەند لەگەڵ هیلین دا کارێکی ئەوەندە ئاسانیش نەبوو. لە هەر چوار نکالی هیلاسەوە واتا لە هەموو لایەکی یۆنانی ئەمڕۆوە کە ناوی هیلاس بوو، پاشایان، قارەمانان، میران دەهاتنە دیتنی شازادە هیلین و هەر کە چاویان پێی دەکەوت و ئاشقی دەبوون و دەچوونە نك توندرایوس شاو خوازبینیان دەکرد.

تونداریوس شا، تیا مابوو، نەیدەزانی لەنێو ئەم هەموو خوازبێنیکەرانەدا کێ هەڵبژێرێ؟ یەکێك لەو خوازبێنیکەرانە ئاشیلی ڕۆڵەی تیپس و پلیوس بوو، کە بەهێزترین و نەجیبترین لاوی هیلاس بوو. بەڵام ئاشیل زوو دەمرد و هەموو کەسیش ئەمەی دەزانی. چونکە خواوەندان بە ئاشیل یان گوتبوو لەنێوان ژیانێکی کورتی شکۆدار و ژیانێکی درێژی بێ شانازی یەکێکیان هەڵبژێرێ. ئاشیلیش ژیانە کورتەکەی هەڵبژارد بوو، بۆیە ئەگەر هیلین ببوایە بەهاوسەری، بە زوویی بێوەژن دەکەوت. ئاژاکسی کوڕی تیلامونش هاتبووە خوازبێنی هیلین. ئەویش قارەمانێکی گەورە بوو، سەربازێکی زۆری لەبەر دەست دابوو. خوازبێنیکەرێکی دی دیومیدوسی کوڕی گودیوس بوو ئەویش هەم پاڵەوان بوو و هەم لەلایەن ئاتینای خواوەندی جەنگ و حیکمەتەوە پشتیوانی لێدەکرا. یەکێکی دی لەو خوازبێنیکەرانە فیلوکتیستی بوو. جەنگاوەرێکی بە نێوبانگ بوو. کە تیروکەوانەکەی هەرقلی بەدەستەوە دەگرت، کەس نەیدەتوانی شان لە شانی بدات و لەبەری بکۆکێ.

لیو پرسی: تیرەکان جادویی بوون؟

هەڵبەتە پاترۆکلوسی دۆستی ئاشیل و مینلایوسی برای ئاگامەمنون و ئودیسەی پاشای ئیتاکاش هاتبوونە خوازبێنی. ئودیسە یان ئولیس شازادەیەکی بە توانا و زیرەك و بنیادەمێکی زانا و زمان ڕەوان و پاراو بوو. ئەویش وەکو ئەوانی دی هاتبوو بۆ ئەسپارتە تا لەگەڵ هیلین دا زەماوەند بکات. خواستگارەکان هەموو ڕقیان لە یەکدی بوو، هەر یەکەیان هەڕەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەگەر هیلین بۆ ئەو نەبێ، ئەوانی دی دەکوژێت.

تونداریوس لە نێو ئەم هەموو عاشقەدا، نە ئارامی هەبوو نە قەرار، بەردەوام لەبیرکردنەوەدا بوو. ئەگەر بڕیاری بدایە کە هیلین بە یەکێکیان بدات. ئەوا هەموو شازادەکانی دی تووڕە دەبوون و کەس نەیدەزانی چ دەقەومێ، تونداریوس ئەقڵی بە هیچ کوێ ڕا نەدەگەیی، هەموو ڕۆژێك تکای لە شازادەکان دەکرد سەبر بگرن و پەلە نەکەن. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: تۆ بڵێی کەسێك پەیدا ببێ و فریام بکەوێ و لەم سەریشەیە ڕزگارم بکات! تۆ بزانە بە هۆی جوانی هیلینەوە تووشی چ گێچەڵێك بووم! کلۆڵ خۆم! بەدبەخت دەبم!

تونداریوس، مەسەلەکەی دوا دەخست، شازادەکان ڕۆژ لە دووی ڕۆژ پتر گوشاریان بۆ دێنا، بەڵام ڕۆژێك ئودیسە کە لەهەر هەموو خواستگاران ئاقڵتر و بەپارێزتر بوو، لە رووی بەتەنگەوە هاتنەوە گوتی:

– پاشای ئەسپارتە، پێویستە تا زووە ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەی. دەنا ڕووداوی قورس لەبەر دەرباردا روو دەدا. نابینی خوازگاران هەراو هەنگامەیان روو لە زیادییە. ئەم وەزع و حاڵە ناچێتە سەر، دەتەقێتەوە.

– هەق بە تۆیە ئودیسەی دانا، بەڵام تەگبیرم چییە؟ بریا هەمووان وەکو تۆ بن و لێم حاڵی بن، بەڵام هەموویان وەکو تۆ نین، من زۆر دەترسم کە ئەگەر یەکێکیان هەڵبژێرم ئەوانی تر ڕق لە من هەڵگرن و هەموویان دژی من و هیلین و زاوا یەك بگرن و پەلامارمان بدەن! تۆ دەتوانی تەگبیرێکم بۆ بکەی؟ ناتوانی ڕێگەیەکم بۆ بدۆزییەوە؟

– ئەی پاشا، منیش بۆ ئەم مەبەستە ویستم قسەت لەگەڵ بکەم، تا تەگبیرێکت پێ بڵێم، من چارەسەرم دۆزیوەتەوە. زۆریش ئاسانە.

– ئاسان؟ بەراستتە؟ بڵێ بزانم ئەو تەگبیرە چییە ئودیسەی دانا. ئەگەر تۆ یارمەتیم بدەیت، من تا ماوم مەمنونت دەبم. تۆ بەم کارە وڵاتەکەمان لە چەندین شەڕو شۆڕ ڕزگار دەکەی!

– پاشای تونداریوس، تەگبیرەکە ئەمەیە: پێویستە هەموومان لە دیوەخانی کۆشك دا کۆ بکەیەوە و یەك یەك سوێندمان بدەی.

– چ سوێندێك؟

– دەبێ سوێندمان بدەیت کە ئێمە لە نێو خۆمان داو دەرهەق بە تۆ، بەهیلین و بە زاوا هیچ غەڵەتێك نەکەین و هەر بەچاوی دۆستەوە سەیرتان بکەین، ئیدی بەمجۆرە هیچ جۆرە شەڕێك ناقەومێ.

تونداریوس پاشا، لە خۆشحاڵیدا لە پێستی خۆی نەدەهێوری: سوپاس عەزیزم، زۆر سوپاس تۆمەز ئەم هەموو ستایشەی تۆ بە خۆڕایی نییە. کەس لەتۆ بە ئاوەزتر نییە! جا من بە تەگبیرەکەی تۆ دەکەم. سوپاس. هەزار جار سوپاس.

پاشای ئەسپارتە، جاڕچی، واتە ئەو پیاوەی کە دەستوور و فرمانی شای بە خەڵکی ڕادەگەیاند، گاز کردە لای خۆی:

– جاڕچی، هەرە هەر هەموو شازادەکان کۆ بکەوە. پێیان بڵێ کە من قرێری خۆم داوە. پێیان بڵێ با بێن گوێم لێ بگرن. جارچی، بەلەز لە بارەگای پاشا وەدەرکەوت. کەوتە نێو شەقام و مەیدانان

بـه دووی شـازادان و پاشـایان و قارەمانانـدا. هـەموو ئاگـادار کرانـەوە و لـە دیوەخـانی گـەورەی کۆشکدا خڕ بونەوە.

هەموو بیٚ قەرار و روح لە مست لە یەکیان دەپرسی: دەزانی قرێری توندارویس شا چییە؟ تۆ نایزانی؟

ئودیسـە، لـە نێـو هەموویانـدا بـە بێدەنگی چاوەنۆڕ بـوو. رێـك لـەم کاتـەدا پاشـای ئەسـپارتە و کیژەکـەی وەژوور کـەوتن، پاشـا چـووە سـەر تـەختی پاشـایەتی و هیلیـنش لـە تەنیشـتییەوە دانیشـت. پاشـا گـوتی: شـازادان قارەمانـان و دۆسـتانی ئـازیز، مـن ئەمرۆکـە زاوایـەك بـۆ هـیلین هەڵدەبژێرم، بەڵام بەرلەوەی ئەم کارە بکەم دەبیٚ لەبەردەم من و هیلیندا سوێند بخۆن.

– سوێندی چی؟

–کام؟

– بیلێن!

– سوێندەکە بڵێن!

– هەر سوێندێکتان بویٚ، بۆتانی دەخوێن!

– سوێند دەخۆین و تەواو، ئیدی بۆ بەدەم چاوەڕانییەوە دیقمان پێدەکەن!

– هەر هەموومان سوێند دەخۆین!

– سوێندەکە بڵێن.

ئەو خەڵکەی لە دیوەخانەکەدا جەم بوو بوون، لەسەر ئاوو ئاگر بـوون تـا بـزانن دەبـیٚ بـە چ شـتێك سوێند بخۆن. توندرایوس پاشا لەسەری ڕۆیی: قارەمانان، شازادان، سوێند بخۆن کە نەچن بەگژ یەکدا، هـەموو سـوێند بخـۆن کـە زاوا هـەر کەسـێك بـیٚ بـوغزی لـیٚ هەڵنـەگرن و خۆشـتان بـویٚ و لەگەڵی بەشەڕ نەیـەن. بـەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەگـەر یـەکێك بیـەویٚ هیلین لـە مێردەکـەی بڕفێنیٚ، دەبیٚ ئێوە بە هەمووتان سزای خەتاکار بدەن. سوێند بخۆن؟

شـازادەکان هـەموو بەیـەك دەنـگ هاواریـان کـرد: سـوێند دەخـۆین! دیوەخانەکـە خـەریك بـوو لـە دەنگـی ئەوانـدا دەتەقییـەوە. پاشـان تونـداریوس فـەرمانی دا چـەند سـەر بـەرخ و بـزن بێـرن و پەرداخی شەرابی دا بە لاوەکان تا سوێندی پیٚ دەخۆن.

– ئـەی زیوسـی بـاوك، ئـەی شـای خواوەنـدان، ئـەی زیوسـی مـەزن و شـکۆدار، ئێـوە ئـەی خـۆرو مانگ، گویٚ بگرن: ئەگەر کەسێك پابەندی سوێندی خۆی نەبیٚ ئێوە سزای دەدەن! ئێمە سوێند دەخـۆین کـە لـەنێو خۆمانـدا و لەگـەڵ پاشـای ئەسـپارتە و هاوسـەری هـیلین دا دۆسـتانە رەفتـار بکـەین و زەرەرمـان بـۆ یـەکتر نابێـت. ئێمـە سـوێند دەخـۆین و هـەموو یەکـدی دەگـرین و ئەگـەر کەسێك بیـەویٚ هـیلین لـە هاوسـەرەکەی بـرفێنیٚ ئـەوا لەشـکری دەکەینـە سـەر و شـارەکەی وێـران دەکەین.

شازادەکان سوێندیان خوارد، شا بە کێردی تیـژ بەرخـەکانی کوشـتەوە، لاوەکـان پەرداخـەکانیان تەژی شەراب کرد، ئەوجا ڕشتیانە سەر زەوی و گوتیان:

– زیوس، بابی خواوەندان، زیوسی مەزن، هەر یەکێك لە ئێمە ئەگەر سوێندەکەی بشکێنیٚ، لەلای

تۆوەوە سزا بدرێ و مێشکی وەکو ئەم شەرابە برژێتە سەر زەوی!

کە لە سوێند خواردن بوونەوە، هەموو بێدەنگ بوون، پاشان بازنەیان لە دەوری شای ئەسپارتە بەست و تونداریوس گوتی:

– پاشایان، شازادان، قارەمانان، ئەنگۆ هێندە گەورە و نەجیب و بەقەدرن کە زۆرم پێ زەحمەتە یەکێکتان لە هەمووان بە پەسندتر بزانم و ئەو هەڵبژێرم، بەڵام ئەی گوڵەکەی هیلاس، هیلین تۆ بە خۆت سەر پشك بە و لە نێو ئەم لاوە جوان و دلێر و بەهێزانەدا کێیانت بە دڵە هەڵیبژێرە. کە تونداریوس ئەو قسەیەی کرد، هیلین چاوانی هەڵبڕین و نیگای ئەو کەسانەی کرد کە بەتاسەوە چاوەڕوانی وەڵامی ئەو بوون. یەکەمجار پانروکلوسی قژ زەردی بینی کە جلێکی سپی بە زیوگوڵدۆزی کراوی لەبەردابوو و لە پاڵ ئاشێڵ دا وەستا بوو، پاشان قارەمانانی دەست و پەنجە بەزەبر، واتا ئاژاکسی بینی کە پاڵتۆیەکی سوری گوڵ زێڕی لەبەرکردبوو، پاشان ئودیسەی قژ ڕەشی بریقەداری بەسەر شان و ملیدا ڕژاوی بینی، ئەوجا فیلوکتیتسی بەتیروکەوانەکەیەوە بینی، ئەوجا دیومیدوسی مەیتەری بینی کە قامچییەکی چەرمی بەدەستەوە بوو، زۆری تری بینی.

لەوسەری دیوەخانەکەوە، لە سوچێکدا، مینلایوس، غەمبارتر لە هەمووان (چونکە پاشا نەبوو لەوانی تر کەمتر حسێب دەکرا) وەستابوو، هیلین سەرگەردان بوو. جوان سەیری هەموویانی کرد. چاوانی حەیرماوی، کە دەتگوت دەریایە، سەرەنجام لەسەر مینلایوس گیرسایەوە.

– باوکە شازادە مینلایوس هەڵدەبژێرم.

هەموو، بەسەرسامی سەیری مینلایوسیان کرد، مینلایوسیش لە سوچێکدا مات و حەپەسا بوو.نەیدەتوانی باوەڕ بکات. چاوانی دەبریقانەوە. ئەو نەدەوڵەمەندترین بوو، نە بەهێزترین، نە جوانترین بوو. بەڵام هەوڵی دابوو شایستەی هیلین بێ و هەر لەبەر ئەمەش هیلین ئەوی خۆش دەویست.

شازادەکان زۆر ناڕازی بوون. بەڵام نەیاندەتوانی پەیمانشکێنی بکەن. هەموویان جارێکی دی سوێندیان دوبارە کردەوە کە دۆستایەتی مینلایوس بکەن و بەگژ هەر کەسکێدا بچن کە بیەوێ هیلینی لێ بڕفێنێ. مینلایوس لە گەورەترین ئاهەنگدا زەماوەندی لەگەڵ کیژە شایەکەدا کرد کە خۆشی دەویست. کوڕی ئاتیرە لە نێو هەڵپەرکێ و گۆرانی و گوڵاندا زەماوەندی دەگەڵ هیلیندا کرد، لەگەڵ هیلیندا لە گەڵ جوانترین کیژە شادا، کیژی قژ زەردی وەکو هەتاو، چاو شینی وەکو دەریادا زەماوەندی کرد و بوون بەهاوسەر، بۆ خۆی بوو بە پاشای ئەسپارتە، چونکە بابی هیلین، شاری ئەسپارتەی لەبری جیازی بە هیلین دا.

"10"

## سەربوری
## شازادە پاریس و دوتمێر هیلین

لیو گوتی: من حەز ناکەم گوێم لەسەربوری شازادە پاریس و دوتمێر هیلین ببێ، چونکە دڵنیام زۆر غەمگینە.

لیا گوتی: بەڵام من حەز دەکەم گوێم لێی ببێ.

– بەڵێ، بەڵێ،زۆر چاکە. بابە کەیفی تۆ بێ،بەڵام با پێت بڵێم کە لە کۆتاییدا دەگریت.

دایکەکە بە هێمنی گوتی: باوەڕ ناکەم، چما لیو بچوکە؟ خۆمنداڵ نییە.

لیو وەڵامی نەدایەوە، بەڵام زۆر تورە بوو. دایکەکەش نەیدەویست لیو نارەحەت و تورە ببێ. دەیویست وەکو هەرقڵ بەهێز بێ، بۆیە بۆخۆی کتێبێکی بەدەستەوە گرت و بۆخۆی لە سوچێکدا کەوتە خوێندنەوەو دایکەکەش کەوتە گێڕانەوەی سەربورەکە بۆ لیا.

– ساڵانێکی دوورو درێژ، لەشاری ئەسپارتەدا، پاشایەك و شابانۆیەك وشازادەیەك دەژیان. شابانۆ ناوی هیلین وشا ناوی مینلایوس وشازادەی چکۆڵەش نێوی هرمیونە بوو، هرمیونە زۆر جوان بوو.تازە زمانی گرتبوو و کەوتبوە سەر پێیان. بە باوەشی بابیدا هەڵدەگەڕا و یاری بە چەك و تاقمە بریقەدارەکەی دەکرد و ردێنی رادەکێشا. مینلایوس. خۆی بۆ شل دەکرد، چونکە زۆری خۆشدەویست، زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە هیلینی خواستبوو، کە خەڵکی خۆشیان دەویست و پاشایان دۆستی بوون.

لێ هیلین. هەستی بە بەختەوەری نەدەکرد. مینلایوس ئیدی وەکو جاران میهرەبانی لەگەڵدا نەدەنواند. کاتێ کە دەیویست زەماوەندی دەگەڵدا بکات، جورئەت و شەهامەتی گوتنی نەبوو.

لیو بیری چوو بو کە حەزی نەدەکرد گوێی لەسەر بۆرەکەی بێ.

پرسی: بۆ؟

– چونکە بەرلەوەی لەگەڵ هیلین دا زەماوەند بکات، بیری دەکردەوە کە "من دەبێ سەرنجی شازادەخانم رابکێشم، دەبێ تێی بگەیەنم کەخۆشم دەوێ"! پاش ئەوەی گواستییەوە، بە پێچەوانەوە وای بیر دەکردەوە کە "تازە هیلین چاك دەزانێ کە خۆشم دەوێ! تازە هاوسەری منە، هیچ کەسێك ناتوانێ لە دەستمی دەربێنێ."

لیو گوتی: ئەوسا کەوتە خراپە لەگەڵیا؟

– نە خراپ نەبوو، بەڵام بەرای من کەمێ نەزان بوو، رێك وەکو گەلێك لە مێردان، ئەوانە کە تەنیا کاتێ بیر لە هاوسەرەکانیان دەکەنەوە کە پێویستیان پێیانە، ئەو ئیدی گوڵی بۆ نەدەهێنا. کەبە خەمباری دەی بینی، نەدەچووە لایەوە، هەوڵی نەدەدا لە خەم و پەژارە و بیرو ویستەکانی تێ

بگات. ژنان بۆ ئەوەی خۆشحاڵ و باش بن پێویستیان بەوەیە کە هەست بکەن خۆشەویستن و هیلین ئیدی وەکو جاران هەستی خۆشحاڵی و بەختەوەری لەلا نەبوو.ئەمەی نەدەدرکاند، بێزاری دەرنەدەبڕی، چونکە چاك دەیزانی کە هەمان ڕەفتار لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری ژناندا دەکرێ، بەڵام بە زۆری خەم لەدڵی بار بوو.

ڕۆژێك شازادەیەکی بێگانە، کە جلوبەرگە جوانەکەی لە زێڕدا دەبریقایەوە، گەییە شار. ئەم پیاوە بە گەلە کەشتییەکانییەوە لە سالامیسەوە هاتبوو. لە کەناری نزیکی ئەسپارتەدا کەشتی و سەوڵ لێدەرەکانی بەجێهێشت و بەخۆی لەگەڵ خولامێکی وەفاداردا، بەئەسپ و عەرەبانە هات بۆ ئەسپارتە، کە گەییە ناو شار گوتی کە دەیەوێ پاشا ببینێ وئیدی بەرەو کۆشك و بارەگای پادشایی ڕێنوێنی کرا.

گەییە کۆشکی پاشا،پاشا پێی گوت ئەگەرچی سبەینێ لەسەر سەفەرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەوپەڕی شانازییەوە پێشوازی لێ دەکرێ، چونکە هەمیشە دەرهەق بە بێگانان میهرەبانە، مینلایوس دەبوایە ڕۆژی پاشتر لە ڕێگەی دەریاوە بۆ دوڕگەی کریت، کە زۆریش دوور بوو، بڕوات. شابانۆ تکای لێکرد کە ئەویش لەگەڵ خۆیدا ببات و بەتەنێ لەماڵەوە بەجێی نەهێڵێ، زۆر خەمبار بوو، بەڵام نەیدەزانی بۆ.

مینلایوس سەری لە داواکەی هیلین سوڕما و گوتی: بۆ دەتەوێ بێی؟ بۆ ناتەوێ بەتەنێ بیت؟تازەتۆ تەنیا نیت. کەنیزەك و خزمەتکاری زۆرت لە خزمەتدان و هرمیونەشت لە لایە! ئەمە جگە لەوەی کە ژنان لەماڵەوە دەبن! ئەدی نەتدەزانی! دەتەوێ لێم ببی بە کچۆڵەیەکی بەناز ونوز هیلین؟ بەڵام هیلین قەناعەتی نەدەکرد و مینلایوس. بیری کردەوە کە بە شێوازێکی دی ڕازی بکات:

– دەتوانی تا ڕەخی دەریا لەگەڵماندا بێی، واتە تا دوڕگەی ئافرودیتە "قوبرس" لەم ڕۆژانەدا لەوێندەر بەزم و ئاهەنگ بۆ ئافرودێتە ساز دەکرێ.

لیا پرسی:ئافرودێتە؟

– بەڵێ،یانی خواوەندی جوانی،ئەو خواوەندەی کە پاریس بە سێوی زێڕین، ئەوی وەکو جوانترین خواوەند هەڵبژارد.

مینلایوس گوتی: کە تۆ بەشداری ئاهەنگەکان بکەی، ئیدی سەفەری من غەمگینت ناکات. وا هی چاتر نییە؟

– نە، باش نییە!

هیلین بزەیەکی بەرووی مینلایوس دادا.بەڵام دەروونی یەکپارچە خەم بوو ومینلایوس هەستی پێنەدەکرد.

– بەڵام من ئەوەندەی بتوانم زوو دەگەڕێمەوە.

لەم کاتەدا بوو کە خزمەتکارێکی پیر، داوای هاتنە ژوورەی کرد.

– شای ئەسپارتە، دوو پیاوی بێگانە هاتوون، یەکێکیان یەجگار جوانە و سەراپای لە زێڕدا دەبریقێتەوە.

– نێوی چییە؟

– نازانم، بەڵام بەجل وبەرگەکەیدا لەکێوی دەچێت.

لیو پرسی: کێوی؟ کێوی چییە؟

– یۆنانیـانی کـۆن بەکەسـانێك کـە بـەزمانی ئـەوان قسـەی نـەکردبا و جلوبـەرگی جیـا لـەوانی لەبەرکردبا، دەگوت کێوی. خزمەتکارە پیرەکە گوتی: ئایا ئەم لاوە کێوییە لە ئەسپەکەی دابەزێ و بێتە بارەگا یان ئیزنی بدەم و بڕوات؟

– ئیزنـی بـدەی بڕوات؟ پێم وایـە تـۆ کـەمێك بـێ ئاوەزی! تا ئێستا من کەسم ئیزن داوە؟ با لـە ئەسپەکەی دابەزێ، ڕێنوێنی بکەن باوەژوور بکەوێ و دەستور بدە وەکو چۆن شایستەی منە وا هی پێشوازی بکرێ.

خزمـەتکاری پـیر، بەلـەز لـە بارەگـا وەدەرکـەوت و خزمـەتکارەکانی دیکـەش دووی کـەوتن. هەنـدێکیان ئەسـپەکانیان لـێ وەرگـرتن و بردیاننـە تەویلـەوە، هەنـدێکی تریـان، بێگانـەکانیان بـۆ گەرماو برد. لێو دەبێ بزانی کە هیلینییەکان زۆر پاکو تـەمیزبوون و کـە بە جلوبەرگی تۆزاییـەوە بۆماڵ دەگەڕانەوە بەرلە هەر شتێك خۆیان خاوێن دەکردەوە خۆیان دەشت.

پاریس چووە نێو بانۆیەك ئاوی شیرتێنەوە و خزمەتکاران شوشتیان.

لیا، کە هەمیشە بەتەنێ گەرماوی دەکرد، پرسی: چما خۆی نەیدەتوانی خۆی بشوات؟

– بەڵێ دەیتوانی، بەڵام لەوسەروبەندەدا پیاوانی گەورە لەلایەن خەڵکانی دییەوە دەشۆردران.

– پێستیان وەکو هیێ ئێمەبوو؟

– بـەڵێ وەکـو هـی ئێمـە بـوو.بەهـەر حـاڵ خزمـەتکاران پاریسـیان شـت. کرێمـی بۆنـداراین لێـدا، جلێکی نەرم و نیانیان لەبەر کرد و بردیان بۆ لای پاشا. پاشا زۆری حەز دەکرد بزانـێ کـە ئـەو لاوە جوانە کێیە، لـێ هـیچ پرسـیارێکی نـەکرد. پێـی وابـوو ڕەنگـە بێتـە بـێ ئـەدەبی ئەگـەر پـێش نانخواردن ئەو قسانەی دەگەڵ بکات. بۆیە دەستووری دا خوان بەنان و گۆشت برازێننەوە.

یەکسەر خزمەتکاران هـاتن، مێزی بریقـەدار و ناسـکیان هێنـاو ئـاوی خاوێنـان لـە جـامی زیـوین کرد. ئەوسا نانی سپی و پلەگۆشتی گەورەی سورەوەکراویان لەسەر خوانەکان دانا. پاش ئەوەی خواردن و خواردنەوە تەواو بوو، هەردووکیان بە تەواوی دەستیان لەنان خواردن هـەڵگرت، پاشا کەوتە قسە لەگەڵ کابرای بێگانەدا.

– تۆ کێی لەکوێندەرەوە دێی؟

– لە ئاسیاوە دێم. لە شارێکی گەورەو جوانەوە بەناوی تەروادە دێم. من پاریسم و کوڕی پریامی شای تەروادەم.

مینلایـوس گـوتی: زۆر بـەخێر هـاتی پـاریس! هەسـتم کـرد کـە دەبـێ شـازادە بیـت، دەی دەنـگ وباسی شاری تەروادە!

دایك و بابت چۆنن؟!

لەم کاتەدا هیلین، لە ژوور وەدەرکەوت و لە کاتێکدا ڕیزێك کەنیزەك و هاودەمان بە دویەوە بوون، خـۆی وە دیوەخانـدا کـرد. سـیمای کـەمێك غـەمگین بـوو. هاتـە پێشـەوەو خێرهـاتنی شـازادەی

تـەروادەی کـرد، پاشـان دانیشـت.ئـەوجا یـەکێك لـە کارەکـەرەکان پارچـەیەکی \دایـە دەسـتی و یەکێکی دی سـەبەتەیەکی زیـوی پـڕ لـە دەزووی ڕەنگاورەنگی دایـێ، هـیلین بـەدەم گوێ گرتنـەوە لەوان، کەوتە گوڵدۆزی.

پـاریس دەربـارەی وڵاتـە دوور و سـەیرەکەی قسـەی کـرد. دەربـارەی کێـوی ئیـدای بـەفر گرتـوو، دەربـارەی جەنگـەڵ و بێشـە و مێرگـوزاران، کۆشـکو تـەلاری شـکۆدار وگـەورە، دەربـارەی قوللـەی بـەرزی سـەر دیـواری تـەروادە. دەربـارەی دایـك وبـاوکی و شـتی دی قسـەی کـرد. بـەڵام لـەکاتی قسەکردندا بیری لـە شـتی خـراپ دەکردەوە لیـو ولیـا پرسـیان: دەربـارەی چ شـتێکی خـراپ بیـری دەکردەوە.

بیری دەکردەوە کەشابانۆی ئەسپارتە جوانترین ژنە کە ئەو دیتویەتی و هەرگیز لە دنیـادا ژنـی وا جوان نابینێ.

لیا گوتی: خۆ ئەمە خراپ نییە!

– نـە، ئەمـە شـتێکی خـراپ نییـە. بـەڵام پـاریس بـیری لـەوەش دەکـردەوە: ئەفرۆدیتـە قـەولی داوە هیلین بە من بدات.من هەردەمەوێ. بۆچی هیلین هاوسەری مینلایوسە و هی من نییـە؟ مـن دەیبـەم بۆ تەروادە.

هەرچـەندە مینلایـوس بەوپـەڕی قـەدر و حورمەتـەوە میوانـداری پاریسـی کـرد و نـان و گۆشـتی دەرخـواردی دابـوو، دیسـان پـاریس بـیری لـەوە دەکـردەوە کـە هیلیـنی لـێ بـڕفێنێ و ڕەدووی خـۆی بخات و مینلایوس بەتەنێ بمنێێتەوە.

وەکو گوتمان، دەبووایە پاشای ئەسپارتە ڕۆژی دوایی حەرەکـەت بکـات و بکەوێتـە ڕێ، هـیلین تـا دوڕگـەی ئافرودێتـە لـە گـەڵی داچـوو. کـاتێ پاشـا سـواری کەشـتییەکەی بـوو ولـە چـاو ون بـوو، خەمێکی گەورە لە دڵی هیلین دا سەری هەڵدا.

تـا هـەموو بەلەمـەکانیش بـە تـەواوی دوور کەوتنـەوەو لـە چـاو ون بـوون هـەر سـەیری کـرد. کـە گەڕایـەوە شـار، لـە ژوورەکـەی خۆیـدا، ڕووبـەڕووی شـازادەی گـەنج و جـوان بـووەوە، پاریسـش هاتبووە دوڕگەی ئافرودێتە.

ڕۆژی جـەژن و ئاهـەنگ بـوو. خـەڵکی لـە شـەقامەکاندا دەسترین، دەرەقسـین، موسـیقایان دەژەنـد، کیـژو ژنـانی گـەنج ریزیـان گرتبـوو بـەرەو پەرسـتگەی ئافرودێتـە دەچـوون. هیلیـنش بـە دەسـت و دیاری و نەزرەوە لەگەڵ خزمەتکاران بەرەو پەرستگە چوو، پاریسیش بە دوای ئەودا چوو. شـا بـانۆ نـەزر و دیارییـەکانی لەسـەر مێزیتاییـەتی پەرسـتگەکە دانـا. پاشـان پـاریس لـە خواوەنـد پاڕایەوە کە وەعدەکەی بێنێتە دی. شـەڕ لـە نێـوان ئافرودێتـە و هیلین دا دەستی پێکرد. ئەگـەر هیلین سەر بکەوتایە، ئەوا سەرفراز دەبوو و دەیتوانی وڵاتەکەی لە جەنگ و ئاژاوە ڕزگـار بکـات و سالانی ترس لە حـەقارەت و پەشـیمانی لـەخۆی بڕەوێنێتـەوە. ئەگـەر ئافرۆدێتـە سـەربکەوتبوایە، هیلین دەبووە نەنگ و عار بۆ هیلاس. کە تکـاو نـزاو پاڕانـەوەی پـاریس لـە ئافرودێتـە تـەواو بـوو، بەهیلینی گوت کە بۆ تەروادە دەگەڕێتەوە و دوعاخوازی لێکرد.

لیو بە توڕەیی هاواری کرد: ئەی درۆزن!

– درۆی نەدەکرد، چونکە بەڕاستی نیازی ڕۆیشتنی هەبوو، بەڵام لەگەڵ هیلیندا.

شابانۆ کە گوێی لە قسەکانی شازادەی تەرواده بوو، غەمگین بوو.

– ئەی شازادەی جوان، ئاوا زوو دەڕۆی؟ پێم وابوو زیاتر دەمێنییەوە.

– ئەی شابانۆ،من ناتوانم بمێنمەوە، بەڵام دەتوانم لەگەڵ خۆمت بەرم. کە پاریس ئەو قسەیەی کرد، هیلین وەڵامی نەدایەوە، بەڵام خورپەیەك کەوتە دڵییەوە. هەستی کرد کە دەبێت شەڕ بکات، چونکە ئەو خورپەیە بەرەو ڕووداو قەوماوی خراپی دەبرد.

هیلین بیریکردەوە کە بەر لەوەی شەو بەسەردابێت خۆی لە دورگەی ئافرودێتە وپاریس دوور بخاتەوە. یان بەجۆرێ وەڵامی پاریس بداتەوە کە ئیدی نەگەڕێتەوە بۆ لای. بەڵام بێدەنگ بوو و دورگەی ئافرودێتەی بە جێ نەهێشت.

پاریس گەڕایەوە لای کەشتییەکانی و هاوڕێکانی تەیار و ئامادە کرد. بەر لەوەی تاریك دابێ و مانگ هەڵبێ، هەموویان چەکدار و ئامادە، بە هێمنی بۆ پەرستگەکە هاتن. سەد پیاو لە دەرێی پەرستگەکە مانەوە و ئەوانی دی هاتنە ژوورەوە و هەر شتێکی بەنرخی تێدا بوو تالانیان کرد. ئەو جا پاریس چووە لای هیلین و گوتی:

– شابانۆ، ئەگەر حەز دەکەی من لە گەڵ خۆمت دەبەم و تا ماوم لەگەڵ تۆدا دەژیم، چونکە خۆشم دەوێی.

ململانێیەکی دژوار کەوتە دڵی شابانۆوە، لە پاریس جوانتر و میهرەبانتری دەست نەدەکەوت. بەڵام هەقی نەبوو کە مینلایوس، وڵاتەکەی و کوریە ئازیزەکەی بەجێبهێڵێ! هیلین قسەی نەدەکرد، لێ پاریس بەردەوام و بە زمانی شیرین لێی دەپاراوە و تکای لێدەکرد.

یەکێك لە خزمەتکارەکان، کە هەمیشە لەگەڵ شابانۆدا بوو، پارێزگاری دەکرد، ئامادە بووکە خەڵکی بانگ بکات و داوای کۆمەك و یارمەتیان لێ بکات، بەڵام خەڵکەکەی ئاگادار نەکردەوە، هاواری نەکرد، چونکە شابانۆ ئاماژەی کردێ کە بێدەنگ بێ. خەونی خاڵی لە ئەشق بەرچاوانی گرتبوو، هەموو شتێکی بە بێدەنگی سپارد. پێی وا نەبوو کە مینلایوس لە ئێستای پاریس خۆشتری بوێ، بیری نەدەکردەوە کە پەشیمانی بە درێژایی تەمەنی ئازاری دەدا. بۆیە ڕێی بۆ ئەو خورپە ماڵوێرانکەرە خۆش کرد، کە ئافرودێتە خستبوویە دڵییەوە، گەشە بکات و بگەشێتەوە و بەرەو ڕەخی دەریا ڕەدووی پاریس کەوت.

دەریاوانەکان هەموو شتێکیان ئامادە کردبوو، پاریس و هیلین سواری کەشتییە گەورەکە بوون، پاشان ئافرودێتە پەیامێکی نارد. کەشتییەکان کە وەکو مراوی بەدەم شەپۆلەکانەوە دەفرین، خێرا بڕۆن، خزمەتکاری تایبەتی شابانۆ سێ کەسی لە دەست و پێوەندەکان گاز کرد و حاڵ و حیکایەتەکەی بۆ باسکردن. هەموو گریان و هاواریان کرد.ئەوانە خەڵکی و سەربازەکانیان ئاگادار کردەوە و بەرەو کەناری دەریا ڕەڤین. کە گەیشتنە ڕەخی دەریا، کەشتییەکانیان بینی کە لەبەر تریفەی هەیڤدا دەڕۆیشتن. خەڵکی و سەربازان بە پەلە خۆیان ئامادە کرد و چەك و تاقمیان لە خۆدا و حازر و ئامادەی پەلامار دانیان بوون. ژنان و منداڵان، ترساوو نیچمە ڕووت، ڕژانە نێو کوچە و کۆڵانەکان. ئاپورای ئەو خەڵکە تێکرژاوە دەیانپرسی چ شتێك ڕوویداوە.

– چ بووە؟

– بۆ ئێمەیان بانگ کردووە؟

– ئایا پەرستگەکە سووتاوە؟

– کەشتییەکان غەرق بوون؟

– شابانۆ مردووە؟

– دژمنان شاریان گرتووە؟

– کێ دیتونی؟

– وەدەریان دەنەین!

–نە، نە.کەس نییە.

– هەموو هەڵاتن!

– کێ هەڵاتووە؟

– ئاە، خەریکە شێت دەبم، دەگەڕێمەوە بۆ ماڵێ، چونکە منداڵەکەم سەرمای دەبێت.

بەراستی چەند ژنێك بۆ ماڵ گەڕانەوە، بەڵام ئاپورایەکی زۆر هەر بەو دەقەوە بەرەو دەریا غاریان دەدا. ئەوانەی لە پێشدا گەیشتنە ئەوێندەر بە ئاشکرا لەبەر تریفەی مانگدا کەشتییەکانی پاریسیان بینی.ئەوجا خزمەتکاری تایبەتی حاڵ و حیکایەتەکەی بۆ گێڕانەوە، سواری بەلەم بوون و بە توندی کەوتنە سەوڵ لێدان تا فریای شابانۆ بکەون.

بەڵام سات بەسات مەودای نێوان ئەمان و پاریس و دارودەستەکەی زۆرتر دەبوو.

پاشان خەڵکی و سەربازان و خزمەتکاران لە کاتێکدا بیریانلە نارەحەتی مینلایوس و شازادەی بچوك هرمیونە دەکردەوە، مات و غەمین بۆ ماڵی خۆیان گەڕانەوە.

هیلین لەم کاتەدا لەسەر کەشتیە گەورەکە، لەسەر دۆشەك و بالیفی نەرم و بەزێڕ و زێو گوڵدۆزی کراو، هێمن و ئارام راکشابوو. پاریس خۆشترین گۆرانی بۆ دەگوت.. جار جارێ قسەی دەگەڵ شابانۆدا دەکرد. پێی دەگوت کە بەختەوەرییەکی بۆدەگەڕێنێتەوە کە قەتاو قەت نەی دیبێ.

لیو، کە قسەکانی پاریسی پێ هیچ بوون هاواری کرد: هەمووی درۆ بوو!

– نە، نە، درۆ نەبوو، چونکە پاریس ئەوەی بە خەیاڵیدا دەهات، بە زمان دەیگوت.

– بەڵام مینلایوسش زۆر شتی پێ گوتبوو.

– بەڵێ راستە، پێی گوتبوو، بەڵام گوتن لە کوێ و کردن لە کوێ، چونکە خەڵکانێکی کەم هەن کە خۆشەویستی دەناسن، لە کاتێکدا کە نەپاریس و نە مینلایوس هیچیان خۆشەویستییان نەدەناسی، هیلنی دیاری ئافرودێتە گوێی دابووە هەموو قسەکانی شازادەی تەروادە و باوەڕی وابوو کە پاریس بۆ هەمیشە لەگەڵیا دەمێنێ.

لە کاتێکا ئەو خەوی خاوی بە ئەشق و شادییەوە لەشارانی دوورە دەستدا دەبینی، کەشتییەکان بەلەز، وەکو با، رۆیشتن و هیلینیان لەگەڵ خۆدا برد.

"11"

## كە پاشای ئەسپارتە گەڕایەوە چی کرد؟

هیلین، شابانۆی جوان، وەکو بزە، لە لێوی دەریا دوور دەکەوتەوە، جادوی ئافردێتە کاری تێکرد ، ئیدی ئەسپارتەی بە هەمو کەس و شتێکەوە بەجێهێشت.

هـیلین و پـاریس پێکڤە لـەنێو کەشـتییە گەورەکـە دابـوون. پـاش ئـەوەی بـە سـیکلاد، ودوورگـە ڕەنگاورەنگـەکانی دەریـای ئیـژەدا ڕەت بـوون، لـە دوورگـەی لیمنـوس دا بەرانبـەر بـە تـەروادە وەسـتان، چـەندین ڕۆژ لەوێنـدەر مانـەوە، پاشان بـەرەو تـەروادە وەڕێ کـەوتن. کە گەییـنە ڕەخـی دەریـا، پـاریس دەسـتی هیلـینی گـرت و لـە کەشـتییەکە دای بەزانـد. پاشـان بـردی بـۆ کۆشـکی پاشایەتی.

– ئـەی پاشـای تـەروادە و ئـەی شـابانۆ، ئـەی شـازادەکان، بـڕوانن ئەمـە هیلـینی دەزگیرانمـە و هەمووتان بیناسن، جوانییەکەی لەرادەبەدەرە، داستانی سـەرزاری سەرانسـەری خەڵکی جیهانە، هەر کەسێك ببیدینێ، دڵی لە خۆشیان دەکەوێتە ترپە ترپ زۆر لـە هیسیونە جوانترە، ئەمە ئـەو شازادەیەیە کە من چوو بوومە تاقیب و سۆراخی. جا وەکو منداڵی خۆتـان و خوشـکی خۆتـان خۆشتان بوێ.

شازادەکان، بە وردی سـەیری ئـەو ژنـە زۆر جوانـەیان کـرد، لـە خۆشـیان دڵیـان کەوتـە تەپـە تـەپ، کەس نەیدەتوانی هیلین بدینێ و ڕوحی شاد نەبێ، سپی پۆش، چاوانی وەکو دەریا، قژی وەکو خۆر، دەتگوت خۆری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە. بەڵام کاساندرای کیـژی پریـام، کـە هیلـینی بینی غەمگین بوو، چونکە کاساندرا ئاگای لە ئایندە بوو "غەیبی دەزانی".

هەر جارێ کە پەردەی نێوان ئەو و ئایندە وەلا دەکەوت، لەپڕ ئەوەی کە دەبوایـە لـە ئاینـدەدا ڕوو بدات، بە خەون دەیبینی: کەشتی، تۆڵە، ئاهەنگ، جەنگ و شەر، داگیرکەران و سەرکەوتن، کاساندرا، ڕوانییە هیلین تەنکە تەمێکی ڕوندکی لە چاوەکانیا بەدی کرد، کە لەپشت ئەو تەنکە تەمەوە یەك پارچە زرینگە زرینگی شمشێر وزرەی زنجیر بوو.

بەڵام شازادەکانی دی هەرکە هیلینیان بینی، بە ئەسپایی و لە بن لێوانەوە دەیانگوت:

– هیلین، ئەفسونگەرێکە وەکو زەردەخەنەی دەریا.

– هیلین گوڵی ئەشقە و دڵان فەتح دەکات.

– هیلین، درەوشاوەیەکە، کە هەر درەوشاوەیەك لەئاستیدا لێڵ و تاریك دەبێ.

لێ کاساندرا، لە تەمی فرمێسکدا، جگە لە چەك و تەق و تۆق، دەنگی دیکەشی دژنەوت: دەنگێك کە چ کەسێك نەیدەبیست. کاساندرا لەبەرخۆیەوە گوتی: هـیلین، چەکی بریقەدار، ناڵەو فیغانی

پڕ سوێ و ئازار، دەردی بێ ئامان، کویلەی دەست و پێ لە کۆت و زنجیرە.

پریام گوتی: ئەی پاریس، بەراستی نەمن و نە کەس لە ئێمە، هەرگیز، ژنێکمان بە جوانی ئەم ژنە نەدیتوە کە تۆ هێناوتە، ئێمە وەکو منداڵێکی خۆمان وەکو خوشکێکی خۆمان قەبوڵی دەکەین و خۆشمان دەوێ.

کاساندرا، کە غەیبی دەزانی، کاتێ بەدەم قسەکانی شاوە، بڵاچەی شمشێر وەشاندنی بینی و ناڵەو زاری ژنەوت، بە کوڵ کەوتە گریان. کاساندرا، بەدەم گریە و زاری و هاوارکردنەوە کەوتە قژ رنینەوە و خۆی بە عاردیدا دا. ئەو ئیدی خۆی لە کۆشکەکەی بابیدا نەدەبینی، بەڵکو لە مەیدانی شەڕدا بوو، مەیدانی چی! پڕ لە کوژراوو، بریندار و بڵێسەی ئاگر کە نێڵەنێڵ بە ئاسماندا دەچوو.

کەس گوێی بە کاساندرا نەداو کەسیش باوەڕی بە قسەکانی نەکرد. هەموو غەرقی تەماشای هیلین بوون، دەتگوت خوایەك دەبینن، هیلینش نە بیری لە ئەسپارتە دەکردەوە نە لە هرمیونە، سیحرو جادوو ئەفسونی کردبوو.

مینلایوس، بە کەشتییە رەشەکەی بۆ ئەسپارتە دەگەڕایەوە، خەونێکی سەیری دیتبوو و ئەم خەونە نیگەرانی کردبوو. خەونی دیتبوو کە لە ماڵەکەیدا، رێك بەسەر تەختەکەی هیلنەوە، کۆترێکی سپی ومیهرەبان هاتو و نیشتەوە. پاشان هەڵۆیەکی گەورەی پەرو باڵ زێڕین، رەنگاو رەنگ هاتە ژورەکەوە و لە تەنیشت کۆترەکەوە نیشتەوە. هەڵۆکە بە میهرەبانی کۆترەکەی بە چنگ گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی، هەڵۆ و کۆترەکە لە ئاسماندا ون بوون. ئەوجا ئازارێکی بە سوێ، وەکو چۆن تیرێك لە گۆشتی زیندوو رۆ بچێ، دڵی پاشای زامدار کرد. مینلایوس، بیری لە خەونەکەی دەکردەوە، بەڵام جورئەت و زاتی گێڕانەوەی نەبوو. نیگەرانی زۆری بۆ هێنابوو و ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ بۆ لای هیلین.

لەپڕ هاواری کرد: خێراتر سەوڵان لێبدەن! خێراتر! خێراتر!

سەوڵ لێدەران، بە هەموو توانایانەوە سەوڵیان لێدا، بایەکی خۆش و نەرم خۆی بەنێو چارۆکە سپییەکاندا کرد و کەشتییەکە بەنێو دەریای بێ سنووردا رۆیی و گەییە رەخی لاکەدایمون، مینلایوس بەلەز دابەزی. قسەی دەگەڵ کەس نەکرد، سواری گالیسکە بوو، ئەسپە رەشەکەی بەر قامچیان داو بە چوار ناڵە خۆی گەیاندە جادەی سپی و لەوێندەرەوە هیلین وا هاتم.

پاشای لاوی قژ زەرد، دڵتەنگ و نیگەران، بە گالیسکە و بە چوار ناڵە بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە.

بەو پەڕی بێ سەبرییەوە بەرەوشار و ماڵ ئەسپی تاو دەدا، بەرەو ئەو شوێنەی کە پێی وابوو هاوسەرەکەی لەوێندەرە. بە تاسەو بە دڵتەنگییەوە، بە نێو بیشەلان، مێرگوزار، شاخ و دەشتدا ئەسپی تاودەدا، با، یاڵی ئەسپەکە و پەڕ پەڕەی کڵاوەکەی خۆی خستبووە سەما. قژی زەردی و چەك و تاقمی زێڕینی لەبەر تیشکی هەتاودا دەدرەوشانەوە.

کە لەبەر کۆشکی پاشایەتی لە گالیسکەکەی دابەزی دڵی زۆر بە توندی لێی دەدا. پێی وابوو جارێکی دی هیلین بە بزەی شیرین و خوایانەوە دەبینێتەوە.

بەڵام نە، هیلین لەوێندەر نەبوو، نە هاتە پێشوازی. تەنیا ریزی دەست و پێوەندان لەبەردەمی دا

بوون و هەرمیونە شیان پێ بوو.

هاواری کرد: کوا شا بانۆ؟

کەس قسەی نەدەکرد، کەس وەڵامی نەدەدایە، تەنێ هرمیونە نەبێ.

– دایکمت نەهێنایەوە؟ نەت بردە ماڵەوە؟ لە کوێیە؟ من دایکەم دەوێ!

هەرمیونەی چکۆڵە، کە بە درێژایی ڕۆژ هەر گریا بوو، سۆراخی دایکی لە مینلایوس دەکرد. مینلایوس، وەکو مردوو، ڕەنگ لە ڕووی نەما، وەڵامی کیژە چکۆڵەی نەدایەوە. ئاماژەی بۆ یەکێك لە خزمەتکارەکان کرد کە بێت بۆ ژووری زەماوەندەکەی.

لیو: پرسی: ژووری زەماوەند؟

– ئەو ژوورەی کە تایبەتە بەبووك و زاوا.

کە وەژوور کەوت. مینلایوس ڕووی کردە خزمەتکاری تایبەتی و گوتی: تۆ کە هەمیشە لە شابانۆ نزیك بوویت، چی دەزانی بۆم بگێڕەوە.

– تازە چوو بوومە ناو جێگەکە دەنگێك بێداری کردمەوە. دەنگەکە لە ژووری شابانۆ وەهات، رامکردە ژوورێ. سەیرم کرد هاورێکەم لە ژوورەوە وەستاوە و ئەو کوڕە لاوەش، کە بەر لە سەفەرەکەتان هاتبووە ئێرە، لەبەرانبەریدا وەستاوە. ئەو لاوە بە شابانۆی گوت: "شابانۆ، ئەگەر حەز دەکەی، من تۆ لەگەڵ خۆمدا دەبەم" و شابانۆ ڕەنگ لە ڕوویا نەما، بەڵام نەیگوت نە،

– نەیگوت نە؟ کەواتە خۆشحاڵ بوو ڕەدووی بکەوێ؟

– نازانم، ماندوو خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو. هەموو شتەکان وەکو خەونێکی خێرا بوو، منیش وامدەزانی خەون دەبینم، دەمویست هاوار بکەم، بەڵام نەمدەتوانی، شابانۆ ئاماژەی کردمێ کە بێدەنگ بم، هیچ بەرگرییەکی نەکرد، ڕێك وەکو یەکێك خۆی تەسلیم بە دژمنێکی سەرکوتوو کردبێ، بە دوای شازادەدا کەوتە رێ.

– بڕۆ، بگەڕێوە بۆ لای هاوکارەکانت، مینلایوس چیتری نەگوت. بەڵام خزمەتکارەکە سیمای شای کە وەکو مردووانی لێهاتبوو، دەنگی شای، کە دەتگوت لە حاڵی مەرگ دایە، بۆ هەمیشە بە هزر و زەینی خۆی سپارد. مینلایوس بە تەنێ مایەوە. خۆی دا بەسەر تەختەکەدا و بێ هیچ گریە و زارییەك، وەکو چۆن درەختێك بەر تورەیی تۆفان بکەوێ. کەوتە سەر عاردی.

نۆکەران، لەبەر ئەوەی نەیان توانی بوو ڕێ لە هەڵاتنی هیلین بگرن، لە دەری ژوورەکەوە، لە ترسی تورە بوونی شا هەڵدەلەرزین و هەموو ساتێ بەتەمای ڕووداوێکی ترسناك بوون.

ئەنجام شا دەرکەوت. چارەی، وەکو کەسێك کە ئازارێکی گەورە بچێژێ، دابوو بە یەکداو ڕەنگ بەڕوویەوە نەمابوو. بێ هیچ بۆڵە و تورەبوونێك، کەوتە دەستووردان.

– ئەسپەکان ئامادە بکەن! دەبێ بەخۆ بکەوین. نۆکەران ئەسپیان ئامادە کرد. مینلایوس سواری گالیسکە بوو. ئەسپەکانی بەر قامچی داو بەرەو مسینی بۆ لای ئاگامەمنونی برای، وەرێ کەوت.

– پێویستم بە تۆیە، پێویستم بە هەمووتانە، پاریسی کوڕی پریام، هیلینی رفاندووە، خوازبێنکارانی هیلین، لەلای تونداریوس سوێندیان خوارد کە ئەگەر کەسێك بیەوێ هیلین لە مێردەکەی برفێنێ. بە هەموویان سزای دەدەن، ئێستا دەبێ سوێندەکەیان بەرنە سەر. دەبێ

هەموومان دژی پاریس چەك هەڵگرین.

ئاگامەمنونی شای مسینی، قەولی دا کە کۆمەکی براکەی بکات و هەوڵی دا دڵی بداتەوە.

پاشان مینلایوس چوو بۆ شاری پولس بۆ نك نەستور، دەگەڵ ئارگوس دا چووە دەف دیومیدیوس، دەگەڵ فتیادا چووە لای ئاشیل، لەگەڵ ملیبادا چووە کن فیلوکتیس، لەگەڵ ئیتاکادا چووە جەم ئودیسە. هەموو قەولیان دایێ کە کۆمەکی بکەن، بەڵام ئودیسە کە نیشتمانپەروەر و ئاشتیخواز بوو بە مینلایوسی گوت:

– ئەی شای ئەسپارتە، گوێت لە قسەکانم بێ. راستە ئێمە هەمووومان قەولما داوە بەرگری لە هاوسەری هیلین بکەین، لە قسەی خۆشمان ژێوان نابینەوە، بەلام بەر لەوەی خۆمان بۆ شەڕ ئامادە بکەین، باشتر نییە هەوڵێك بدەین کە هیلینمان بە ساغ و سەلامەتی دەست بکەویتەوە؟ چونکە شەڕ کە هەڵدەگیرسێ، شاران دەسوتێنێ، کەشتیان ویران دەکات، هەزاران مرۆڤ دەکوژرێن، ئەو ماڵباتانەی جەنگاوەرانی زرك و زندوو دەنێرنە شەڕ، بەئامانی پڕ لە خۆڵەمێشەوە بۆ ماڵ دەگەڕێنەوە. ئەوانی دی گۆشتن و دەخرێنە بازاڕی کرین و فرۆشتنەوە.

لیو پرسی: "گۆشتن و دەخرێنە بازاڕی کرین و فرۆشتنەوە" مانای چییە؟

– ئەوانەی لەشەڕدا دەبەزین، دەبوونە کۆیلە، شا، شابانۆ، شازادە گەدا، هەژار، زەنگین، پیر، گەنج، هەروەها مندالانیش دەبوون بە موڵکی سەرکەوتووان، سەرکەوتوانیش ئەوانەیان لە نێوخۆیاندا دابەش دەکرد. هەر کارێکیان بویستایە پێیان دەکردن. دەیانتوانی بیانکڕن یان بیانفرۆشن. مینلایوس کە گوێی لەوقسە ئاقلانەیەی ئودیسە بوو، لە فکران چوو

– هەق بە تۆیە، دەچمە کن پریام تا بزانم کە هیلینم وێدەداتەوە یان نا، چونکە پاریس گەنجێکی کەم ئەزموون و کورت بینە، بەلام پریام پیرەو بێگومان بە ئاوەزترە، بەلام دەبێ تۆ لەگەڵم دابێی، چونکە پیاوێکی زاناو بەدەم و زمانی لەوەیە قەناعەت بە خەڵکی تەروادە بکەی کە هاوسەرەکەم وێدەنەوە.

– لەگەڵت دێم. چونکە کاری خێرێ ئەو زەحمەتە دێنێ کە سەفەرێکی لە پێناودا بکرێ و ئاگری شەرێك بکوژێتەوە. ئەنجام هەردووکیان کەوتنە رێ. پاش بڕینی چەندین دورگە، لە کەناری ئاسیادا لەنگەریان گرت. لە کەشتی دابەزین و چوونە شاری تەروادە و داوایان کرد کە شای تەروادە ببینن.

"12"

## سەفەری ئودیسە و مینلایوس بۆ تەروادە

پریام شاو ئانتینۆرەی پس مامی لە کۆشکی پاشایەتی شاری تەروادەدا پێکڤە رۆنیشتبوون، ئەو ئاهەنگەی لەسەر شەرەفی شازادە پاریس و هیلین بەرپا کرابوو، تەواو بوو بوو، کۆشك و

بارەگا لە حاڵی ئاسایی خۆیدا بوو.ئەو جووتە پێکڤە سەرگەرمی قسان بوون کە خزمەتکارێك وەژوور کەوت و گوتی:

– پاشای تەروادە، دوو کەسی بێگانە هاتوون، یەکێکیان ئودیسەی پاشای ئیتاکایە و ئەوی تریان مینلایوسی شای ئەسپارتەیە. جا نازانم پاشا چ دەستورێك دەفەرمووی؟

– زۆر بەرێزەوە پێشوازیان بکەن.با بێنە ئێرەو بزانین چیان دەوێ. تۆ شازادە ئانیتنۆر، بچۆ پێشوازییان و رێنوێیان بکە و بیانهێنە بۆ کۆشك و بەو پەڕی رێزو شکۆوە رەفتاریان دەگەڵ بکە.

شازادە ئانتینور، یەکسەر چوو بۆ پێشوازی ئودیسە و مینلایوس، بەوپەڕی نەزاکەتەوە خێرهاتنی کردن و بردنی بۆ کۆشك، لە کۆشك و بارەگادا دەست و پێوەندان لەدەوری هەردووك پاشا خڕبوونەوە. پریام کوڕەکانی و برازاکانی، نەوەکانی و پیاو ماقوڵ و زانایانی تەروادەی بانگ کرد و گوتی:

– مینلایوس و ئودیسە، شای ئەسپارتە و ئیتاکا، هاتوونەتە لای ئێمە. بێگومان هیلین یان لێمان دەوێتەوە، تەگبیرمان چییە؟ ئاسیوسی دانا، تۆ کە پیرترین و ئاقڵترینی هەمووانی بڵێ بزانین چ بکرێ؟ ئاسیوسی پیر، بەسەر و ردێنی درێژو سپییەوە وەڵامی دایەوە: ئەی پریام، مادامێکی پرس بە من دەکەی، منیش بیروبۆچوونی خۆمت پێ دەڵێم.پێم وایە رفاندنی هیلین لە مێردەکەی کارێکی دروست نەبوو، پێم واشە ئەگەر مینلایوس داوای هیلینی کردەوە، هەقە بیدەینەوە.

ئاسیوسی پیر قسەی خۆی کرد و رۆنیشت، بەڵام شازادە گەنجەکان لە جێی خۆ هەستان، کردیان بەغەڵبەغەڵب و هاواریان کرد کەئەو ژنە جوانە نادەنەوە و لە هیچ کەسێکیش ناترسن. هەر کەسەو دەیویست قسە قسەی ئەوبێ. پێکەوە هاواریان دەکرد، هەراو هەنگامەیەك بوو کەس لە قسەی کەس حاڵی نەدەبوو، ئەنجام شازادە ئاینە ئاسی برازای پاشا هەستاو قسەی کرد.

ئاینە ئاس لاوێکی بە ئاوەزو سەلار بوو، هەمووان خۆشیان دەویست.

دەنگی هێندە رەوان بوو، کە هەموو دەنگەکانی دی کپ دەکردەوە. کاتێ کە ئەانی دی گوێیان لە دەنگی بوو، هەموو بێدەنگ بوون:

– ئەی پاشا، ئەی شازادەکان، گوێتان لە من بێ! پێشنیازێکتان بۆ دەکەم کە رەنگە هەمووتان خۆشحاڵ بکات. پاشا مینلایوس و شا ئودیسەبانگ بکەین و بۆ ئەوەی بزانین چییان دەوێ کۆبوونەوەیەك ساز بکەین و شازادەکان و هەموو خەڵکی بەشداری تێدا بکەن. چونکە دەبێ هەمووشار رازی بێ لەسەر داواکەی ئەوان، پێتان باشە؟

هەموو گوتیان: باشە!

ئەوجا جارچیان راسپێردران کە خەڵکی ئاگادار بکەنەوە، جارچییان کەوتنە نێو شەقامەکان وهاواریان کرد:

– هۆ خەڵکینە، پاشاتان بانگێشتی کردوون بۆ کۆبوونەوە، جا لە زێ کەن لە مەیدانی شاردا خڕ ببنەوە!

هەموو کەوتنە پەلەپەل چونکە دەیانویست مینلایوسی مێردی یەکەمی هیلین بدینن و دەیانویست بزانن بۆچی بۆ تەروادە هاتووە.

خەڵكی ڕژانە مەیدانی هەرە گەورەی شارەوە، كورسی بۆ شازادە و گەورە پیاوان دانرابوو.
ئودیسە و مینلایوس، لەسەرووی شوێنەكە دانیشتبوون، كاتێ مینلایوس، بە دار عاسای پاشایەتییەوە هەستا.بێدەنگی باڵی بەسەر سەرانسەری مەیدانەكەدا كێشا.
- خاینێك پیاوێكی بێ غیرەت، لە ئەسپارتەدا هاوسەرەكەمی ڕفاندووە. خەڵكی تەروادە ئایا دەتانەوێ هیلین لە شارەكەتاندا ڕاگرن؟ ئەگەر بماندەنەوە، ئەوا هیلاس و تەروادە دۆستایەتیان بەردەوام دەبێ، خۆ ئەگەر نەیدەنەوە ئەا شەڕ دەقەومێ!
پاش قسەكانی مینلایوس، دەنگی ناڕەزایی لە مەیدانەكەوە بەرز بووەوە.
- هیلین هی ئێمەیە.
- نەرفێنراوە!
- بە خواستی خۆی هاتووە!
- نایدەینەوە!
- كەسمان ئامادە نین بیدەینەوە!
- لەشەڕ ناترسین!
- هیلین نادەینەوە!
خەڵكی تەروادە كە لە قسەكانی مینلایوس توڕەبوو بوون، لە هەر چوار نكالەوە هاواریان دەكرد، لەنێو هاتو هاواری ئاپورای خەڵكەوە، ئودیسە بە سیمایەكی هێمن و بێ فێزەوە هەستا. چاوانی بڕی بوونە ئەرزەكە، ئودیسە دەستی بە قسان كرد. هەموو ئامادە بووان، شازادەكان و جەماوەری خەڵكی، بەرێز و ستایشێكی تایبەتییەوە گوێیان لە قسەكانی گرت، چونكە ئەو وشانە كە لە زاری پاشای ئیتاكیا دەردەچوون، وەكو كلو بەفرێك بوون كە لە ڕۆژێكی زستاندا، لە ئاسمانێ ڕا دەهاتن و دەنیشتنە سەر زەوی.
"خەڵكی تەروادە، شازادەكان، خەڵكینە، دۆستانی ئازیز، گوێتان لە من بێ، لەوەیە هیلین بەئارەزووی خۆی هاتبێ. من نكۆڵی لەوەی ناكەم، بەلآم ئایا ئەو هەقەی هەبوو كەبێت؟ ئایا هاوسەری شای ئەسپارتە نەبوو؟بەرای ئەنگۆ ڕەوای هەقە لەبەر ژنێك، شەڕێكی ترسناك لە نێوان دوو وڵاتی جوان و شكۆداری وەكو تەروادە و هیلاس بقەومێ و پیاوانو لاوانی قارەمان، برایانی ئەنگۆ، دۆستانی ئێوە، ڕۆڵەكانتان، و هەزاران كەسی دیٚ بێنە كوشتن؟ شەڕ شاران دەسوتێنێ، كەشتییان وێران دەكات، ماڵان چۆل دەكات خوێن دەڕێژێ، دنیالە خوێندا غەرق دەبێ. ناڵەو گریانی پڕ دەردو ئازار دنیا پڕ دەكات. ئیدی كەس بەشادی نازێ. گریە و زاری ماڵان پڕ دەكات، لە كۆتایی شەڕدا، سەركەوتووان گۆشت دەكرن و دەفرۆشن، ئایا ڕازین لە پێناوی یەك ژن دا، تەنیایەك ژندا، ئەم هەموو نەنگی و ناحەزی و كرێتییە بەسەر خۆتاندا بێنن؟ ئەو ژنە بدەنەوە بە خاوەنی خۆی، با نەبێ بەمایەی فیتنە و بەلآ. ئەی خەڵكی تەروادە، هیلین بدەنەوە بەپاشای ئەسپارتە، تا هیلاس و تەروادە بۆ هەمیشە هەر دۆستی یەكدی بن!"
كە ئودیسە لە قسەكانی بۆوە، خەڵكەكە هێشتا هەر بێدەنگ بوون، هەندێ پێیان وابوو بەگوێی ئودیسە بكرێ و ژنەكە بدرێتەوە. هەندێكیش كە قسە ڕەقەكانی مینلایوسیان بیر دەكەتەوە،

حەزیان دەکرد هیلین نەدرێتەوە، مشتومڕ کەوتە نێوان هەردوو تاقمەکە، هەرکەسە و دەیویست قسەی خۆی سوار بێ.

ئودیسە بە شێنەیی گوێی دەگرت و لە دڵی خۆیدا دەیگوت گەر رازی نەبن ئەوا پێشنیازی کۆبوونەوەیەکی دیکە بکات لە رۆژی دواتردا.

لەپڕ مینلایوس لەجێی خۆی هەستاو دەستی بەقسان کرد: بە هەرحاڵ خەڵکی تەروادە، ئەو ژنەی کە رفاندوتانە دەیگێڕنەوە یان نا؟ ئێوە بە خۆتانچاك دەزانن کە هیلین هی منە، هیلین هاوسەری منە. بەر لەوەی ببێبەبووکی شازادەی دزی ئەنگۆ، هی من بوو، دەیدەنەوە یان نا؟

خەڵکەکە دیسان تورە بوون و هەراو هوریا بەرز بووەوە:

– نە، نا!

– هیلین هی ئێمەیە! نایدەینەوە.

– نایدەینەوە.

مینلایوس هاواری کرد: کەواتە بجەنگن!

– باشە،دە جەنگین.

ئەوسا، بێ گوێدان بە فرمانی پریام، ئامادە بوون تا پەلاماری پاشای ئەسپارتە بدەن.

– نەکەن، بێ غیرەت نەبن!

لی مینلایوس، شمشێر بەدەست وشڵەژاو چەند نەفەرێکی زامدار کرد و ئەوانی دیکەی راونا و لەگەڵ ئودیسەدا هەستاو بەرەو رەخی دەریا چوون و بە سواری کەشتی لەو ناوە دوور کەوتنەوە. هیلین کە گوێی لە هاوار و دەنگە دەنگ بوو چووە سەر یەکێك لە بورجەکان و بینی کە مینلایوس و ئودیسە بەرەو دەریا غار دەدەن. ئەسپارتە و هرمیونەو، کلیتم نسترا و هەموو ئەو شتانەی بیر کەوتنەوە کە جێی هێشتبوون. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد لەبورجەکە دابەزێ و بچێ سواری کەشتی ببێ و بۆ وڵاتی خۆی بگەڕێتەوە. بەلانەکی ترسا. نەیتوانی ببزوێ، لە شەرمی ئەو کارەی کە کردبووی، جوڵەی بۆ نەدەکرا، هەستی دەکرد لایەقی ئەوە نییە بگەڕێتەوە بۆ لای منداڵەکەی. ئەم ژنە رۆژانێکی زۆر هەر گریا و گریا، خۆی بوغزاند و نەفرەتی لە خۆی کرد.

مینلایوس، تورەی تورە، تەنێ بە یەك مەبەست بۆ وڵات گەڕایەوە: لە تەروادەدا بجەنگێ، بەزەبری نێزە پاریس لەنێو بەرێ، لە پێناوی بەدەست هێنانەوەی هیلین، تۆڵە لەو خەڵکە بستێنێ.

"13"

### سەربوری دێوانەی قەڵب

شەڕ! سەرانسەری یۆنان تەیار بوو، پتر لە هەزار کەشتی پڕ لە جەنگاوەر ئامادەی حەرەکەت

بوون. ئودیسە پاشاش کە لە شەڕ بێزار و ئاشتیخواز بوو، ناچار بوو بەگەڵ ئەوانی دی بکەوێت، لەلایەکەوە ئودیسە گلەیی ئەوەی لە مینلایوس کرد کە بێ حەوسەڵەیە: بۆ لە پرێکا هەستایت و تانەو تەشەرت لەخەڵکی تەروادەدا! ئەگەر تۆ بێدەنگ بوایەی لێت گەڕابا من قسان بکەم،وەزع و حاڵەکە باشتر دەبوو! خەڵکی تەروادەم قەناعەت پێ دەکرد کە هیلین بدەنەوە، خەڵکی وڵاتەکەمان ئێستا نیازی شەڕیان نییە! بەڵام تازە کار لەکار ترازاوە و ناتوانین پاشگەز ببینەوە.دەبێ تەیار بین و حەرەکەت بکەین.

پاشای ئیتاکا بۆیە ئەوەی بە مینلایوس گوت چونکە دەیزانی کە تەنیا بەڵای ترسناک بەلای خەڵکییەوە شەڕە! ئەو شەڕەی کە ئەو هەوڵی دابوو ڕێی لێ بگرێ، ئودیسە مەیلی لەشەڕ نەبوو. نزیکەی ساڵ و نیوێك بوو ژنی هێنابوو، حەزی نەدەکرد لە پنەلوپەی خێزانی و لە تلەماخوس ی فەرزەندی دوور بکەوێتەوە. زۆری هەوڵ دابوو ڕێ لە شەڕەکە بگرێ. ئەگەر مینلایوس کەللەرەقی کردبوو، لە ڕاستیدا گوناحی لەگەردنی پاشای ئیتاکا نەبوو! ئودیسە پاشا بیری لە هەموو ئەم شتانە دەکردەوە، ئودیسە پاشا هەرچەندە دەیویست ئەرکی خۆی بەرانبەر بە مینلایوس ئەنجام بدات، لێ لە لایەکی دیکەوە، دەیویست ڕێییەك پەیدا بکات کە نەیەڵێ کەسێك بۆ شەڕ بڕوات و بە خۆیشی لە ماڵەوە بێ.

فێڵێکی دۆزییەوە کە بە ئەقڵی خۆی باش بوو.کە زانی پالامیدیوسی دۆستی مینلایوس بە دوویدا دێ کە پێکڤە بڕۆن، کیسەیەك خوێی هەڵگرت و بەدوو گاجوت و هەوجاڕێکەوە بەرەو ڕەخی دەریا چوو، کەچاوی بە کەشتییەکەی پالامیدوس کەوت کە بەرەو کەنار دەهات. هەوجارەکەی لە گاجوتەکان بەست و کەوتە کێڵانی لمی کەنار و تۆ و دانی خوێیەکە.

پالامیدیوس کاتێ گەییە کەنار، پیاوێکی ڕووتی بینی کە بە ڕواڵەت تۆوی دەدا.

– هۆو پیاوە کێیە کە کەناری دەریا تۆو دەدا! یانی نازانێ کە لەم کەنارەدا چ شتێك ناڕوێ تۆو دەدات؟

تەماشا، خوێ! بێگومانم شێتو دێوانەیە!

پاشان دێوانەی ساختە، چاوەکانی چەپ و خێل کردن، زاری خوار کردو لاقی جوڵاند، بە گاجوتەکانییەوە بە بەردەم پالامیدوس دا ڕەت بوو.پالامیدوس پاش ئەوەی بە وردی دیقەتی دا، سەیری کرد کابرای تۆودەر ئودیسەیە.

– تۆ، ئودیسە، پاشای ئیتاکا؟ بۆ ئەم کارە دەکەی؟ خوێ تۆ و نییە! ئەدی نازانی لەرەخی دەریادا چ گیایەك ناڕوێ؟

– بەڵێ، بەڵێ دەڕوێ! لەسەر لمەکان دەڕوێ، لەسەر ئاو دەڕوێ، لەسەر دیوار دەڕوێ، لەسەر سەری بنیادەم دەڕوێ! لەسەر کەپوو دەڕوێ! کەپوی خڕو جوانت هەر بۆ ئەم کارە باشە، ئەوجا درەختی خوێ لەسەر دەڕوێت! دەمەوێ کەپوی تۆش تۆو بدەم.

ئودیسە، زۆر بە جدی ئەو قسانەی کرد، ئەوجا لوێچێك خوێ لە کیسەکە دەرهێنا و بە توندی دای بەسەروچاوی پالامیدوس داو ڕەت بوو.

پالامیدوس، خوێیە شێدارەکەی کە چاوانی دەسوتانەوە لەسەرو رووی خۆی پاك کردەوە و

گوتی:

– بەستەزمان، شێت بووە! چتۆ دەشێت بەو هەموو ئاقڵی و زرنگییەوە شێت ببیٚ؟! باشە چۆن بۆ شەڕ دەڕوات، مەحاڵە بتوانیٚ حەرەکەت بکات. دەبیٚ لەماڵەوە بمێنیٚ! باوەڕم بەمە نایەت، هەر چۆنێك بوو دەبیٚ ڕاستی کەشف بکەم، چ بکەم؟

پالامیدوس، بیری کردەوە وکردەوە لە ئەنجامدا بە خۆشحاڵییەوە بە خۆی گوت: دۆزیمەوە! دۆزیمەوە.

لیو پرسی: چی دۆزی بووەوە.

– ڕێبازی کەشف کردن و دوزینەوەی حەقیقەت. چوو بۆ کۆشکی پاشا، تلەماخۆسی ساوا لە بێشکەدا نووستبوو، بیٚ ئەوەی خەبەری بکاتەوە، هەڵیگرت و بۆ ڕەخی دەریای هێنا.

ئودیسە لەسەر شۆ بڕین و تۆ دانی خۆی بەردەوام بوو، لیٚ گاجووتەکان وەکو جاران نەدەڕۆیشتن، بەڵکو ئودیسە وەکو قرژاڵ بەرەو دواوە دەیهاژوتن.

پالامیدوس، تلەماخوسی لەسەر زەوییەکە ولە نزیکی گاسنەکە دانا و لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر ئودیسە بەراستی شێت بیٚ، ئەوا هەست ناکات کە ئەم ساوایە منداڵەکەی خۆیەتی وناوەستێت. خۆ ئەگەر گاجووتەکەکان ڕابگریٚ. هەنگینیٚ دیاردەدات کە شێت نییە و لەگەڵ ئێمەدا بۆ شەڕیٚ دێت.

کە ئودیسە منداڵەکەی لەسەر زەوی دابینی، ئیدی پەشۆکاو نەیزانی چ بکات. ڕێگەی خۆی بگۆڕیٚ؟ یان بگەڕێتەوە دواوە؟ جا کە پالامیدوس فێڵەکەی کەشف کردبوو، ئیدی چ پێویستی دەکرد ئەم لەسەری بڕوات! ئودیسە گاجووتەکانی ڕاگرت و دەستی لە تۆدانی خویٚ هەڵگرت.

پالامیدوس گوتی: ئەی ئودیسە، ئودیسەی شێت! ئەم شێتاتییە چ بو دەست دابوویی؟ بۆچی تۆو بە لەشی تلەماخوس دا ناکەیت؟ کیٚ دەڵیٚ گیایەکی باشی لیٚ ناڕوێت! ئودیسە، نەیدەزانی چ وەڵامێك بداتەوە. بە بێدەنگی دەیڕوانیە ئەوساوایەی کە تازە خەبەری بوو بووە و دەستە چکۆڵەکانی لە لمەکە ڕۆ کرد.

– بڕۆ، بڕۆ شای ئیتاکا، هەر تۆ بەهۆش و زرینگ نیت، خەڵکی تریش هەن. بڕۆ خویٚ و منداڵەکە بەرەوە بۆ ماڵیٚ، گاجووتەکانیش لە تەویلە بکە تا پێکڤە بچینە شەڕیٚ.

ئودیسە، منداڵەکەی لە باوەش کرد، خوێیەکەی بردەوە، گاجووتەکانی لە تەویلە کرد، ئەوجا سەربازەکانی بۆ شەڕ ئامادە کرد. کەشتییەکانی خستەگڕ و دەگەڵ پالامیدوسدا وە حەرەکەت کەوت. بابی پیرو هاوسەری جوان، تلەماخۆسی ساوا، خێزان و خەڵکی و ئیتاکای بە جێهێشت. دووری لەو هەموو ئازیز و خۆشەویستانە بۆ پاشای دانا زۆر زەحمەت بوو. سالانێکی زۆر خەڵکی ئیتاکا شا بانۆ، بابی پیر و تلەماخۆس چاوەنواڕی گەڕانەوەی ئەو قارەمانە بوون. چونکە لەپاش شەڕیش زۆر بەسەرهاتی لیٚ قەوما، بۆیە دوا نەفەر بوو کە لە جەنگی تەرواده گەڕایەوە و هاتەوە بۆ وڵات.

"14"

## حیکایەتی ژنی ساختە

ئودیسە لەگەڵ پالامیدوسدا بەرێکەوت، لەگەڵ ئەودا گەییە شاری ئایولیس. لە قەراخی ئەم شارەدا هەموو پاشایان و دەریاوانان بە کەشتییەکانیانەوە خڕ بووبوونەوە. پێشوازییەکی گەرمیان لە ئودیسە کرد. لێ هەموو قارەمانەکان نەهاتبوون. هێشتا یەکێکیان کەم بوو، ئاشیل، کوڕی پلیوسی شای فتیا، نەجیبترین و ئازاترین قارەمان نەهاتبوو. چۆن بوو ئاشیل لەنێو ئەواندا نەبوو؟ ئەو هەمیشە لەریزی پێشەوە بوو بۆ شەڕ و پێشبڕکێییان: لە هەر شوێنێك دا پێویست بەسەرەنێزە و شمشێران بوایە، لەهەر شوێنێك پێویست بە هێزی بەرگری بوایە، ئاشیل لەوێ دەبوو، ئەدی ئێستا بۆچی نەهاتبوو؟ لەکوێندەرە؟ پاشای ئیتاگا گوتی: بەخۆم دەڕۆم تا سەر لەم نهێنییە دەر بکەم.

ئودیسە چو بۆ تاقیبی ئاشیل، دیارە دۆزینەوەی ئاشیلی قارەمان هەروا ئاسان نەبوو. ئاشیل نەیدەزانی شەڕ راگەیەنراوە. دایکی، واتە تەتێس بەدەستێ جلکی ژنانەوە ناردبووی بۆ لای لوکومیدوسی پاشای ئسکوروس.

ئاشیل لە ئسکوریوسدا، کە لەنێو ژناندا دەژیا، زەماوەندی دەگەڵ یەکێکیان بەنێوی دیدامیا کردبوو. لە ئسکوروسدا چ کەسێك جگە لە پاشا و دیدامیا نەیاندەزانی کە ئاشیل پیاوە، چونکە جلکی ژنانەی لەبەر دەکرد.

تەتیس نەیدەویست کە ئاشیل بۆ تەروادە، بڕوات، چونکە دەیزانی ئەگەر ئاشیل بچێتە شەڕی تەروادە بە جوانەمەرگی دەمرێ، هەربۆیەش بۆ دورگەی ئسکوروسی ناردبوو و لوکومیدوسی راسپاردبوو کە هیچ شتێکی لەمەڕ شەڕ پێ نەڵێ.

ئاشیل، جلکی ژنانەی دەبەر دەکرد و دەنێو ژناندا دەژیا. ئەگەر یەکێك ئەوی دیتبا، باوەڕی نەدەکرد ئەو کچۆڵەیەو بەو گۆنا سوور و قژە زەردەوە، ئاشیل بێ! بەلأم ئودیسە سوسەی شوێنەکەی ئاشیلی کرد.

جلکی بازرگانی لەبەر کرد، سەندوقێکی گەورەی لە تەوقەی سەر، شانە، پێڵاو قوماشی بەبایەخ، روپۆش و شتی دیکەی ژنانەی پڕ کرد و چوو بۆ ئسکوروس، کە گەییە ئەویندەر وای دەنواند کە دەیەوێ کاڵاکانی بە کیژانی شا بفرۆشێت. نۆبەداران نەیانناسیەوە و رێگەیان پێدا کە رەت ببێ. کە گەییە لای کیژانی پاشا پیرە سەندووقی کردەوە و هەموو شتەکانی لەسەر مێز بلأو کردەوە.

کچۆلأن، هەموو بە خۆشحاڵییەوە دەوریان لێدا.

- چەند ملوانکەیەکی جوانە!
- چ روو پۆشێکی چاکە:
- ئەم گولدۆزییە بۆ من دابنێ.

–ئەم پارچە قرمزەش بۆ من.

– ئەم پێڵاوانە چەند جوان دروست کراون.

– ئەم دۆڵابە زێڕە چەند نەخشی جوانی پێوەیە.

بازرگانی ساختە، دوو شتی لە بنی سەندووقەکەیدا شاردبۆووەو و نەیدەویست بەکیژانی پاشای نیشان بدات. ئەو دوو شتەش نێزە و کڵاوخودەکەی ئاشیل بوو. هەردووکیانی هەڵگرت و لە ناوەندی مێزەکە و لەنێو پارچە و ڕووپۆشەکاندا داینان. قارەمان هەر کە چاوی پێیان کەوت. لەجێی خۆی ڕاپەڕی، دەستانی ئودیسەی گرت و چاوی لە دوڕ چاوانی بڕی، بەدەم کوشینی دەستەکانی شای ئیتاکاوە گوتی:

– ئەی بازرگان، تۆ کێی؟ تۆ بازرگان نیت. تۆ بۆ فرۆشتنی پارچە و ڕووپۆشان نەهاتوویە ئێرە، بۆ من هاتوویت. بڵێ بزانم چت لە من گەرەکە. ئەوەی لە دڵتدایە بیڵێ.

ئودیسە، ئەو خەڵکەی دانە لاوە کە چاویان لە چاوی قارەمان بڕی بوو، ئەوجا گوتی:

– پێویستە ئەوەت پێ بڵێم کە بەم زووانە شەڕ لە نێوان هیلاس "یونان" و تەروادەدا بەرپا دەبێت، چاکترین جەنگاوەران ئامادەی حەرەکەتن و شوێنی تۆی هەرە بە توانا و هێز لە نێویاندا چۆڵە، منیش کە ئێستا قسان دەگەڵ تۆدا دەکەم، ئودیسەی پاشای ئیتاکام، ئەی ئاشیل، من ناناسیت؟

– دەتناسم، دەتناسم! بەڵام من بێ ئاگام لەوەی تۆ دەیڵێی! کەس هیچی بەمن نەگوتووە! ئێستا دەزانم بۆچی دایکم منی بۆ ئێرە، بۆ نێو ژنان ناردووە! تەتیس لە من دەترسێت!

جەنگاوەران لە کوێن؟ خێرا پێم بڵێ تا پێیاندا بگەم!

ئودیسە گوتی: من دەگەڵ خۆمدا بۆ ئایولیست دەبەم، دەتبەم بۆ ئەو شوێنەی کە پاشایان و قارەمانان چاوەنۆڕی تۆن. ئاشیل جلەکە ژنانەکەی داکەند، نێزەکەی هەڵگرت، کڵاوخودەکەی خستە سەر قژەزەردەکەی و وەکو جەنگاوەرێك لەنێو کیژەکانەوە دەرکەوت، پاشان دەگەڵ ئودیسەدا بەرەو ئایولیس وەڕێکەوت. بەڵام تەتیس، کەبینی ڕۆڵەکەی ڕۆیی گریا. چونکە تەتیس دەیزانی کەئەگەر ئاشیل بڕوات بۆ ئەو شەڕە ئیدی ناگەڕێتەوە. هەر بۆیەش بەرەو کەناری دەریای پڕخرۆش لەگەڵی داچوو، لەهەمێزی گرت:

– ئاشیل، کوڕەکەم مەڕۆ! تۆ گەنجێکی جوان و بەختەوەری! مەڕۆ، لەلای دایکت وەمێنە. دەگەڵ هاوسەرەکەتدا وەمێنە، مەڕۆ، لەوێندەر ڕووبەڕووی ئازار و خوێن و مەرگ دەبیەوە! ئەم ژیانە بۆ تۆ پڕ لە ئەشق و خۆشەویستی شادییە!

دیدامیای کیژی لوکومیدوس، هاوسەری ئاشیل، مات و بێدەنگ بوو. بەڵام لە ئەنجامدا ئەویش کە لە نێو خۆشکەکانیدا وەستابوو، بەدەم گریانەوە تکای لە قارەمان کرد کە نەڕوات:

– ئاشیل من بە جێ مەهێڵە! ئەگەر تۆ بڕۆی منداڵەکەمان بە هەتیوی گەورە دەبێت و من بۆ هەتا هەتایە بەدبەخت دەبم.

– منداڵەکەمان بێ باب دەبێت ڕاستە. بەڵام بۆ هەتا هەتایە دەتوانێ شانازی بەوەوە بکات و بڵێ بابی لەمەرگ نەدەترسا.واز بێنە. با من بڕۆم. دیدامیا، هاوسەرم واز بێنە با بڕۆم. دایکە، من

قەولم داوە ئەگەر بتەوێ، پەشیمانم بکەیەوە، خۆشەویستی تۆ چ بایەخێکی نامێنێ.

تـەتیس و دیـدامیا بەگریانـەوە دوور کەوتنـەوە. ئاشـیل و ئودیسـە وەرێکـەوتن و لـە شـاری ئایولویسدا لەگەڵ ئـەوانی دیدا یـەکیان گرتـەوە. هـەزاران کەشـتی پـڕ لـە جـەنگاوەران ئامادەی حەرەکەت بوون.

"15"

## سەربوری شازادە ئیفیژنی

هـەزاران کەشـتی بەسـەد هـەزار جـەنگاوەرەوە ئامـادەی لەشکرکێشـی بـوون. لـە دەوروبـەری ئـایولیس، لـە تەنگەیـەکی بـاریکی دەریـایی دا، کـە یونـان و دورگـەی ئوبـویی لێکـدی جـودا دەکردەوە، خڕ بوو بوونـەوە. لەوێنـدەر چاوەنۆڕی دەستووری ئاگامەمنون بوون کە فەرمانـدەی گشتی هێزەکان بوو.

لێ ئاگامەمنون نەیدەتوانی فەرمانی حەرەکەت دەربکات. باهۆزێکی زۆر توند دەشت و دەریای گرتبوو و نەدەکرا چارۆکەی کەشـتییەکان هەڵبدرێ و ترسـی ئـەوە هـەبوو کە کەشـتییەکان لـەنێو بچن.

جەنگاوەرو سەربازەکان سەبریان سوا بوو. هەرەشەی ئەوەیان دەکرد کە هـەموو شـتێك لەوێنـدەر بەجێ دەهێڵن و بۆ ماڵی خۆیـان دەگەڕێنـەوە. فەرمانـدەکان نەیانـدەزانی چۆنیان هێور بکەنەوە. کە دیتیان وەزع و حاڵەکە بەرەوخراپی دەچێت، ئودیسە چوو بۆ لای ئاگامەمنون و گوتی:

– فەرماندەی گشتی، چ بکەین؟ سەربازەکان بێ تاقەت بوون کەوتوونەتە مقۆ مقۆ. بـەرای من کاتی ئەوە هاتووە بریارێك بدرێ.

– باشـە، تـۆ بڵـێ چ قرێرێـك بـدرێ؟ بـەخۆت دەبـینی کـە ناشـێت حەرەکـەت بکـرێ! بـاو بـاهۆز کەشـتییەکان غـەرق دەکات، هـەر کـە لـە کـەناریان دوور بخەینـەوە، تۆفـان دەیانشـکێنێ، توڕیـان دەداتە دەرێی دەریا.

– هـەق بە تۆیـە،دەبێ کارێك بکـرێ! جا با زانایـەك یـان فاڵچـی و تێـروان و غـەیب زانێك بانگ بکەین و بزانین ئەوچ دەڵێ: هەڵبەتە رێیەکمان پیشان دەدات.

– بیرێکـی باشـە! راوێـژێك دەگـەڵ کاگاسـی تێروانـدا دەکـەین. ئـەوزۆر شـتان دەزانـێ کـە ئێمـە نایزانین. رەنگە تێمان بگەیەنێ کە ئەم تۆفانە بۆچی نانیشێتەوە. دۆستی من ئودیسە بچۆ بە دووی کالخاسدا، منیش لێرە لەنێو ئەم چادرەدا دەنێرم بەدووی مینلایوسی برامدا کۆ دەبمەوە تا چارەسەرێك بدۆزمەوە. برۆ ئودیسەی دانا برۆ.

دوای تۆزێك، شای ئەسپارتە، شای مەسینی، شای ئیتاکا و کابرای تێروان هەموو لە چادرەکەدا حـازر بـوون. تێروانەکە ئیکلامـی بـۆ پادشـاکان کـردو پرسـی کـە چییان لـەو دەوێ. ئاگامـەمنون

گوتی: چارەسەر و تەگبیرێکمان لە تۆ دەوێ. نازانم ئەم باو باهۆزە کەی دەنیشێتەوە. بڵێی خواوەندێك تورە بووبێ وبیەوێ سزامانبدات؟ ئاخۆ دەتوانین لەبری تورەبوونەکەی قوربانییەك پێشکەش بکەین؟ قسە بکە کالخاس، ئێمە چاوەڕوانی وەڵامی تۆین.

کالخاس وەڵامی دایەوە: بەڵام من چ تەگبیرێکم پێ دەکرێ، ئەگەر ئەوەی کە من دەیزانم بیڵێم، لە هەموو ژیانمدا هەر بەر نەفرەتان دەکەوم، ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە کەیەکێك لەئەنگۆ گیرۆدەی بەڵایەکی گەورەیە. کەواتە باشتر وایە چ قسەیەك نەکەم. هەم بۆ من باشترە، هەم بۆ ئێوە.

ئاگامەمنون گوتی: من فرمانت دەدەمێ کەقسە بکەی. من قەولت دەدەمێ کەهیچ یەکێکمان نارەحەتت نەکەین، بە پێچەوانەوە بە تەگبیر وپێشنیازی تۆ دەکەین. مەترسە و قسە بکە.

هەنگینی کالخاس کەوتە قسان، ئەی شا، رۆژێك تۆ لە لێرەواردا چوویتە راوی نیچیرێك کە بەلای خواوەندی راوو شکارەوە، واتە بەلای ئارتەمیسی خواوەندی راوەوە، پیرۆز بوو.

– وایە کالخاس.

– ئەو رۆژە لە لێرەواردا حەیوانە کێوییەکی بەڵەکی فرە قۆچت بینی کە غاری دەدا. دوی کەوتی. تیرێکت تێ سرەوان، تیرەکەت رێکبەر دڵی کەوت و کوشتت، وایە؟

– وایە کالخاس

– ئەو رۆژە کە حەیوانەکەت کوشت گوتت: " ئەمەش جەزرەبەیەکی جوان بۆ زیوس! تەنانەت ئارتەمیسی خواوەندی راوشکاریش نەیتوانی ئەم کارە ئەنجام بدات! تەنانەت ئارتەمیسش نەیتوانی ئەم حەیوانە کێوییە لە تیرەکەم دەرباز بکات!" وا نییە.

– دروستە، ئەی تێروان

– ئەی ئاگامەمنون تۆ پێت وابوو کە ئارتەمیس. قسە زلەکانتی نەژنەوتووە، بەڵام خواوەند گوێی لە قسە پڕ غرورەکانت بوو، تورە بوو، سوێندی خوارد کە تۆڵە بستێنێ، جا ئێستاش ئەی فەرماندەی گشتی، ئەگەر نەزرێکی لە قەبێڵ نەکەی، نایەڵێ تاقە یەك کەشتیت لە جێی خۆی بجوڵێ.

– چ نەزرو قوربانییە؟ پێم بڵێ کالخاس، من ئامادەی هەموو جۆرە نەزرو قوربانییەك هەم.

– خواوەند دەڵێ: "ئەگەر ئاگامەمنون "ئیفیژنی" کیژی بە من پێشکەش بکات و لەسەر سەکۆی پەرستگە بیکاتە قوربانی و لە پێناوی مندا کیژەکەی بکوژێتەوە، هەنگینێ دەیبەخشم و کەشتییەکان دەتوانن هەرەکەت بکەن."

ئاگامەمنون کە گوێی لەم قسانە بوو دار عاساکەی دا بە عاردی داو نەیتوانی جڵەوی فرمێسکان بگرێ. ئەوجا بەدەنگێکی پڕ ئازارەوە گوتی: کالخاس، تۆ راست دەکەی و منیش بە دڵنیاییەوە ناتوانم سەرپێێچی بکەم. لەلایەکەوە ناتوانم کیژەکەم، بەختەوەری ماڵەکەم، بکەمە قوربانی! ئەمە جگە لەوەی کە "ئیفیژنی" لەمەسینییە! من چۆن دەتوانم بۆ ئێرەی بێنم؟ ئاخر چی بەکلیتم نەسترا بڵێم؟ چۆن پێی رابگەیەنم کە دەبێ کیژەکەت بمرێ؟ لەهەر لایەکەوە دەروانم،چ شتێك نابینم جگە لە ئازار و ئازار و ئازار!

ئودیسەی شای ئیتاکا هاتە پێشەوە و گوتی:

– ئاگامەمنون، تۆ شای هەموومانی، ئێمە بۆ تۆمان بە فەرماندەی گشتی دانا چونکە بەرای من تۆ لە هەر هەموومان بەهێزتر، دلێرتر و زاناتری، کەچی وا لە بەرانبەر یەکەمین گرفتی خۆتدا شپرزە بوویت؟ ئایا کیژەکەت لە ولات خۆشتر دەوێ؟ کاغەزێك بۆ کلیتم نەسترای خێزانت بنووسە کە ئاشیلی کوڕی پلیوس، دەیەوێ لەگەڵ ئیفیژینی دا زەماوەند بکات، بۆیە دەستبەجێ ئیفی ژینی بۆ ئایولیس بنێرە، هەر کاتێ کە ئیفیژینی گەیی، هەنگینێ قرێر دەدەین.

– ئەدی ئاشیل چ دەڵێ؟ هەرگیز رازی نابێت ناوی ئەو بکرێ بە دێوجامەی هەڵخەڵەتاندن و راوی ئافرەتێك کە بزانێ چمان کردووە، هەنگینێ باوەڕی بە چ شتێك نامێنێ! دوچاری نائومێدی دەبێت.

– ئاشیل پێ نازانێت، چونکەکەس پێیناڵێ، چونکە هەموو چاوەڕوانی چوونە شەڕن! بە قسەم بکە، زەرەر ناکەی.

ئاگامەمنون قاییل بوو، بەهاوکاری ئودیسە نامەکەی ئامادە کرد. نامەکەی بەمجۆرە نووسی:

"کلیتم نەسترا، شابانۆی مەسینی، ئیڤیژینی کیژمان بۆ ئایولیس بنێرە، چونکە ئاشیلی کوڕی پلیوس، دەیەوێ زەماوەندی دەگەڵ بکات، تۆ ئاشیل دەناسیت: بەهێزترین و نەجیبترین قارەمانە، ئیفیژینی هەرگیزهاوسەری لەوچاکتری دەست ناکەوێ. جا بۆیە کیژەکەمان بۆ ئایولیس بنێرە، چونکە ئاشیل دەیەوێ بەر لەوەی بەرەو تەروادە حەرەکەت بکەین بیگوازێتەوە."

ئاگامەمنون نامەکەی نووسی و دایە دەستی قاسیدێك کە بەپەلە بیگەیەنێتە دەستی کلیتم نەسترای شابانۆی مەسینی، قاسید حەرەکەتی کرد. شارانی تیبس، مگارا و کورینتی بڕی و گەییە مەسینی، چوو بۆ کۆشکی پاشایەتی و بەسەر سامی لەبەر دەرگا وەستا. لەنێو کۆشکەکەوە ئاوازێکی شیرین، کە هەرگیز وێنەی نەژنەوتبوو، دەگەییە گوێ. دەنگی ئاوازی ئیڤیژینی بوو. شازادەی بچووك دەیویست بە دەنگە سازگار و شیرینەکەی دڵی شابانۆ بداتەوە. ئەم گۆرانییەی دەگوت:

" ئاگامەمنونی شای مەسینی حەرەکەتی کردووە.دوور کەوتۆتەوە، تا لە مەیدانی شەڕدا خاینان تەمبێ بکات، پەرێکی زێڕین بەسەر کلاوخودە پۆڵایینەکەیەوە دەدرەوشێتەوە. شمشێری تیژ بەدەستیەوە دەبریقێتەوە ئەو لەگەڵ سەربازەکانی دا لە شەڕدا، عەینی خواوەندان سەرکەوتووە. شمشێری بریقەداری دژمنان دەتۆقێنێ. دژمنان لە بەرانبەر شمشێریدا بە ترس و لەرزەوە هەڵدێن، ئەو سەرکەوتووە.سەرانسەری هیلاس لەسەر رێگەی جەژن و ئاهەنگیان بەرپا کردووە. لە هەموو هیلاسدا گۆرانی شادی دەگوترێ و ئاوری خۆشی دەبریسکێتەوە. شا بۆ ماڵەکەی دەگەڕێتەوە. شابانۆی هاوسەری ئازیزی لەسەرێ را دەرگای لێدەکاتەوە.!"

کەشازادە لە ئاواز و گۆرانییەکەی بووەوە، قاسیدەکە وەژوور کەوت.

– ئەی شابانۆ، نامەیەکی هاوسەرت، شاو فەرماندەی گشتی ئاگامەمنونم بۆ هێناویت.

– ئاگامەمنون؟ شا لە کوێندەرە؟ هێشتا حەرەکەتی نەکردووە؟ دیارە نەخۆشە؟

– ئەی شا بانۆ، شا نەخۆش نییە،ها لە ئایولیس، بە هەزاران کەشتی و بەلەمەوە ئامادەی حەرەکەتە.

کلیتم نەسترا نامەکەی کردەوە، خوێندییەوە و دای بە ئیفیژینی. شازادە خانم کە نامەکەی خوێندەوە لە خۆشیاندا سور هەڵگەڕا، ئایا ڕاستە؟ ئاشیل دەیەوێ بیکات بەهاوسەری خۆی؟ ئاشیلی قارەمانی قژ زەرد، ئەو لاوەی کەهەموو هیلاس خۆشیان گەرەکە؟

لیو گوتی: ڕاست نەبوو؟

– ڕاست نەبوو، لێ ئیفیژینی وایدەزانی کەراستە، چونکە حەزی دەکرد شوو بە پیاوێکی نەجیب بکات،بۆیە خۆشحاڵ بوو کەشوو بەئاشیل بکا. گالیسکە و ئەسپ و جلك و خشڵی بە هاداریان ئامادەکرد. شابانۆ، ئیفیژینی سواری گالیسکە کرد. ئوریستیسی کۆرپەلەی لە هەمێز گرت و بەرەو ئایولیس هەرەکەتیان کرد.

لیوپرسی: ئۆریستیس؟ ئەمە لە کوێ بوو؟

– بچوکترین منداڵی کلیتمنەسترا و ئاگامەمنون بوو. ئاخر شاو شابانۆی مەسینی سێ منداڵیان هەبوو. ئیفیژینی گەورەترین، ئیلکترا دووەمین، ئوریستیسی سێیەمیان بوو. ئیلکترا لەماڵ مایەوە ودایکیان ئوریستیسسی بچوکی لەگەڵ خۆیدا برد. ڕێگە زۆر دووروردرێژ بوو. ئەسپی ژێر عەرەبانەی زێرین بە نێو کێواندا تاویان دەدا. یاڵی بەڵەکیان بەدەم باوە سەمای دەکرد، ڕۆپۆشی سپی شابانۆ و ئیفیژینی بەدەم باوە شەپۆلیان دەدا.

بەشارانی کرینت، مگارا وتبس دا ڕەت بوون، گەیینە ئایولیس، بەر لەوەی بگەنە شار وەستان. چونکە کەمپی سەربازان بەری دەروازەی شاری گرتبوو.

شابانۆ و شازادەخانم لە گالیسکە دابەزین. لاوێکی بالأبەرزی قژ زەردی قۆزیان بینی، کە خۆی بەسەر نێزەکەیدا دابوو بە حەیرماوی سەیری ئەوانی دەکرد.

– ئێوە کێن وا بە تاقی تەنێ هاتوونەتە نێو ئەم هەموو سەربازە؟ ئەگەر حەز دەکەن ئەمن لە گەڵتان دێم من ئاشیل ی کوڕی پلیوسی شای فتیام.

ئاشیلی کوڕی پلیوس؟ ئەی جەوان سلاوت لێ بێ! کەواتە تۆ ئەو شازادەیەی کە داوای ئیفی ژینی کیژی ئاگامەمنونت کردووە؟

من ئاشیل م بەڵام داوای ئیفیژینی م نەکردووە. بەڵام پێم ناڵێی تۆ کێی؟ پێدەچێت شابانۆ بی! بۆچی ئەم پرسیارە لە من دەکەی؟

شابانۆ، وەڵامی نەدایەوە، زۆر سەری سوڕما. ئایائەوەی کە ئاگامەمنون بۆی نووسی بوو دروست نەبوو؟ ئەدی بۆ ئەو نامەیەی بۆ ناردبوو؟ بۆچی ناردبووی بەدووی ئیفیژینیدا.

کلیتم نەستراو ئیفیژینی هەردووك بێدەنگ بوون. ئاشیل ی قارەمانیش لەبەر ئەوەی نەبادا پرسیارێکی نابەجێی لە دەم دەربچێ، بێدەنگ بوو، پاشان پیرەمێردێکی ردێن سپی کە خزمەتکاری ئەمەکداری کلیتم نەسترا بوو، لەشارەوە هاتوو خۆی بەسەر دەست وپێی شابانۆدا خست و گوتی: شا بانۆی مەسینی، هەڵێ،خۆت لە ئایولیس دوور بخەوە! ئیفیژینی، کیژیشت لەگەڵ خۆتدا ببە! چونکە ئەگەر لێرە بەجێی بهێڵی دەمرێت! زەماوەند دەگەڵ ئاشیلدا داوە، تەنیا بیانووە وهیچی دی. بە حەقیقەت ئاگامەمنون بەتەمایە ئیفیژینی بکوژێتەوە. بۆ ئەوەی ئارتەمیسی خواوەندی شکارو ڕاو ڕێ بە لەشکرەکەی بدات کە بۆ جەنگ بڕوات، دەیەوێ ئیفی

ژینی لە قەبێلی ئارتەمیس بکات! ئەی شابانۆ، هەڵێ، شازادە خانم بگەیەنەوە مەسینی.

کاتێ ئاشیل حاڵی بوو کە ئاگامەمنون و ئودیسە چ فێڵێکیان کردووە، زۆر خەمین و نیگەران بوو و گوتی:

– ئیفیژینی، دڵ لە دڵ نەدەی و نەترسیت، تا من لە دنیادابم کەس ناتوانێ دەستت بۆ بێنێ! نابێ کەس وا بزانێ کە ناوی من بەکەڵکی هەڵخەڵەتاندنی ژنێك بێت! من نەجاتت دەدەم و ئەگەر دژی هەمووان وەستابمەوە!

لێ ئیفیژینی گوێی بە قسەکانی قارەمانی لاو نەدا، لەپڕ بابی بینی کە لە دوورەوە بەرەوئەم دێت، بەرەو پیری بابی چوو، دەستی لە ملی وەرێنا، ماچی کرد و نەوازشی کرد.

– باوکە، راستەکە گوایە تۆ دەتەوێ من بکوژییەوە؟نە، راست نییە! بڵێ راست نییە بابە! تۆ زۆر لەوە خۆشترت دەوێم کە ئەو بیرە سامناکە بکەیەوە! بڵێ راست نییە! پاشای مەسینی بەدەم هەنسك هەڵدانەوە هاواری کرد: راست نییە، راست نییە، من شتی وام ناوێ، هیلاس ئەوەی دەوێ. ئارتەمیس، ئەم قوربانییە زاڵمانەیەی دەوێ! تێروان دەڵێ: "ئەگەر ئیفیژینی نەمرێت، ئێمە ناتوانین حەرەکەت بکەین و بچین بۆ جەنگ و کێوی و درندان ژنەکانمان دەدزن، بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەو بمرێت هیلاس ئازاد دەبێت."

ئیفیژینی، تۆزێك لە بابی دوور کەوتەوە و چاوی لە دوڕ چاوانی بڕی.

– باوکە، من دەمەوێ لە پێناوی ئازادی وڵاتەکەمدا بمرم. ئێوە هەمووتان، هەزاران هەزار پیاو، بۆ جەنگ بڕۆن و هیچ نەترسن، تەنانەت منیش ناترسم. ئاشیل، بەرگری لە من مەکە، تۆش دایکە مەگری. چونکە ژیان جوانە و مردن لەپێناوی نیشتماندا، جوانترە، سەکۆی تایبەتی قوربانی لە کوێیە؟ من ئامادەی قوربانیم.

ئیفیژینی، بەرەو لێری پیرۆز وەڕێ کەوت. لە ناوەندی لێرەواردا، لەنێو پاوانێکی بەرین دا، پەیکەری ئارتەمیسی خواوەندی شکار، بەپێوە وێستا بوو. ئاشیل و ئاگامەمنون لە گەڵ ئیفیژینی دا چوون، کلتیم نەسترا لە جێی خۆی نەجوڵا. ورتەی نەکرد. خواحافیزی لە کیژەکەی نەکرد. بەڵام لە دڵەوە لە ئاگامەمنون بێزار بوو.

لە لێرەواری پیرۆزدا، جەنگاوەران مات و بێدەنگ خڕ بوونەوە. شازادە خانم خۆراگر و سەرفراز ئامادەی مردن بوو، ئەوجا بە جەنگاوەرەکانی گوت: ئەمە منم، من لە پێناوی نیشتمانمدا لێرەم. خۆشحاڵ ببنو هیلاس رزگار بکەن و سەرکەوتن بەدەست بێنن.

هەموویان ستایش وئافەرینی شازادە خانمیان کرد. هەموویان کەبیریان لە مەرگی دەکردەوە، لە ناخی ناخدا هەستیان بەئازارێکی گەورە دەکرد. کالخاسی تێروان تاجی لەسەرشازادە خانم نا. ئاشیل، بە ئاوی پیرۆز، سەکۆی تایبەتی قروبانییەکەی شت و پاشان گوتی:

– ئەی خواوەندی هەیڤ، ئارتەمیسی راوچی، ئەم کیژە جوانە قەبول بفەرموو، و لەبری ئەوە سەرکەتنمان پێ ببەخشە.

ئاگامەمنون و مینلایوس و هەموو پاشاو جەنگاوەران. مات و بێدەنگ لە دەوری سەکۆی قوربانییەکەریزیان بەستبوو، سەریان داخستبوو و چاویان بڕییە عاردی.

لەم کاتەدا، لەبری داهاتنەوەی شمشێر بۆ سەر سەری شازادە خانم، هاوارێکی دووردرێژ لە دەوروبەری لێرەکەوە بەرز بووەوە وبێدەنگییەکەی شکاند. هەموو سەریان هەڵبڕی. شازادە خانم نەمابوو، لەبری ئەو لەسەر سەکۆ تایبەتییەکە، حەیوانەکێوییەکی سپی یەکجار جوان بە دیار کەوت. حەیوانە کێوییەکە، هێدیٚ و هێمن وەستا بوو چاوەنۆڕی ئەوە بوو بکرێ بە قوربانی. کالخاسی تێڕوان گوتی: خواوەند نەیویست کە ئیفیژینی بمرێ! ئیدی دەگەڵ خۆی بردەوە وئیدی لە ئێمە تورە نییە.

ئاشیل، ئاگامەمنون، هەموو پاشاو جەنگاوەران زۆر خۆشحاڵ بوون. دابی قوربانی تەواو بوو و ئەوانیش خۆیان بۆ رۆیشتن ئامادە کرد.

با رێڕەوی خۆی گۆڕی، خۆی بەنێو چاڕۆکاندا کرد. کەشتییەکان بەرەو ناوەندی دەریا وەحەرەکەت کەوتن.هێزی چەکدار رەخی دەریای بەجێهێشت، تەنگەیەکیان بڕی و بەنێو دەریای پان و بەرین کەوت، بەرەو تەروادە پێشڕەوی کرد. هەموویان بانگی فەرمانــدەی گەورە ئاگامەمنونیان دەکرد. ئاگامەمنون لەسەر کەشتییە گەورەکە وەستابووو دەستووری دەدا.

لیٚ کلیتم نەسترا، بە خۆ و منداڵەکەیەوە، لە رەخی دەریادا مایەوە. بە بێزاری دەیڕوانییە شا و بەو خەیاڵەی کە کیژە ئازیزەکەی کوژراوە، بیری لە تۆڵەئەستاندنێکی ترسناك دەکردەوە.

لیو گوتی: ئەنجامی دا؟

لیا پرسی: چی کرد؟

– پاش ئەوەی مێردەکەی لەشەڕ گەڕایەوە کوشتی.

– بۆچی کوشتی؟ ئیفیژینی خۆ نەمردبوو، کێوە چوو بوو؟

– چوو بوو بۆ ولاٚتێکی دوور، بۆ ولاٚتی ئایوریس "قرم" چوو بوو. لیٚ کلیتم نەسترا ئەوەی نەدەزانی. هەر چەندە هەموو شتێکیان بۆ باس کردبوو، لیٚ باوەڕی نەکردبوو، چونکە پێی وابوو بۆ دڵدانەوەی ئەو ئەو قسانە دەکەن.

لیو پرسی: ئەدی ئیفیژینی بۆ ماڵ نەگەڕایەوە؟

– گەڕایەوە، بەلاٚم دوای چەندین ساڵ. کاتیٚ گەڕایەوە کە کلیتم نەسترا مردبوو.

– ئەها، راستە، بیرم کەوتەوە. وا بزانم ئوریستیس کوشتی. پیاوە خراپەکەش هەر ئەو کوشتی، نێوی چی بوو؟

– ئاژیستی ناو بوو، ئەو کەسەی کە بابی ئاگامەمنونی کوشت بوو. بیرتە؟

لیو گوتی: بەڵێ لە حیکایەتێکی دیدا بۆت باس کردبووم.

– کاتیٚ ئاگامەمنون حەرەکەتی کرد. ئاژیست بۆ مەسینی گەڕایەوە و باسی زۆر شتی خراپی بۆ کلیتم نەسترا کرد: "چەند پیاوێکی باشت هەیە! پیاوێك کە کیژی خۆی دەکوژێت. گەر من لە جێی تۆ بام تۆڵەم لیٚ دەستاند! بەخۆت دەزانی کە من تۆم خۆش دەویٚ!" هێندەی لە بن گوێیان خوێند، تا بێزاری کلیتم نەسترا لە ئاگامەمنون سەری کرد، کاتێکە شا گەڕایەوە، شا بانۆ بەهاوکاری ئاژیست کوشتی. ئوریستیس لە مەسینی نەبو،، لە ولاٚتێکی دوور بوو، کە گەورەبوو و بەم سەربورەی زانی، بۆ ماڵ گەڕایەوە و بە هاوکاری ئیلکترای خوشکی هەردووکیانی کوشت.

پاشان پەشیمان بووەوە، ئارام و ئوقرەی لەبەر برا، پاشان چوو بۆ ولاتی تایوریس، خوشکەکەی تری، واتە ئیفیژینی \دۆزییەوە، پێکەوە بۆ مەسینی گەڕانەوە.

لیو: باشە نەتدەتوانی لەم حیکایەتەدا شتێکی دی دروست بکەی و کارێکی وەها بکەی هەموان پێکدی شاد ببنەوە و کەس نەمریٚ؟

– باشە، ئەوەیشت بۆ باس دەکەم؟

"16"

## حیکایەتی دوو شاو دوو کۆیلە

هەبوو نەبوو، لە شارێکی ئاسیادا پاشایەك هەبوو بەنێوی ئیتیون، ئەم پاشایە دۆستی پریامی پاشای تەروادە بوو، کە یونانییەکان لەگەڵ پریامدا بەشەڕ هاتن، ئیتیون، دژی یونانییەکان وەستا.

لیو پرسی: ولاتەکەی ئیتیون گەورە بوو؟ بەقەد هەموو ئاسیا بوو؟

– نە، بە ئەندازەی هەموو ئاسیا نەبوو! ولاتی ئیتیون نێوی سیلسی بوو، لە یونان بچووکتر بوو، هیلینیەکان، چوون بۆ سیلسی، سەرکەوتن، پاشای ئەوێندەریان کوشت. حەوت کوڕی شایان کوشت، هەرچی شتی بە نرخ هەبوو تالانیان کرد، ژنی زۆریان بە یەخسیری هێناو هەموو ئەو دەستکەوتانەیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکرد.

لیو پرسی: ژنان بۆ؟

– بۆ کۆیلایەتی سودیان لیٚ وەردەگرتن.

– چۆن هەڵسوکەوتیان دەگەڵ کویلەدا دەکرد؟

– ئەگەر خودان کویلە باش بوایە، بەباشی ڕەفتاری دەگەڵ کویلە دەکرد، ئەگەر خراپ بوایە، خراپ ڕەفتاری دەکرد، بەلاٚم هیچ کەسێك حەزی نەدەکرد ببیٚ بە کۆیلە، ئەگەر خاوەنەکەی زۆر باش بوایەش، لەسەر دابەشکردنی کۆیلە و ژنانی جوان و شتی بە نرخ، بەردەوام لەنێو پاشایان و فەرماندەکاندا ناخۆشی دروست دەبوو.

ئاشیل لەنێو هەموو دەستکەوتەکاندا کیژێکی هەڵبژارد بەنێوی بریسەیس، ئاگامەمنون کیژێکی هەڵبژارد بەنێوی فریسەیس کە کیژی یەکێك لە کەشیشەکانی ئاپولون بوو.

لیو پرسی: ئەدی شازادە خانم نەبوو بە قوربانی تا چ کەسێك ئیتر ژنان نەدزیٚ؟

– ئیفیژینی؟ دروستە. بەلاٚم یونانیانی کۆن وا بیریان نەدەکردەوە کە ئەمە دزی بیٚ. چونکە هەر لەشکرێکی سەرکەوتوو بۆی هەبوو دەست بەسەر هەموو شتێك داو تەنانەت بەسەر بنیادەمانیش دا بگریٚ، پاریس، بە دزییەوە هیلینی لە شامینلایوس ڕفاند بوو، بەلاٚم بە پێی دابی یونانیان کاتیٚ ئاشیل، بریسەیس،ی گرت ئەمە دزی نەبوو، بەڕای هەموان ئەمە هەقێکی ئاسایی و حەڵاڵ

بوو. هەڵبەتە بریسەیس–ش  بەمە قاییل بوو، هەرچەندە بە کۆیلە بوونی لەبەر گران بوو، لیو، تۆ دەبێ ئەوە بزانی کە پیاوانی ئەو  سەروبەندە کەمێك کێوی و هۆڤی بوون و پێیان وابوو، هەقی خۆیانە کە کویلەیان هەبێ و کۆیلە رابگرن و بەجۆرێك کە ئێمە ئێستاکێ ئەم کارە تەنانەت دەرهەق بە راگرتنی گیاندارانیش بەرەوا نازانین.

– باشە، ئاشیل لەگەڵ کۆیلەکاندا باش بوو؟

– پێم وایە باش بوو.

– بە باشی رەفتاری دەگەڵ دەکردن؟

– لەوانەیە، چونکە وێڕای ئەوەی کە پیاوێکی جوامێر و نەجیب بوو، بەڵام کەمێك توند و تورەش بوو. ئاشکرایە کە لەحاڵی تورەییدا بێ رەحم وبێ ئینساف دەبین. بەهەر حاڵ بریسەیس بووبە هی ئاشیل و فریسەیس بوو بەهی ئاگامەمنون، هەردووك پاشا خۆشحاڵ بوون بەوەی کە سەرو کۆیلەی هێندە جوانیان هەیە، زۆر بە گەرمی پێشوازیان کردن. سواری کەشتییان کردن و دەگەڵ خۆدا بۆ تەروادەیان بردن.

لیو گوتی: نا، بۆ یونانیان بردن!

– نا، بردیانن بۆ تەروادە، چونکە ئاواتی گەورەیان ئەوە بووکە هیلین بەدەست بێننەوە، بەڵام خریسەی بابی فریسەیس، کە زانی یونانییەکان کیژەکەیان بردووە، سەراپای دایە ئازار. گریا . خەمبار بوو. بەڵام پاشان بیری کردەوە کە گریان بێفایدەیە.بۆیە کەوتە هەوڵدان تا فریسەیس وەربگرێتەوە. ئیدی هەرچی شتی باشی هەبوو لە "زێڕ، زیو، مس، عاج، کوتاڵی نایاب" کۆی کردنەوە و دەگەڵ خۆی بردنی بۆ لای کەشتییەکانی دژمن، کە گەییە ئەوێندەر، کەوتە رجاو تکا کە رێی بدەن لەگەڵ فەرماندەدا قسە بکات.

– ئەی یونانییەکانی زێڕین چەك، خواوەندان ئێوەیان سەرخست، ئێوە کیژە ئازیزەکەم بدەنەوە و ئەو هەموو سامان و گەنجەی کە هێناومە لە بری ئەو بۆ خۆتانی بەرن. من کەشیش و غەیبزانی خواوەندی هەتاوم، ئەگەر ئێوە ئەم چاکەیەم دەگەڵ بکەن، ئاپولونی خواوەندی هەتاو، چاکەتان دەداتەوە. یونانییەکان هەموو هاواریان لێ هەستا: خریسە لەسەر هەقە، با جگەرگۆشەکەی وێدەینەوە.

لێ ئاگامەمنون، بە تورەیی لە جێی خۆی رابوو و هاواری کرد:

– ئەی خریسە لێرە بڕۆ، هەرگیز نەت بینمەوە، چونکە من کیژەکەت نادەمەوە. بە پێچەوانەوە، دەگەڵ خۆمدا بۆ مەسینی دەبەم. لەوێندەر تا پیری دە خزمەتی مندا دەبێت. کەواتە  گەر دەتەوێ سەرت سەلامەت بێ تا زووە لێرە بڕۆ و یەك قسەی دی نەکەی.

کە ئاگامەمنون ئەو قسانەی کرد، خریسە ترساو بەملکەچی رۆیی، فریسە، کە لەوێندەر دوور کەوتەوە، لە خوای هەتاو پاڕایەوە کە سزای ئاگامەمنون زیاد بکات.

خواوەندی هەتاو گوێی لە پاڕانەوە ولاڵانەوەی خریسە بوو، بۆ تەمبێ کردنی ئاگامەمنون لە چیای ئولەمپ هاتە خوارێ. تیرو کەوانێکی زیوینی لە شان بوو و وەکو شەو دەهاتە پێشێ. لەسەر کێوێك و بەرانبەر بەکەشتییە یونانییەکان رۆنیشت. کەوانەکەی بە دەستەوە گرت و کەوتە

تێرەندازی لە هێستران، ئەسپان، پیاوان، نۆ شەو و نۆ ڕۆژان هێستر وئەسپ و زەلامی کوشت، نۆ شەو و ڕۆژان ئاگر و دوکەڵ بەرپا بوو، یونانیانی کۆن کە کەسێکیان لێ مردبا بە تابوتەوە جەنازەکەیان بەخاك نەدەسپارد. بەڵکو چیلکەو داریان لەسەر مردووەکە کەڵەکە دەکرد و دەیان سوتاند.

لیو گوتی: باشە ئێسا کەس نییە جەنازان بسوتێنێ؟

– با ئێستاش هەیە. هەندێ جار مردووان دەسوتێنن لێ بە شێوازێکی زۆر خراتر، ئەوسا مردووەکانیان لە هەوای ئازاد دا دەسووتاند و خۆڵەکەوەی مرۆڤ و دار تێکەڵ بە یەکدی دەبوو. لێ ئێستا مردووەکان دەخەنە جۆرە کورەیەکی تایبەتییەوە تا خۆڵەمێشەکەیان خالیسە بێ.

لیو پرسی: بۆچی؟

– نازانم، لەوەیە وا بیر بکەنەوە کە خۆڵەمێشی بەشەر زۆر لە خۆڵەمێشی دار گرینگتر بێ، وەکو چۆن یونانیانی کۆن، ئێسکی سوتاوی بەدەنیان لە قاپی سەرنراوەدا هەڵدەگرت.

– باشە، با لەسەری بڕۆین.

– بەڵێ، نۆ ڕۆژان بوری و ژمارەی کوژراوان زۆر بوو. هەنگینێ ئاشیل فەرماندەکانی کۆ کردەوە و گوتی: ئاگامەمنون، من پێم وایە وا چاکترە بۆ ماڵ بگەڕێینەوە. ئەگەر ئەم بایە لەم کونەوە بێ شتاقمان دەرناچین، با لە دانایەك لە غەیب زان و تێڕوانێك بپرسین کە خواوەندی هەتاو بۆ ئەم هەموو قارەی لێ هەڵگرتووین و بپرسین کە چ بکەین باشە و تەگبیرمان چییە.

هەموو قسەکانی ئاشیلیان بەگەن کرد، پاشان کالخاسی تێڕوانی پیر هەستاو گوتی:

– ئاشیل، ئەگەر تۆ دەستوور بدەیت من قسان دەکەم، لێ دەزانم یەکێك لە پاشاكان، کە لێرەیە، لێم تورە دەبێ ڕقم لێهەڵدەگرێ. ئاشیل وەڵامی دایەوە: کەس نە تورە دەبێ و نە ڕقت لێ هەڵدەگرێ. من قەولت دەدەمێ کە کەس خراوەت دەگەڵ ناکات، ئەگەر پێویست بکات لەسەر تۆ کە تەنانەت بەگژ ئەو پاشایەش دا دەچم کە فەرمانمان پێ دەدات، قسەی خۆت بکە و باکت نەبێ،

کالخاس دەستی بە قسان کرد، خریسە، کەشیشی خواوەندی هەتاوە و یونانییەکان بەدرەفتارییان دەگەڵ کردووە، جا بۆیە خواوەندی هەتاو لێمان تورەیە، تا فریسەس، نەدەینەوە بە خریسە، دەست لە کوشتارمان هەڵناگرێت، نەك هەر دەبێ فریسەیس بدەینەوە، بەڵکو نابێ چ شتێکیشی لەبری وەرگرین.

ئاگامەمنون، بە چاوانی وەکو دوو پشکۆی ئاگری تورەوە لە جێی خۆی هەستاو هاواری کرد:

– بێ ئەوەی چ شتێك وەربگرین؟ یانی من نابێ لەبری فریسەیس داوای چ شتێك بکەم! ئەمە ڕاستە کالخاسی شووم؟ ڕاستە، تۆ هەمیشە ئامادەی بیر بکەیەوە و شتێك دژی من بڵێی؟ پێت وایە خەڵکی بە گوناحی منەوە دەمرن، چونکە نەمویستووە کویلەکەم بەخریسە وێدەمەوە؟ نا، نا نایدەمەوە، چونکە هەم لە ژنەکەی خۆم باشترەو، لە جوانیشدا لەو کەمتر نییە، لێ قەیدی نییە، کۆیلەکەم دەدەمەوە، چونکە تۆ دەڵێی کە جەنگاوەرەکان لەبەر من دەمرن. لێ ئێوە دەبێ تۆڵەم بۆ بکەنەوە، چونکە ماقوڵ نییە ئێوە ئەو هەموو شتەتان بەربکەوێ و من هیچم بەرنەکەوێ!

ئاشیل، وەڵامی دایەوە: ئەی ئاگامەمنونی ریسوا، ئەی ئاگامەمنونی پیسکە، تۆ داوای قەرەبوو دەکەی؟ قەرەبووی چی؟ ئەوەی لە جەنگ داگیرا هەمووی دابەش کراوە، خۆ ناکرێ هەر هەمووی کۆ بکەینەوە و جارێکی دی دابەشی بکەینەوە.

ئەوجا ئاگامەمنون هاواری کرد: ئێوە دەبێ تۆڵەی ئەوەم بۆ بکەنەوە، ئەگەر ئێوە ناتانەوێ ئەوەم بۆ بکەن، بەخۆم دەست بەکار دەبم و کۆیلەی یەکێکیان دەبەم. با جارێ بڕۆین کەشتییەك بگرین و فریسەسی سوار بکەین و بەرێی بکەین و یەکێکتان تا نك بابی دەگەڵی بچن.

ئاشیلی کوڕی پلیوس بە تورەیی روانییە ئاگامەمنون و گوتی: ئەی ئاگامەمنونی لەخۆبایی، ئەی پیسکە، چۆن یەکێك لە ئێمە دەنێری؟ من نەهاتووم بۆ ئێرە تا دژی خۆم بجەنگم. خەڵکی تەروادە هیچیان لەمن نەدزیوە، نە گا، نە ئەسپ، نە ژن، هیچکاتێکیش زوڵمیان لەوڵاتی من نەکردووە، ئێمە تەنێ لەبەر خاتری تۆی مەغروری سەگ سیفەت و مینلایوسی برات هاتووین بۆ تەروادە. کە قسە دێتەسەر شەڕ، کاری هەرە سەخت و دژوار بەمن دەسپێردرێ، هەموو هەر چاوتان لەمنەو هەموو هەر ستایشی من دەکەن، لێ کەقسە دێتە سەر خەڵات و دەستکەوت، هەنگێنێ دەبێ باشترین دەستکەوت بۆ تۆ بێ. من لێرەدا بەتۆ دەڵێم: چیتر لێرە بەند نابم بەخۆم و کەشتییەکانمەوە بۆ وڵاتی خۆم دەگەڕێمەوە. هەرگیز بە کەسێکی وەکو تۆ کۆمەك ناکەم.

ئاگامەمنون گوتی: ئاشیل، تۆش لێرە بڕۆ. بەلامەوە گرنگ نییە؟ من لێرەدا هێندەم قارەمان وشاو شازادە  هەن کە بتوانم چاوپۆشی لە ئاشیل بکەم. لێ بۆ ئەوەی تێ بگەی کە من کێم، هەر کە فریسەیس گەڕایەوە لای بابی، ئەوسا دێمە چادرەکەت و بریسەیست لێ وەردەگرم و هەموو بۆیان دەردەکەوێ کە فەرماندە منم نەك کەسێکی دی و ئیدی کەس زات ناکات وەکو تۆ قسەم دەگەڵ بکات.

ئاشیل، تورە بوو، هەڵیکێشایە شمشێر تا لە ئاگەمەمنون بدات. بەڵام پالاس ئاتینا بەردەمی گرت.

لیو پرسی: بۆ بەردەمی گرت؟

– چونکە ئاشیل تا ئەو ساتە لەسەر هەق بوو، ئەگەر ئاگامەمنونی زامدار بکردایە، بەخۆی زەرەری دەکرد. بۆیە ئاشیل شمشێرەکەی نەوەشاند، بەڵام مەجلیسەکەی بەجێهێشت و رۆیی، ئاگامەمنون خۆی نەچوو تا بریسەسی لێ وەربگرێ، لێ دوو قاسیدی نارد.

لیا پرسی: قاسید کێیە؟

لیو وەڵامی دایەوە: جاران لەزەمانی کۆندا، هەندێ پیاو هەبوون، لەبری رۆژنامە، هەواڵیان بە خەڵکی دەگەیاند، ئەوانە پێیان دەگوترا قاسید.

– دەیانگوت: ئەمە روویدا، ئەوە روویدا، شەڕە، شازادە لە دایك بووە!

– هەروەها کارو راسپاردەشیان ئەنجام دەدا، بۆ وێنە ئەمجارە چوون بۆ چادەرکەی ئاشیل تا بریسەیس بێننەوە، بەڵام قسەیان نەکرد، چونکە ئەو ماموریەتە خراپەیان بەدڵ نەبوو کە فەرماندەکەیان دە ئەستۆی خستبوون.

لێ ئاشیل کە ئەوانی بینی گازی کردن، وەرن قاسیدان وەرن، ئێوە هیچ خەتایەکتان نییە.

پاترۆکلوس، برۆ، برۆ بریسەیس بدۆزەوە بەم قاسیدانەی بسپێرە.

پاترۆکلوس، بریسەیسی دایە دەست قاسیدەکان، بریسەیس دەگریا و نەیدەویست ئاشیل بەجێ بێڵێ.

لیو: لەبەر ئەوەی ئاشیل لە گەڵیا باش بوو.!

ئاشیل لە چادرەکەی خۆیدا مایەوە، گریا. بۆ مەیدانی جەنگ نەچوو، چاوەنۆڕی کرد تا ژمارەیەکی زۆری سەرباز بەدەستی هکتۆر و ئاینەیاس کوژران.

ئاگامەمنون، زۆر پەشیمان بوو لەو کردەوە ناشیرینەی کە دەرهەق بە ئاشیلی بەهێزترین قارەمانی یونان کردبووی، چونکە تەروادەییەکان زانیبویان ئاشیل تۆراوە و ناچێتە مەیدانی شەڕەوە، چەشە بوو بوون و دەستێکی باشیان وەشاندبوو و یونانییەکی زۆر کوژران.

بۆیە فەرماندەی گشتی، نەیتوانی کۆتایی بە شەڕەکە بێنێ و ئەو لەشکرەی بۆ شەری تەروادە هاتبوو، نزیکەی دە ساڵێك لە مەیدانی شەڕدا مایەوە.

"17"

## شەڕی تەن بەتەنی پاریس و مینلایوس

ئاشیلی شای میرمیدونییەکان، تۆرا بوو، نە دەچووە شەڕەوە، رۆژانی بە تاقی تەنێ و غەمگین لە نێو چادرەکەدا دەگوزەراند وبیری لەو تانەو تەشەرە دەکردەوە کەلێی درابوو، تەنیا پاترۆکلوسی پس مامی لەگەڵ دابوو. سەربازەکانی لە کەناری دەریادا خەریکی نێزە هاویشتن بوون. ئەسپەکانی بە هێمنی لە پاوانەکەدا دەلەوەڕێن عەرەبانەی جەنگاوەریان لە کەناری چادەکان بێ کار کەوتبوون، چ کەسێك لە جماعەتەکەی ئاشیل بیری لە شەڕ نەدەکردەوە.

جەنگ دەستی پێکرد. دوو لەشکر بەرانبەریان لێکدی گرت.

لەشکریانی تەروادە کردبوویان بە هات و هاوار. بەڵام یونانییەکان بە پێچەوانەوە مات و بێدەنگ بوون و گوێڕایەڵی دەستووری فەرماندەکانیان بوون. لەنێو تەروادەییەکانەوە، جەنگاوەرێکی قۆز و جوان، کە کەوڵە پڵنگێکی وەسەر شانیا دابوو، تیروکەوان لە قەد، هاتە بەرەوە. نێزەیەکی بەدەستەوەبوو. سەری بەرز گرتبوو، سەرفرازو مەغرور هاواری دەکرد. ئێستا وەرن! وەرن بۆ شەڕ! کێ پیاوە با بێتە پێشەوە. من شازادە پاریسم من هیلینم رفاندووە! ئەگەر پیاون وەرن تۆڵەم لێ بستێنن!

پاریس هاواری دەکرد و مێرخازی دەکرد. شای ئەسپارتە، کە گوێی لە هەڕ وگەڤی ئەو بوو، لە عەرەبانەکەی دابەزی و بەرەو ریزی سەربازەکانی پاریس غاریدا. دەتگوت شێرێکە و نێچیری دڵخوازی خۆی دۆزیوەتەوە. پاریسی بینی. ترس سەراپای داگرت. ورەی بەردا و بە بەرچاوی سەربازەکانەوە پاشەوپاش هەڵات. پاریس وەکو مەرێك کە گورگێکی برسی و دڕندەی بینی بێ

غاری دەدا. هەرو گەڤەکەی چەند ساتێ لەمەوبەری بیر چوو بووەوە. بیری لەمە نەدەکردەوە کە هەڵاتنی ئەو شەرمەزارییە بۆ هەموو تەروادەییەکان، هکتۆری برا گەورەی کە ئەوی بەو حاڵەوە بینی، دەم ودەست وبە تورەیی بەرەو رووی غاری دا و گوتی: پاریسی بەدبەخت! جوان وەکو خوا، ترسنۆك وەکو کەروێشك، دژمنانمان گاڵتەت پێدەکەن. دەڵێن: ئەو کوڕی پریامە کەلە قسەکرن و ژن دزیندا ئازایە، بەڵام لە مەیدانی شەڕدا ئامادەی فیرارە. وەکو مشکە، ئەگەر چووبایتە پێشێ و نیشانتدابا کەبە تاقی تەنێ ئامادەی شەڕی، ئافەرین و ستایشیان دەکردی. بەڵام تازە دوا سەربازیش دەزانێ کە تۆ ترسنۆکی! باشە کە تۆ زاتی رفاندنی هیلینت هەبوو، بۆچی ئێستا ناوێری خۆت لەبەردەم مینلایوس دا بگری؟ ئاه، خۆ خەڵکی تەروادە ئەگەر خەڵکێکی باش نەبوایەن، ئێستا بەردبارانیان دەکردی، چ شەرمەزارییەکی گەورەت بەملدا هێنان. پاریس، گوێی لەم قسانەی براکەی بوو، لە شەرماندا سور هەڵگەڕاو گوتی:

– هکتۆر، لۆمەم مەکە! ئافرودێتە هیلینی بەمن داوە، هەڵبەتە چ کەسێك دیاری خواوەند رەفز ناکاتەوە. بەڵام با پێت بڵێم کە من ئیدی، راناکەم و ئامادەی دوئیلم لەگەڵ مینلایوسدا. با تەروادەییەکان لەلایەکی مەیدانەکەدا بن و یونانییەکان لە لایەکی تری. من و مینلایوس لەو ناوەڕاستەدا دوئیلی خۆمان دەکەین و نابێ کەس یارمەتی کەسمان بدات. هەر کەسێکمان سەرکەوتین با هیلین و سەروەت و سامانەکەی بۆ ئەو کەسە بێ و شەڕ بڕێتەوە.

کە شازادە پاریس ئەمەی گوت، هکتور ناوەڕاستی رمەکەی گرت و بەرزی کردەوە و غاری دایە نێوان هەردوو لەشکرەکەوە، تەروادەییەکان کە ئەو نیشانەیەیان بینی هێدی بوونەوە و شا ئاگاممنون هاواری کرد: سەربازان، بڕوانن، هکتۆری کوڕە گەورەی پریام، دەیەوێ شتێك بڵێ.

هکتۆر، بە دەنگێکی رەوان، لە نێو هەردوو لەشکری کروکپدا، گوتی: ئەی یونانیان، ئەی تەروادەییان، من بە ئەنگۆی رادەگەیەنم کە پاریس ئامادەیە شەڕی تەن بەتەن دەگەڵ مینلایوسدا بکات، هەرکەسێك براوە بوو ئەوا هیلین بە سەروەت و سامانییەوە دەبێ بە هی ئەو، لە پاش ئەم شەڕی تەن بەتەنە، ئیدی شەڕ دەبڕێتەوە. ئیدی ئەنگۆ سواری کەشتییەکانتان دەبن و بۆ ماڵی خۆتان دەگەڕێنەوە و کەس هەقی ئەوەی نابێ سەرەنێزەو شمشێران بەکار بێنێ. ئایا ئەمەتان قەبوڵە؟ هەردوو لەشکر کروکپ گوێیان لە قسەکانی قارەمان گرت. پاش ئەوە مینلایوسی شای ئەسپارتە قسەی کرد:

– ئێمە رازین، ئیدی لەم شەڕەدا یان پاریس یان من یەکێکمان دەمرین و ئەوەی دەمێنێتەوە هیلین بۆ خۆی دەبات. کەس سەرەنێزە و شمشێر بەکار نەهێنێ. جگە لە ئێمە هەردوکمان، بەڵێن بدەن کە کەس بەڵێن و سوێندی خۆی نەشکێنێ. ئێمە هەردووکمان شەڕ دەکەین تا یەکێکمان دەمرین. پاشان ئیتر شەڕ بەیەکجاری دەبڕێتەوە.

کە مینلایوس لە قسەکانی بووەوە، جموجوڵی شادی کەوتە نێو هەردوو لەشکرەکەوە، چونکە هەر یەکێك لەو سەد هەزار جەنگاوەرە وای بیر دەکردەوە کە بەو زووانە شەڕ دوایی دێت و بە ئاشتی و سەلامەتی بۆ ماڵ دەگەڕێنەوە.

ئاگاممنون، ناردی دوو بەرخ بێنن. پاشای پیری تەروادەش هەمان کاری کرد. بەرخەکانیان

كوشتەوە و بۆ سوێند خواردنەکە، شەرابیان لە جامی زێڕین کرد. ئەوجا ئاگامەمنون سوێند نامەکەی خوێندەوە.

– ئەی زیوسی مەزن و شکۆدار،ئەی خاوەندی نەمری ترۆپکی چیای ئۆلەمپ، گوێ بگرن! تەماشای شەڕی تەن بەتەنی پاریس و مینلایوس بکەن. هیچ کەسێك جگە لە پاریس و مینلایوس هەقی نییە دەست بۆ سەرەنێزە و شمشێران ببات. هەر کەسێك سەرکەوت، هیلین بۆ خۆی دەبات و ئیدی شەڕ کۆتایی دێت. کەس نابێ سوێندو پەیمانی خۆی بشکێنێ، ئەگەر هەر کەسێك پەیمان شکێنێ کرد، مێشکی وەکو ئەم شەرابە برژێتە سەر زەوی!

ئاگامەمنون جامە زێڕینەکەی دا بەعاردیدا و شەرابەکە وەکو خوێنی سوور ڕژایە سەر زەوی. پاشان سەد هەزار سەرباز دەستیان هەڵبڕی و سەد هەزار دەنگ سوێندەکەیان گوتەوە.

دوبارە بێدەنگی بەرقەرار بوو. هەردوو لەشکری بەڕیز وەستاو، بە نیگەرانییەوە چاوەنۆڕ بوون. ئودیسە و هکتۆر ئەندازەی زەوییەکەیان گرت و کاتێ نیشانەکان دانران. هکتۆر کلاو خودێکی وەرگرت و ئودیسە قورعەکانی تێ خست، بۆ ئەوەی بزانن کێ لەو دووانە یەکەمجار سەرەنێزە بهاوێ. قورعەیان راکێشا، بۆ پاریس دەرچوو. پاریس، دەم ودەست نێزە درێژەکەی گرتە قەڵغانەکەی مینلایوس. خۆی دانەواندەوە تا خۆی لەهێزی جەزرەبەکە بپارێزێ و بریندار نەبێت. پاش ئەوەی دانەوییەوە، یەکسەر هەستایەوە، شمشێرە زێڕینەکەی هەڵگرت و بە توندی دای بەکڵاوخودەکەی پاریس دا. کلاو خودەکە هیچی لێنەهات. بەڵام شمشێرەکە لە دەستی مینلایوس دەرچوو و لە حەوادا دوو لەت بوو. مینلایوس، بە قەڵغانی شکاوو زرێی دڕاو و شمشێری شکاوەوە، تورە و ترۆ خۆیدا بەسەر پاریسدا. زیادەی کلاو خودەکەی گرتو هەوڵی دا دژمن بە عاردیدا رابکێشێ و بیکوژێت. خۆ ئەگەر لەو کاتە پڕ خەتەرەدا ئافرودێتە فریای پاریس نەکەوتبوایە، بێگومان بەنی کڵاوخودەکەی پاریسی دەخنکاند. ئافرودێتە بەنی چەرمی کڵاوخودەکەی کە پاریس لە ژێر چەناگەی خۆی بەستبوو، پچڕان. پاریسی لەباوەش گرت و لە مەیدانەکەی دوور خستەوە و بردی بۆ کۆشك. ئەو ژیانی پاریس ی کڕییەوە. بەڵام ژیانێکی پڕ شانازی نا.

مینلایوس، وەرچەرخایەوە، بەڵام پاریسی لەوێندەر نەبینی. هەموو شوێنێکی بەدوودا گەڕا، نەیدۆزییەوە. دەنگە دەنگ کەوتە نێو سەربازەکان. ئەوجا ئاگامەمنون، بە دەنگی بەرز، بە جۆرێ کە هەردوو لەشکرەکە گوێیان لێ بێ، گوتی:

– پاریس هەڵاتووە و مینلایوس براوەیە، کەواتە هیلینی بە سەروەت و سامانەکەیەوە وێدەنەوە، کەس وەڵامی نەدایەوە. لێ سەربازێکی تەروادەیی بەنێوی پانداروس لەدڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر من تیرێك بەرەو مینلایوس بهاوێم و بیپێکم، مینلایوس دەمرێ، هیلین بۆ پاریس دەمێنێتەوە و منیش شانازییەکی هەمیشەیی بۆ خۆم بەدەست دێنم.

پانداروس، نەیدەزانی کە ئەم کارەی ئەو سوێند شکێنییە و بێ ئابڕویی هەمیشەیی، تیرێکی گرتە مینلایوس. تیرەکە بەر پێیەکی مینلایوس کەوت و برینداری کرد. یونانییەکان تورە بوون و پەلاماری تەروادەییەکانیان دا.

لیو پرسی: پەلاماری پانداروسش؟

– هەڵبەتە. ئەو بوو کە سوێندەکەی پایەماڵ کرد.

لیا پرسی: پانداروس دەمرێت؟

– بەڵێ، ئارگوس پاشا کوشتی.

لیو: دەستی خۆش

لیا: زۆر چاکی کرد.

– بەڵێ بەمجۆرە شەڕی تەن بەتەنی پاریس و مینلایوس تەواو بوو.

"18"

## پاترۆکلوسی دۆستی ئاشیل

لەنێو ئەم قارەمانانەدا کەدەگەڵ ئاگاممنوندا هاتبوونە شەڕی تەروادە، پاترۆکلوسی پس مامی ئاشیلش هاتبوو.

پاترۆکلوس وئاشیل کوڕی دوو برا بوون، ئەم جووتە بەدڵ یەکیان خۆش دەویست و هەمیشە بە یەکەوە بوون. کە ئاشیل لە ئاگاممنون تۆراو وازی لێهێنا، پاترۆکلوسش دەستی لە شەر هەڵگرت، پاترۆکلوس زۆری رق لە فەرماندەی گشتی بوو، چونکە سوکایەتی بە ئاشیلی دۆستی نەجیبی کردبوو. هەوڵی دەدا ئاشیل هێور بکاتەوە و دڵخۆشی بداتەوە و زۆربەی کات لەگەڵ ئەودا بوو.

ئاشیل بەراستی هەستی دەکرد کە پاترۆکلوس خۆشی دەوێ.

جووتە ئامۆزا، بە تاقی تەنیا و بە بێدەنگی، لە چادرەکەیاندا دانیشتبوون. لەدوورەوە دەنگی شەڕ دەهات. لە سوچێکی نێو چادرەکەدا، چەکی بریقەدار، لەسەر زەوی کەوتبوو، لێ ئاشیل هەر ئاوڕی لێنەدەدانەوە. تەماشای هیچی نەدەکرد، هیچ شتێکی نەدەدی. تەنیا بیری لەو قارەمانانە دەکردەوە کە لەوێندەر شەڕیان دەکرد و گوێی لە هەراو هوریا و پێکادانی ئەوان دەگرت. ئەگەرچی لە مەیدنی شەڕدا پێویستیان بە شمشێر و هێزی ئەو بوو، لێ ئەو بێ جوڵە و بێکار بوو! هەستی کرد خەریکە دەخنکێ. لەجێی خۆی راپەڕی. بێ چ قسەیەك لە چادرەکە وەدەرکەوت و بە ئارامی بەرەو مەیدان رۆیی، وا نەدەهاتەبەرچاو کە لەو نزیکانەدا شەڕێك هەبێ. سەربازەکانی قسانیان دەکرد. سوعبەت و شۆخیان دەکرد. نانیان دەخوارد. ئەسپەکانیش لە نزیکی رووباردا بە ئارامی دەلەوەڕان. ئاشیل لە نێو سەربازەکاندا نەوەستا و رۆیی و چووە سەر کەشتییە گەورەکە. لەسەر کەشتییەکەوە مەیدانی شەڕەکەی بینی.

ئاشیل، بە وردی تەماشای کرد. یونانی و تەروادەییەکان یەکبین دەجەنگین، چەکەکان لەبەر تیشکی هەتاودا دەبریقانەوە. خوێنی هەزاران بریندار رژا بوو. جەنگاوەرێکی رێزی پێشەوە

خۆی ڕەپێش خست. ئەو جەنگاوەرە ئاگامەمنون بوو. پەڕی زێڕینی سەر کڵاو خودەکەی وەکو خۆر دەبریسکایەوە. نێزە مسینەکەی وەکو ئاگر بوو، پیاوانی دژمن وەکو گەڵای دار لەبەردەمیدا دەکەوتن. تەروادەییەکان واقیان لە هێز و توانای ورما و ترسان و وەکو مێگەلی لە گورگ هەڵاتوو لەبەری هەڵاتن. لێ ئەو لێیان نە دەبووەوە کە پێیان دەگەیی دەیکوشتن و گیشەی لێ دروست دەکردن. ئاشیل، لەپڕ شتێکی بینی کە بەتەمای نەبوو. ئاگامەمنون کەوتە سۆراخی عەرەبانەکەی. عەرەبانەکەی دۆزییەوە و بەپەلە بەرەو کەشتییەکان ڕۆیی.دیارە بریندار بوو بوو! ئاگامەمنون پاشەکشەی کرد. تەروادەییەکان زاتیان وەبەر ها تەوە و دوای تۆزێك دوو کەس لەباشترین جەنگاوەران، واتە هکتۆر و ئاینەیاس هاتنە مەیدانێ. وەکو شێر دەجەنگین. نووکە تەروادەییەکان بەهێزتر بوو بوون. ئاشیل کە بینی دوو قارەمانی ئازیزی ئەو. واتە ئودیسە و دیومیدوس، سواری عەرەبانەکانیان بوون و بۆ لای کەشتییەکان گەڕانەوە. هەستی بە ئازارێکی کوشندە کرد.

لیو پرسی: بۆچی گەڕانەوە؟

– چونکە بریندار بوو بوون، سێ فەرماندە بریندار بووبوون کە بە میلایوسەوە دەیانکردە چوار کەس.

هکتور و ئاینەیاس، بوون بە قارەمانی بێ هاوتای مەیدان. خوێن لەدەمارەکانی ئاشیلدا دەجۆشا، زۆری حەز لەشەڕ بوو، وای بیر دەکردەوە کە ئەگەر تەروادەییەکان ئەو بە چەکەوە لە مەیدانی شەڕ بدینن، هەموو لە ترساندا رادەکەن. لێ ئەو جوڵەی نەکرد. بیری لەو سوکایەتییە کردەوە کە پێی کرابوو. بیری لە کۆیلەکەی و بیری لە بێ نەزاکەتی ئاگامەمنون کردەوە.

عەربانەیەکی دی، بەزامدارێکی دییەوە گەڕایەوە، ئەم عەرەبانەیە هی نەستوری پاشای پیرپلوس بوو. بەڵام جەنگاوەرەکەی نزیکی نەستور کێ بوو؟ ئاشیل نەیتوانی دەموچای بدینێ. چونکە ئەسپەکان زۆر خێرا غاریان دەدا. ئەوجار هەر لەسەر کەشتییەکەوە پاترۆکلوسی گاز کرد:

– پاترۆکلوس ئەوە لە کوێیە؟

پاترۆکلوس، کە لەناو چادرەکەدا دانیشتبوو و گوێی لە دەنگی شەڕ دەگرت، بەدەم بانگەکەی ئاشیلەوە هاتە دەرێ، ئاشیل بۆ گازم دەکەی؟ چیتدەوێ بۆتی بکەم.

– پاترۆکلوسی ئازیز، بێگومان یونانییەکان هەنووکە ژێوان بوونەتەوە لەو سووکایەتییەی بە منیان کرد. چونکە وام دێتە بەرچاو کە ڕەفتاری خراویان چاك بووە، لێ ئەو زامدارەی کە نەستور خەریکە لە مەیدانی شەڕی دەگوازێتەوە کێیە؟ برۆ پاترۆکلوس، برۆ برادەری ئازیز برۆ بزانە کێیە. لە پشتەوە لە دکتۆر ماخایون دەچێت، نەمتوانی لە پێشەوە بیدینم.

پاترۆکلوس دەستبەجێ بۆ چادرەکەی نەستور ڕۆیی و پرسی: نەستور ئەو زامدارەی ئێستا بۆ چادرەکەی خۆتت هێنا کێیە؟ ئاشیل دەیەوێ بزانێ کێیە.

– جا ئەو هەقی چییە؟ ئاشیل دڵی پێمان دەسوتێ؟ هەموو بریندار بوون، باسکی ئاگامەمنون، لاقی دیومیدوس، رانی میلایوس،سینەی ئودیسە، لەوە زیاتر، ئەدی ئاشل چاوەنۆڕی چییە؟ ڕەنگە چاوەنۆڕی ئەوە بێ کە تەروادەییەکان بگەنە کەشتییەکان و ئاگریان تێ بەربدەن و

شتاقمان نەتوانین بۆ ماڵی خۆمان بگەڕێینەوە؟

ئەمەش ماخایونە و بریندار بووە، چاکترین دکتۆر و پزیشکی ئێمەیە! جا ئێستا کێ زامدارەکانمان تیمار دەکات! ئەی پاتروکلوس، بڕۆ پەیام بەئاشیل بگەیەنە، پێی بڵێ کە سوکایەتییەکە فەرامۆش بکات و بە گەڵ ئێمە بکەوێ. ئەگەر بە خۆیشی نایەت، ئەوا تۆ چەك و جلوبەرگی وی هەڵگرەو بپۆشە و ڕێبەری سەربازەکانمان بکە. دیارە ئەم داوایە رەفز ناکاتەوە!

پاتروکلوس، گەڕایەوە لای ئاشیل، لە ڕێگەدا یەکێك لە سەردارەکانی بینی، تیرێك بەر رانی کەوتبوو، دە لەنگی یەکسەر هێنایە نێو چادرەکەوە، بە شمشێر تۆزێ زامەکەی هەڵدڕی و تیرەکەی لێ دەرهێنا. پاشان بە گیای پزیشکی زامەکەی تیمار کرد. بەرە بەرە خوێنەکەی وەستایەوە.

لەم کاتەدا هەراو هەنگامەی شەڕ بەرە بەرە نزیکتر دەبوو. پاتروکلوس، دیقەتی دا کە تەروادەییەکان، یۆنانییەکانیان تا نزیکی کەشتییەکان راو ناوە. یونانییەکان بە نا ئومێدییەوە شەڕیان دەکرد و داوای یارمەتییان دەکرد.

پاتروکلوس، لە چادرەکە وەدەرکەوت. بەدەم گریانەوە بەرەو لای ئاشیل غاری دا. گریانی ئەو وەکو کانییەك بوو کە لەسەر تاوێرێکەوە هەڵبقوڵێ.

ئاشیل کە ئەوی بینی گوتی: پاتروکلوس، بۆ دەگریت؟ رەنگە گریانت بۆ یونانییەکان بێت؟ کەس هیچی لەدەست نایەت: ئەم هەموو بریندارە نە خەتای منە و نە خەتای تۆ. خەتای ئەو کەسەیەکە سوکایەتی بەمن کردووە.

پاتروکلوس وەڵامی دایەوە: ئەی رۆڵەی پلیوس، ئەی لە هەموومان بەهێزتر، دەردێکی قورس دەمگرێنێ. باشترین خەڵکمان زامدار بوون و ناکرێ بیانجوڵێنێ. ئیدی چ کەسێك نییە وڵات رزگار بکات. خۆ تۆ تەسلیم نابی! ئاگامەمنون پەی بە هەڵەی خۆی بردووە و قەولی داوە دیارییەکی زۆرت وێدا، جگە لە بریسەیس، لێ تۆ لە جێی خۆت ناجوڵێی! ئەی سەرسەخت! ئەگەر تۆ ناتەوێ بجەنگی، لێگەڕێ با سەربازەکانت بێن و چەکەکانت بدە بە من، لەوەیە تەروادەییەکان چاویان پێی بکەوێ بترسنو دەست هەڵگرن و یونانییەکان بتوانن پشوویەك بدەن.

ئاشیل، چەك و سەربازی دایە دۆستەکەی، هەمان ئەو چەکە جوان و بریقەدارانەی کە خواوەندان لە شەوی زەماوەندەکەیدا پێشکەشیان کردبوو.

– ئەی پاتروکلوس، چەکە دیارەکانم بخە سەر شانت و لەگەڵ سەربازەکانمدا تەروادەییەکان دەربکە، ئەگەر ئاگامەمنون وای لەگەڵ مندا نەکردبا، ئێستا دژمنان ئەوەندە لە کەشتییەکان نزیك نەدەبوونەوە. لێ تۆ هەرە پاتروکلوس، هەرەو دەریان بکە. من نامەوێ ئەوان سەربکەون. حەز ناکەم کەشتییەکان بسوتێنن، پاش ئەوەی لەدەریا دوورت خستنەوە و تا ناو حەساری تەروادە راوت نان هەنگینێ بگەڕێوە، ئێستا نۆرەی تۆیە کە ئەو دیوارانە تێك بشکێنی. وەزع و حاڵەکە خەتەرە و لەوەیە تۆ بکوژرێی. بەهەر حاڵ کە تەروادەییەکانت دوور خستەوە بۆ ئێرە بگەڕێوە. ئیدی شەڕ مەکە و سەربازەکان بۆ ئێرە بێنەوە.

ئاشیل، لەم قسانەدا بوو کە لەپڕ لە رەخی دەریاوە ئاگرێك بەرچاو کەوت. تەروادەییەکان یەکێك

لە کەشتییەکانیان سوتاند، ئاشیل، کە گڕی ئاگرەکەی بینی، بەتوندی کێشای بەلاقی خۆیدا و گوتی:

– راکە پاتروکلوس، راکە، فریا کەوە ئاگر لە دەریاوە دەبینم پاتروکلوس، چەك و ئەسلەحەی لەخۆدا، بەلاَم نێزەکەی لەگەڵ خۆدا نەبرد، چونکە قورس بوو و تەنێ ئاشیل دەیتوانی بەکاری بێنێ.

پاتروکلوس، سەربازەکانی بەرەو دژمن رێبەری کرد. دژمنان وایانزانی ئاشیل هاتۆتە مەیدانی شەڕێ، بۆیە ترسان و هەلاَتن. ئاگرەکە کوژایەوە، تەروادەییەکان تا بن دیواری حەساری تەروادە راونران. ئاشیل، لەسەر کەشتییەکەوە روانی. زۆری کەیف بەوەهات کە تەنێ چەکەکانی بەسن بۆ وەدەست هێنانی سەرکەوتن.

پاتروکلوس، لێکدا لێکدا دژمنی راودەنا، تەروادەییەکان بە تورەیی خۆیان وە شاریدا دەکرد و ئاشیل پەرۆشی گەڕانەوەی پاتروکلوس بوو، لێ پاتروکلوس نەدەگەڕایەوە، شەڕ گەییە بن دیواری حەساری تەروادە، ئاشیل، خەمی دۆستەکەی بوو. هەقی بوو بترسێت، چونکە پاتروکلوس، نەشئەی سەرکەوتن لە کەللەی دابوو. سەرگەرمی شەڕ بوو، بیری چوو بووەوە کە بگەڕێتەوە. سێ هێرشی کردنە سەرو لە چوارەمین هێرشدا تیرێکی بەر شان کەوت و بریندار بوو. هەوڵی دا دەگەڵ هاوڕێکانیدا بگەڕێتەوە و پاشەکشە بکات. لێ هکتۆر کە ناسی بویەوە، دەستبەجێ خۆی گەیاندە ریزی سەربازەکان و سەرەنێزەیەکی بە ورگی دا کرد، نێزەکە دیواودەر کونی کرد. دۆستەکەی ئاشیل کەوتە سەر زەوی و گیانی دەرچوو. لە گڵ و خۆڵدا گەوزا، هکتور دەستبەجێ مردووەکەی رووت کردەوە، کلاَوخود، زرێ، شمشێر و مەتاڵەکەی برد.

ئاشیل لە دوورەوە دەیویست بزانێ کە چ قەوماوە، سات بەسات تەماداری گەڕانەوەی پاتروکلوس بوو. لێ پاتروکلوس نەگەڕایەوە، ئاشیل هەستی بە گوناح کرد. کارەساتێکی خەمین رووی دابوو.

ئودیسە رۆیی، هەموو قەولیان دایێ کەهاوکاری بکەن، لێ ئودیسەی نیشتمان پەروەر و ئاشتیخواز بە مینلایوسی گوت:

– ئەی شای ئەسپارتە، تۆ گوێت لەمن بێ، راستە ئێمە هەموو قەولمان داوە کە بەرگری لە هاوسەری هیلین بکەین، لە قسەی خۆشمان ژێوان نین، لێ بەر لەوەی خۆ بۆ شەڕ ساز بدەین، نابێ هەوڵی ئەوە بدەین کە هیلین بە ساغ و سەلامەتی بە دەست بێنینەوە؟ چونکە کە شەڕ هەڵگیرسا، شاران دەسووتێ، کەشتیان وێران دەبێ، هەزاران مرۆۋ دەکوژرێن. ئەو ماڵباتانەی جەنگاوەری ساغ و سەلامەت دەنێرنە مەیدانی شەڕ، دەبێ پێشوازی..

"19"

## گەڕانەوەی ئاشیل

پاترۆکلوس مردبوو. لێ شەڕێکی قورس لە دەوروبەری جەنازە رووتەکەیدا هەبوو، هکتور دەیویست جەنازەکەی پاترۆکلوس باوێتە بەر کسۆکان و ئایاس و مینلایوس بەوە قاییل نەبوون. زامەکەی مینلایوس هێشتا سارێژ نەبوو بوو و ئازاری دەدا، بەم حاڵەشەوە بەغار بەرەو مەیدان چوو تا جەنازەکەی پاترۆکلوس دەرباز بکات. لەکاتێکدا کە هەوڵی هەڵگرتنەوەی جەنازەکەی پاترۆکلوسی دەدا، ئانتی لوکوسی جەنگاوەری گاز کرد.

–ئانتی لوکوس، من راستی بە تۆ دەڵێم، پاترۆکلوسی دۆستی ئاشیل کوژراوە، ئێمە هەموومان بۆی بە داخین. برۆ بۆ لای ئاشیل، پێی بڵێ کە هکتۆر چەك و ئەسلەحەکەی بردووە و ئێمە لە هەوڵی ئەوە داین کە جەنازەی پاترۆکلوس بە سەلامەتی بەدەست بێنینەوە.

ئانتی لوکوس بە غار بەرەو کەشتییەکانی ئاشیل رۆیی، سەیری کرد قارەمان بە تاقی تەنێ و غەمبار لە مەیدانەکە دایە، بەدەم گریانەوە لێی نزیك بووەوە و گوتی:

– بێچارە خۆم، بۆ دەبێ من خەبەری ناخۆشت بدەمێ؟ پاترۆکلوس کوژراوە. هکتۆر چەك و ئەسلەحەکەی بردووە، ئایاس و مینلایوس وەکو شێری نەڕ لە شەڕدان تا جەنازەکەی بە ساغی بەدەست بێننەوە، چونکە هکتۆر دەیەوێ جەنازەکەی باوێتە بەر کسۆکان.

کە ئانتی کلوس ئەمەی گوت: هەورێکی ئازار سەراپای دۆستەکەی پاترۆکلوسی داگرت. خۆی بە عاردیدادا و لە عاردی گەوزا، گریا، هاواری کرد:

لیو گوتی: وەکو منداڵ؟

– یونانیانی کۆن بەبێ گریان بەرگەی ئازار و خەمیان نەدەگرت، بە پێچەوانەوە بە تواناترین کەسیان، لەوانی دی پتر هاواریان دەکرد. ئاشیلیش گریا، چنگێ خۆڵی هەڵگرت و کردی بە سەری خۆ یدا و قژی خۆی رنییەوە.

ئاشیل هێندە گریا، نزگەرەی پێکەوت. کۆیلەکانی ئاشیل و پاترۆکلوس لە چادرەکان وەدەرکەوتن. سنگیان کوتا، لە ئەژنۆی خۆیان دا، شیوەنیان کرد، هاواریان کرد. ئاشیل هێشتا پەریشان و ماندوو بوو هاواری دەکرد، هێندە هاواری کرد کە تەتیسی دایکی لە بنکی دەریاوە گوێی لە دەنگی بوو.

تەتیسی خواوەندی دەریا، دەگەڵ پەنجا دەستە خوشکیدا لە شکەفتێکی سپی و نورانیدا کە لە ئەڵماس دروست کرابوو دەژیا، لە نێو شکەفتەکەدا گوێی لە ناڵەی رۆڵەکەی بوو. دەستە خوشکەکانی بەجێهشت و خۆی گەیاندە ئەو.

– ڕۆڵەکەم، بۆچی دەگریت؟ چ ئازار و خەمێکت دەدڵدایە؟

– دایکە، پاتروکلوسی دۆستی ئازیزم کوژراوە، هکتور کوشتویەتی و ئەو چەکو ئەسلەحانەی لێ بە تالان بردووە کە خواوەندان بە دیاری دابوویان بە پلیوس، من چیدی نامەوێ بژیم، ئیدی نامەوێ لە نێو بەشەراندا بم. دەمەوێ هکتۆر نەمێنێ و بە زەبری نێزەی من لە نێو بچێ، دەمەوێ بکوژی دۆستەکەم بکوژرێتەوە، تەتیس بەدەم گریانەوە بە ئاشیلی گوت: کوڕی خۆم، کە تۆ بەو جۆرە قسان دەکەی، خەم و دەردی من قورستر دەبێ، هکتۆر مەکوژە! ئەگەر ئەو بکوژی، وەکو ئەوەیە کە خۆتت کوشتبێ، چونکە چارەنووسی تۆ مردنە، واز بێنە با هکتور بژی و تۆش بۆ خۆت دەژیت.

ئاشیل کە بە کوڵ دەگریا گوتی: کە منیش دەستبەجێ دەمرم! خواوەندان دەیانەوێ مرۆڤان هەرگیز بەشەڕ نەیەن و تووڕە نەبن! چونکە ئەگەر من و ئاگامەمنون هەر دۆست بوایەین و زیز نەبوایەن، ئەوسا پاتروکولس نەدەمرد! بریا لەکاتی خەتەردا لەگەڵی بوایەمو ڕزگارم بکردایە! لێ تازە درەنگە و کار لە کار ترازاوە، ئەوەی بۆ من مابێتەوە هەر نێزەیە و هیچی دی. هکتور لە زەبری نێزەی من ناخەلەسێت.

تەتیس گوتی: کوڕم ، چۆن دەتوانی شەڕ بکەی؟ تا سبەنێ سەبر بکە و سبەینێ من چەکی تەواوت وێدەدەم– چەکێك کە هفایستوس–ی خواوەندی ئاگر، بۆتی دروست دەکات.

ئاشیل قەوڵی دایێ کە سەبر بکات، تەتیس لە شەقەی باڵی داو چووە چیای ئۆلەمپ و تکای لە خواوەندی ئاگر کرد کە چەکێکی تازە بۆ ئاشیل دروست بکات.

هفایسیتوسی خواوەندی ئاگر، دەمودەست دەست بەکار بوو، چوو بۆ کارگە، کرێکارانی بۆ کورە نا رد و رای سپاردن کە کورەکە دەم بدەن و فووی لێ بکەن، هەموو کرێکارەکان لە پشت کورەکەوە کەوتنە فوو کردن. خواوەندی ئاگر، مس، زیو، زێڕ، و پۆڵای خستنە ئاگرەوە، تا نەرم ببنەوە، ئەوجا سندانێکی گەورەی ئامادە کرد. چەکوشی گرتە دەست، مقاشی هێنا، زیوو زێڕ، مس و پۆڵای "قلع" لە ئاگرەکە دەرهێنا. هەوەڵجار مەتاڵێکی گەورەو قایم وبریقەدار و جوانی دروست کرد. ئاسمان و هەتاوو مانگ و ئەستێران لەو مەتاڵەدا دەبینران. هەروەها دوو شاریش دەبینرا، یەکێکیان لە حاڵی ئاشتیدا و ئەوی تریان لە حاڵی جەنگ دا، لە یەکێك لە شارەکاندا، خەڵکی لە شەقامەکانی شاردا دۆست و تەبا پیاسەیان دەکرد. لە شارەکەی دیدا شەقامەکان پڕ بوون لە جەنگاوەران کە بەرق و کینەوە شەڕیان دەکرد. هەروەها لە مەتاڵەکەدا ئەم شتانەش دەبینرا! مەزرای زێڕینی گەنم، ڕەزی پڕ لە هێشووە ترێی مسین، کەسانێك بەری ڕەزیان دەڕنی و خەڵکانێك گەنمیان دەدرویەوە، لەلایەکی مەتاڵەکەوە، گاگەلێکی زێڕین دەلەڕەوان. لەلایەکی دییەوە کۆمەڵێك کیژی گەنج دەستی یەکتریان گرتبوو و سەمایان دەکرد. هەموو قەراخی مەتاڵەکە دەریایەکی سەرسوڕهێنەری زیو بوو و دەدرەوشایەوە.

مەتاڵەکە ئامادە بوو. پاشان خواوەندی ئاگر زرێی دروست کرد، ئەوجا کلاوخودێکی بریقەداری دروست کرد و پەڕێکی زێڕینی لە ناوەندی کلاوخودەکە دانا.

چەکەکان ئامادە بوون، تەتیس سوپاسی خواوەندی ئاگری کرد و ئەوجا لە ئۆلەمپەوە لە شەقەی

باڵی داو چەکەکانی دەگەڵ خۆیدا برد.

کاتێ گەییە لای ئاشیل، ئاشیل دەستەو ئەژنۆ بەدیار جەنازەی پاتروکلوسەوە دانیشتبوو، پارچەیەکی سپی دابوو بەسەر جەنازەکەی پاتروکلوسدا، ئاشیل لەسەر زەوییەکە دانیشتبوو و لەگەڵ دۆستە مردووەکەیدا قسەی دەکرد. تەتیس چەکە تازەکانی پێ نیشان دا.

ئاشیل کە چاوی پێیان کەوت، دڵی روون بووەو و گوتی: دایکە، بێگومان خواوەندی ئاگر ئەم چەکانەی دروست کردووە، چونکە هیچ مرۆڤێ ناتوانێ بەم جوانییە دروستیان بکات. من بە زووترین کات زرێکە لەبەر دەکەم و بۆ شەڕ ئامادە دەبم، لێ دایکی ئازیزم، دەترسم لە کاتی دوور کەوتنەوەم دا، مێشی لاسار لە زامەکانی جەستەی پاتروکلوس بنیشن و کرم تێی بدات و خراپی بکات.

– ئاشیل، بیر لەم شتانە مەکەوە! هەڵبەتە مێش لە زامی کوژراوی مەیدانی شەڕان دەدات و خراپیش دەبێت. لێ من کارێکی وەها دەکەم کە جەستەی پاتروکلوس لەو شتانە بەدوور بێ. بەر لەوەی بۆ شەڕ بچی، یونانییەکان بانگ بکە و لەگەڵ ئاگامەمنوندا ئاشت ببەوە.

تەتیس، پەڕەی کەپوی پاتروکلوسی پڕ کرد لە دەرمانێکی جادویی تا مێش نزیکی نەکەوێتەوە. لەم کاتەدا ئاشیل لە کەشتی یونانییەکان نزیک بووەوە، بە دەنگی لەزرۆك گازی کردن. یۆنانییەکان لە هەر چار نکالەوە بەرەو لای ئەو غاریان دا. هەموو ئەوانەی توانایان هەبوو ئامادە بوون. دیومیدویس و ئودیسەش بە شەلە شەل ئامادە بوون. ئاگامەمنون ش هات. لێ زامەکانی ئاگامەمنون هێشتا هەر ئازاریان هەبوو. کە هەموو هاتن ئاشیل گوتی:

– ئاگامەمنون، کوڕی ئاتیرە، نەدەبوو من و تۆ هەرگیز شەڕمان کردبا. یونانیانێکی زۆر لە سۆنگەی ئێمەوە کو\ژران، تەروادەییەکان قازانجیان کرد. لێ ئێستا من هەموویم فەرامۆش کردووە و ئیدی چم لە دڵدا نییە، دەگەڕێمەوە بۆ مەیدانی شەر. کە ئاشیل ئەمەی گوت هەموو لە خۆشیاندا هورایان کێشا. ئاگامەمنون ش خۆشحاڵ بوو و گوتی: ئاشیل کاتێ من بریسەیس م بۆ خۆم برد، شێت و کوێر بووم. لێ خەتای من نەبوو، خە تای خواوەندان بوو کە کوێریان کردبووم. ئێستا رێم بدە با تۆڵەی ئەوە بکەمەوە. من نەك هەر بریسەیس ت بۆ دەگێڕمەوە بەڵکو جوانترین شتانی نێو چادرەکەشم، پێشکەش بە تۆ دەکەم.

– هەرچیت پێ خۆشە بیکە. بریسەیس بگێڕییەوە یان نەیگێڕیەوە، گرنگ ئەمەیە کە بۆ شەڕ بڕۆین.

ئاشیل خەریك بوو باڵی دەگرت بۆ رووبەروو بوونەوەی هکتور. بەڵام ئاگامەمنون بریسەیس و حەوت کەنیزەکی زۆر جوان و دوانزە ئەسپ وده گوڵدان و دە سکەی گەورەی زێڕی بۆ نارد. ئیدی هەموو ئاشت بوونەوە و یونانییەکان ئاهەنگێکی گەورەیان بەو بۆنەیەوە گێڕا.

سەربازان و فەرماندان خواردیان و خواردیانەوە، چونکە دەیانویست خۆ بۆ شەڕ ئامادە بکەن. تەنێ ئاشیل بوو کە نە هیچی خواردەوە و نەهیچی خوارد. چووە دیار جەنازەکەی دۆستەکەی و گریا. بریسەیس و یەخسیرەکانی دیکەش گریان، چونکە پاتروکلوس، بۆ هەموویان باش بوو.

ئاشیل، نەخواردی و نەخواردییەوە، بەڵام پالاس ئاتنا، کە ئەوی زۆر خۆش دەویست، لە

ئاسمانیٚ ڕا هاته خواریٚ و هەنگوین و نانی خواوەندانی دایێ تا بتوانیٚ بەهێز و توانای نا ئاساییەوە بجەنگیٚ ، پاشان شادی گەڕایەوە نێو یونانییەکان.

"20"

## حیکایەت و سەربوری ئاشیل، ئاینیاس و هکتور

یۆنانییەکان خواردیان وخواردیانەوە، خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد، وەکو گلێرە بەفری ڕۆژێکی زستانی سارد و سەخت لەسەر کەشتییەکانیان بە کڵاوخود و زریٚ و نێزە و مەتاڵەوە، بەسەر زەویدا دادەبارین. بریسکەو چەك هەموو شوێنێکی پڕ کرد. دنیا غەرقی ئەم بریسکانە بوو.

ئاشیل، وەکو خواوەندی ئۆلەمپ، چەکی ئاسمانی هەڵگرت: بەلەك پێچی پۆڵای بەست. زرێکەی لە سینەی بەست. شمشێری بە کێڵانەوە لە قەد کرد، کڵاوخودەکەی لەسەری توندکرد، مەتاڵ و نێزەی بەدەستەوە گرت، نێزەیەکی گەورە و قورس کە جگە لەو کەسی دی نەیدەتوانی بەکاری بەریٚ. مەتاڵەکەی وەکو مانگ شەوقی دەدا و پەڕی کڵاوخودەکەی وەکو هەتاو دەدرەوشایەوە. تەنانەت دۆستەکانیشی بەم قەڵافەت و هەیبەت و سامەوە لێی ترسان.

بەڵام گالیسکەرانەکەی ئاشیل، لە ئاشیلی قارەمان ترسا، چونکە خوی بەو هێزە لە بەزین نەهاتووە وەگرتبوو، هەر کە ئاشیل حازر بوو، گالیسکەرانەکە، سەرکەوتە سەر گالیسکەکە و هەڵیکێشایە قامچی. ئاشیل ش سوار بوو. هێشتا ئەسپەکان حەرەکەتیان نەکردبوو کە یەکێکیان، گزانتوس، سەری بردە خواریٚ و لە کاتێکدا کە یاڵی لە عاردی دەماڵی، گوتی:

لیو: ئەسپەکە قسەی کرد:

- بەڵیٚ، ئەسپەکانی ئاشیل ئەفسانەیی و نەمر بوون و لەوەشە تەتیەس فێری قسەکردنی کردبووبیٚ تا نەیەڵیٚ ئاشیل بۆ شەڕ بچێت.

لیو گوتی: لەوەیە تەتیەس خۆی بووبیٚ و خۆی کردبووبیٚ بە ئەسپ.

ئیٚ چی گوت؟

گوتی: ئاشیل، من ڕاستیت پیٚ دەڵێم. تۆ پاڵەوانی، بەهێزی. بەڵام مەرگ چاوەنۆڕتە. ئەگەر بچیەوە بۆ شەڕ، مەرگ یەخەت دەگریٚ و بە عارد تا دەدات.

لیٚ ئاشیل وەڵامی دایەوە: ئەی گزانتوس، ئەگەرچی دەزانم چارەنووسی من مردنە لە تەروادە، لیٚ لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئامادەم. ئێستا تۆ دەتەویٚ لە ترسی مەرگ بگەڕێمەوە؟ ئەوەی تۆ ئەنجامی دەدەیت جوان نییە و من دەستبەرداری شەڕ نابم. با بڕۆین.

گالیسکە ڕانەکە، ئەسپەکانی بەر قامچی داو ئەسپەکان دەرپەڕین. مەیدان لە خەڵك و ئەسپ دا جمەی دەهات: بریق و هۆڕی چەك ئاوی چاوی دەبرد. زەوی لە ژێر سم و سمکۆڵی ئەسپاندا دەلەرزی.

دوو قارەمـان لـە دوو لاوە و لـە ریـزی یەکەمـەوە بـەرەو رووی یەکـدی هـاتن. ئـەو دوو قارەمانـە ئاشیلی کوڕی پلیوس و ئاینەیاسی برای پریام بوون.

ئاینەیاس نەفەری یەکەم بوو. کڵاوخود لەسەر و نێزەیەکی نوك مس بەدەستی راستییەوەبوو. سینەی بە زریّ و مەتاڵ داپۆشرابوو.

ئاشیل کە ئەوی بینی، وەکو چۆن شێرێکی برسی کە بە کلکان بە قەبرغە و پشتی خۆیدا دەکوتیّ و بە زاری تەواو کراوەو ددان و کەڵبەی کەف چەڕینەوە و بە چاوانی بە بریسك و هۆڕی وەکو هەتاو، بە پەلە بەرەو رووی چوو.

ئاینەیاس ویستی لە ئاشیل بدات. دەنگی نێزەکەی لەسەر قەڵغانی قارەمان دەنگی دایەوە، بەڵام نەیشکاند. چونکە خواوەندی ئاگر دروستی کردبوو! ئەمجار نۆرە هاتەسەر ئاشیل و نێزە درێژەکەی هەڵبڕی و هاویشتی، نێزەکە ئاینەیاسی بریندار نەکرد، بەڵام قەڵغانەکەی شکاند و لە کەڵکی خست، ئاینەیاس هەنگیّ دانەوەییەوە، لە بەردێکی گەورە نەوی کە بە دوو کەسان هەڵنەدەگیرا، بە ئاسانی هەڵیگرت و ویستی بیگرێتە خەنیمەکەی. بەڵام ئاشیل بە شمشێری رووتەوە لەسەری دانیشتوو و ئەگەر لەو ساتەدا هیمدادێکی غەیبی فریای پاریس نەکەوتبا، بێگومان جەزرەبەی لێدەدا و ئاینەیاس لە مەیداندا دەکوژرا. ئاشیل دەیویست لە ئاینەیاس بدات، لەپڕ تەمتومانێکی چڕ بەرچاوی گرت و هیچی لێدیار نەما. نە خەنیمی دەبینی و نە مەیدانی شەڕ، هەموو دنیا هەر هەور و تەم بوو. لەو ساتەدا ئاینەیاس هەستی کرد دەستێك بۆ ئاسمانی هەڵیکێشا، ئەو کەسی نەدەبینی، بەڵام ناچار بوو غار بدات. بە جۆریّ غار بدات کە هەرگیز غاری وای نەدابوو، لە کاتێکا کە غاری دەدا و لە مەیدان دوور دەکەوتەوە و باش دوور کەوتەوە هەڵوەستەیەکی کرد. دەنگێکی ژنەفت دەنگێکی خوایانە کە دەیگوت: ئاینەیاس، کامە خواوەند دەستوری بە تۆ داوە کە بە گژ ئاشیل دا بچی؟ تۆ لە هەمووان بە قووەتری و دەتوانی بە سەریاندا سەربکەوی، بەڵام ناتوانی بەسەر ئاشیلدا سەربکەوی و نابیّ لەگەڵ ئەودا بجەنگی.

لیو گوتی: کیّ ئەو قسانەی دەکرد؟

– پوسیدونی خواوەندی دەریا بوو، خواوەندان ئاینەیاسیان خۆش دەویست و قەدەرێکی گەورەیان لە چارەی نووسی بوو، لە چارەیان نووسی بوو کە ئەگەر ئاینەیاس لە جەنگ بخەڵەسیّ، ببیّ بە سەرۆکی تەروادەییەکان. لە راستیدا هەر واش بوو. ئاینەیاس، سەرۆکایەتی ئەو تەروادەییانەی کە توانی بویان خۆیان نەجات بدەن، لە ئیتالیادا کرد و بوو بە پاشا. خۆ ئەگەر ئەو چیرۆکەی دەیگێڕنەوە راست بیّ ئەوا هەندیّ لە ئیتالییەکانی ئەمڕۆ کوڕی کوڕیّ کوڕی کوڕی کوڕی کوڕی ئەو تەروادەییانەن.

لیو گوتی: دایە، کەوابیّ من تەروادەییم.

– تۆ نە، تۆ لە قەومێکی دیکەی، ئەم قەومە حیکایەت و سەربوورێکی دیکەی هەیە، تەواو جیاوازە، بەڵام زۆر جوانە. من گوتم "هەندیّ لە ئیتالییەکان" ئەوانی دی یان لە یونانەوە هاتوون، یان لە ئەڵمانەوە و هەندێکی دی کاتیّ کە تەروادەییەکان هاتن، هەر لەویّ بوون.

باشە با بگەڕێینەوە لای ئاشیل کە لە مەیدانەکەداو لە نێو تەمتوماندا بە جێمان هێشت. مەگەر

خوا بزانێ چەند تورە بوو! تەمتومانەکە هێدی هێدی رەویەوە. ئاشیل بۆ ئاینەیاس گەڕا، بەڵام نەیدۆزییەوە. یەکسەر حاڵی بوو کە خواوەندان یارمەتی خەنیمەکەیان داوە. هەنگینێ بە تورەیی و هێزێکی لە ئەقڵ بەدەر بەرەو لەشکری بەرانبەر هێرشی برد و گەییە هەر کەسێك کوشتی.

بەراستی سامناك بوو، هەر کەسێك دیبای لەرزی لێدەهات. کەس زاتی نەدەکرد خۆی لەبەری بگرێ. زۆر لە جەنگاوەران هەڵاتن و لە ترسی ئاشیل کەوتنە روباری ئاگزانتووە، قورسی چەکەکانیان تا بنی رووباری دەبردن. رووبارەکە پڕ بوو لە مردوو و چەك و خوێن. هەندێك چۆکیان لە بەرانبەر ئاشیل دا داداو پاڕانەوە کە نەیانکوژێت. بەڵام ئاشیل لەبەر ئەوەی پاترۆکلوس یان کوشتبوو رەحمی بە کەسدا نەدەکرد، ژمارەیەك بۆ ناو شار هەڵاتن. ئاشیل بەتەنێ لە مەیدانی دژمندا مایەوە. ئەم سەرو ئەوسەری دەکرد تا کەسێك بدۆزێتەوە و بیکوژێت. کە نێزەکەی بادەدا، تەنانەت ئەوانەی لێوەی دوور بوون، زراویان لە بریقەی نێزەکەی دەتۆقی.

هکتوری کوڕی پریام، بەهێزترین جەنگاوەری تەروادە، لەبەردەم یەکێك لە دەروازەکانی شاردا وەستابوو، ئامادەی شەڕ بو، پریام فرمێسکەکانی دەڕشت و لێکدا لێکدا گازی دەکرد: کوڕم، کوڕم! شەڕی ئاشیل مەکە! ئاشیل زۆر رۆڵەمی کوشتوە و زۆریانی لە دورگە دوورەکاندا فرۆشتون!

شەر مەکە کوڕم! بگەڕێوە بۆ ناو شا ر. چونکە تۆ تاقە بەرگریکاری ئێمەی! ئەگەر تۆ بمری، هەموومان دەمرین.

هکوبای مەلیکەی پیر ش دەگریا و داوای لە کوڕەکەی دەکرد کە بگەڕێتەوە.

بەڵام هکتور وەڵامی نەدەدایەوە. بێ جوڵە چاوەنۆڕ بوو، لە فکران راچوو: من ناتوانم پاشەکشە بکەم. یان دەبێ بمرم یا دەبێ ئاشیل بکوژم، چ چارێکی دیکەم نییە، چونکە گەر بمانەوێ هیلین بدەینەوە داوای مەسڵەت بکەین ئەوا دژمنان پێمان خۆش دەبن، ئەوان ئێستا بەهێزترن و ئەمە قەبوڵ ناکەن و دەڵێن ئێمە بێ غیرەتین. کەواتە یا سەرکەوتن یان مردن.

هکتور، بێ چ ترسێك لە ئاشیل، لەوێندەر مایەوە، بەڵام کاتێ ئەوی لەنزیکەوە و بەو هەموو چەکەوە بینی. زاتی لە دەست داو لەپڕ هەڵهات، کوڕەکەی پریام سێ جاران بە دەوری حەساری شاردا سوڕایەوە. ئاشیلش سێ جاران دوای کەوت لە سوری چوارەم دا هکتۆر کوڕێکی لاوی بینی کە بەرەو رووی دەهات. هەر لە " "دی فوبوس"ی برای دەچوو.

لیو: ئەدی ئەو نەبوو؟

– نە، پالاس ئاتنا بوو، کە بۆ کۆمەکی ئاشیل و فریودانی هکتور رواڵەتی دی فوبوس ی گرتبووە خۆ. کە لێی نزیك بووەوە گوتی: برا، ئەوە بۆ هەڵدێی؟ چاوەنۆڕی ئاشیل بە، پێویستە بجەنگین. بەخۆت دەبینی کە ئەو بەسەر تۆدا سەردەکەوێت یان تۆ بەسەر ئەودا.

هەنگێ هکتور، سوپاسی دی فوبوس ی کرد و وەستا. ئەوجا لەگەڵ ئاشیل دا کەوتە قسان: ئەی ئاشیل، من ئیدی لەبەرت هەڵنایەم، یان تۆ سەردەکەوی یان من. بەڵام با مەرجێك بکەین، ئەگەر من تۆم کوشت و رووتم کردییەوە و چەکە جوانەکانتم برد، جەنازەکەت بە دۆستەکانت دەدەمەوە و تۆش هەمان کار لەگەڵ مندا بکە.

ئاشیل بە تورەیی روانییە هکتور و گوتی: چ مەرجێك لە نێوان مرۆڤ وشێر و گورگ و مەڕو تەنانەت لە نێوان دوو مرۆڤیش دا کە رقیان لێکدی بێ، ناکرێ، من رقم لە تۆیە. چونکە تۆ، من و دۆستەکانتم زۆر ئازار داوە و زۆرت لە قارەمانانی ئێمە کوشتووە. تەنیا بیر لە سەرکەوتن بکەوە و منیش تەنیا بیر لەمە دەکەمەوە.

ئاشیل نێزەکەی تێ سرەواند. بەڵام هکتور خۆی دانەواندەوە و نێزەکە بەسەر سەریدا رۆیو لە پشت ئەوە وە کەوتە سەر زەوی. پالاس هەڵیگرتەوە و دووبارە گەڕاندییەوە بۆ پشتیوانەکەی. هکتور ش نێزەکەی خێواندی، نێزەکە بەر قەڵغانەکەی ئاشیل کەوت، بەڵام نەیشکاند و لەو لاترەوە کەوتە سەر زەوی. ئەوسا هاواری کرد: دی فوبوس، برایەکەم، کوا نێزەیەکی دیکەم وێدە تا بتوانم بجەنگم!

بەڵا چ کەسێك وەڵامی نەدایەوە: دی فوبوس ون بوو بوو، هکتور لە فیکەی خۆی حاڵی بوو، پەی بە حیلەکە برد. ئەوجا بە شمشێرەوە بەرەو ئاشیل هێرشی برد. ئاشیل بە قەڵغان زۆر چاك بەرگری لە خۆی دەکرد. ئاشیل، بۆ سوچێکی لاوازی زرێیەکەی هکتۆر دەگەڕا تا نێزەکەی لێوە بەرێتە ژوورێ، چاوی بە ئەوکی دژمن کەوت. رێك ئەو شوێنەی کە زرێییەکەی تەواو دەبێ و ملی رووتە. ئەوجا بە هەموو هێزییەوە نێزەکەی سرەواندە ئەو شوێنە، نێزەکە چوو بەگەرووی هکتۆر دا و قارەمانی تەروادە گەییە حاڵی مەرگ و کەوتە سەر زەوی. ئاشیل لەبەر ئەوەی دەبوایە جەستەکەی بداتەوە بەبابی کەوتە گریان. ئاشیل پەشیمان بووەوە جەنازەکەت دەبێ بە خۆراکی کسۆکان ئەی بکوژی پاتروکلوس، نێزەکەی لە گەردنی کێشایەوە و چەکەکانی لێداماڵی. ئەوجا یونانییەکان گەیینە جێ. هەر یەکەیان برینێکیان کردە ئەو.

ئاشیل گوتی: ئێستا لەوسا جوانتری کە دەتەویست کەشتییەکان بسوتێنی!

لیو گوتی: ئەو کارەی کە کردیان، کارێکی ناشیرین بوو.

– بەڵام بەلای یونانییە کۆنەکانەوە ناشیرین نەبوو، هەروەها ئاشیلی لە هەمووان پیاوانەتر کارێکی کرد کە هیچ قارەمانێکی ئەمڕۆ نایکات. پێی مردووەکەی بە گالیسکەوە بەست. سواری گالیسکەکەی بوو ئەسپەکانی بەر قامچیان دا. جەنازەی کوڕەکەی پریامی بەنێو تەپوتۆزاو بەسەر زەویدا راکێشا.

تەروادەییەکان بەسەر دیوارەکان کەوتن. کاتێ قارەمانەکەی خۆیان بەو حاڵەوە بینی، بە کۆمەڵ گریان. شا گریا. شا بانۆ گریا. ئاندروماخەی هاوسەری قارەمانەکە، فرمێسکی زۆری هەڵڕشت. ئاشیل، جەنازەی هکتوری بەرەو کەشتییەکان رادەکێشا. لە شاردا پیاوان، ژنان، منداڵان، هەر هەموو دەگریان. خۆیان بەعاردی دا دەدا و شێوەنیان دەکرد. پریام شەوو و رۆژ دەگریا. پریام دوای چەندین رۆژ گریان هەستا، لەسەر پێیان وەستا و گوتی: من دەچمە نك ئاشیل و داوای جەنازەی کوڕەکەمی لێدەکەمەوە. بەڵکو بە دیتنی پیرێکی ماندووی دڵسوتاو، دڵی نەرم ببێ و جەنازەی کوڕەکەم وێداتەوە. ئەوانی دی گوتیان، ئاشیل جەنازەی کوڕەکەت ناداتەوە و لەوانەیە، تۆش بکوژێ مەڕۆ، مەڕۆ. بەڵام پریام بە گوێی شابانۆ و شازادەکان وخەڵکەکەی نەکرد و بە تاقی تەنێ بۆ ناو دوژمن رۆیی.

"21"

## واریقاتی ئاشیل و پریام

ئاشیل کە جەنازەکەی هکتوری بە گالیسکەکەیەوە بەستبوو، سەرکەوتوانە بۆ لای کەشتییەکان گەڕایەوە، بەڵام کاتێ کە نزیکی کەشتییەکان بووەوە، دووبارە دۆستە مردووەکەی بینییەوە، دەردی زیادی کرد، گریا. هاواری کرد و لە کۆتایی دا دەستووری دا کە لەسەر شەرەفی پاترۆکلوس نان وخوانێ بەرپا بکەن.

گاو مەڕ و بەرخێکی زۆریان کوشتەوە. لە کۆتایی ڕێوڕەسمەکەدا، جەنگاوەران بۆ ئیسراحەت گەڕانەوە بۆ چادرەکانیان. بەڵام ئاشیل نەیدەتوانی بخواو بخواتەوە و ئیسراحەت بکات. بەدەم گریانەوە بەرەو ڕەخی دەریا غاری دا و خۆی دەنێو لمی ڕەخەکەدا گەوزاند. بەدەم گریانەوە خەوی لێکەوت. لە خەونی دا پاترۆکلوسی بینی. پاترۆکلوس، کە جلوبەرگی شازادەی لەبەر بوو وەکو زندوو دەهاتە بەرچاو. بە ئاشیلی گوت:

- دۆستی من، بۆچی تا ئێستا جەنازەکەت نەسووتاندووم؟ تا زووە بیسووتێنە و پاشان ئێسقانەکانم کۆ بکەوە و بیانخە ئەو گوڵدانە گەورە جوانەوە کە تەتیەسی دایکت بەر لەوەی بۆ جەنگ بچیت، بە دیاری دابووی پێت. با شتێکی دیکەشت پێ بڵێم. چەند ڕۆژێکی دیکە تۆش دەمریت، من حەز دەکەم وەکو چۆن لە دنیادا بە یەکەوە بووین، لە مەرگیشدا هەر بەیەکەوە بین و ئێسقانەکانت لە هەمان گوڵداندا لە پاڵ ئێسقانەکانی منەوە بێ.

ئاشیل، لە خەوەکەیدا بەڵێنی دا کە داواکانی پاترۆکلوس بەجێ بێنێ، بەڵام کە ویستی دۆستەکەی لە ئامێز بگرێ نەیتوانی. ئاشیل لە خەو ڕابوو. یاوەرەکانی هەستان. ناردنی بۆ دارستان تا چیلکە و دار بێنن و جەنازەکەی پاترۆکلوس بسووتێنن.

هەموو بەعارەبانە و هێستر و تەشوێ و تەورەوە چوون بۆ دارکردن. کە گەڕانەوە چیلکە و دارەکانیان لەو شوێنە دا هەڵڕشت کە ئاشیل دیاری کردبوو. بەلق و پۆپی جوان شوێنێکی گەورەیان ڕێك خست کە بەشی سووتاندنی 20-30 کەسی دەکرد. پاشان هەر جەنگاوەرێك چەپکێك لە قژی خۆی بڕی و وەکو ڕێزو حورمەت لەسەر جەنازەکەی پاترۆکلوسی دانا. ئاشیل هەموو قژە زەرد و درێژەکەی تاشی و خستییە نێو هەردوو دەستی دۆستەکەیەوە.

هەر هەموو لەشکرەکە لە دەوری چیلکە و دارەکان خڕ بوونەوە. هەموو بە بێدەنگی سەیریان دەکرد. هەروەها فەرماندە و سەرکردەکانیش. ئاشیل جەنازەکەی پاترۆکلوسی خستە سەر ئەو دارە ڕاستانەی کە وەکو تەختی خەو ڕێك خرابوون. مەڕێکی زۆر، چوار ئەسپ، دوو سەگیان کوشتەوە و لەگەڵ ئەوانەدا 12 تەروادەیی بە دەستی ئاشیل کوژراویان لە دەوری جەنازەکەی پاترۆکلوس دانا.

رۆن و هەنگوینێکی زۆریان بەسەر لاشەکاندا کرد. ئەو جا ئاگریان دان. ئاگر هەڵبوو، دەنگی سووتانی دارەکان دەهاتە گوێ. لە هەموو لایەکەوە شتی زێڕیان لەئاگرەکە دەهاویشت. لە ئاسمانێ را مەشخەڵێك، هەوەڵجار بچوك و وەنەوشەیی و پاشان سوور و گەورە بلێسەی سەند و بە درێژایی شەو هەر سووتا. ئاگرەکە لە سپێدەی بەیانی دا تەمری و کوژایەوە.

ئاشیل ئێسقانەکانی پاترۆکلوسی کە لەگەڵ هەتاودا شەڕی دەکرد، کۆ کردەوە و خستییە ئەو گوڵدانە زێڕە گرانبەهایەوە کە دایکی بەر لەهاتنی بۆ شەڕ بە دیاری دابوویێ. گوتی:

– بەم زووانە منیش دەمرم. جەنازەکەم بسووتێنن و ئێسقانەکانم بخەنە هەمان گوڵدانەوەو لە پاڵ ئێسقانەکانی پاترۆکلوسدا دایبنەن. بەڵام جارێ ئەم گوڵدانە بە گڵ داپۆشن و کێوی بەرز وگەورەی لەسەر دروست بکەن.

جەنگاوەران بە گوێیان کرد. ڕێ و ڕەسمی ناشتن تەواو بوو. پاش ناشتنەکە دەستیان بە یاری کرد. یونانیانی کۆن، پاش ڕێ و ڕەسمی پرسە، بە یادی قارەمانانی خۆیانەوە هەندێ پێشبڕکێیان ئەنجام دەدا. بەم بۆنەیەوە ئەو ڕۆژە پێشبڕکێی کەشتی و تیرەندازی و غاردانێ بەرپا بوو. لەلایەن ئاشیل شەوە بە یادی پاترۆکلوس، دیاری و خەڵاتی بە نرخی وەك چەك، کۆیلە، گا، هێستر، گوڵدانی زێڕ و سێ پایە و ئەسپ، بەسەر بەشدارانی یارییەکاندا بەشرایەوە. گەمە و پێشبڕکێ بە درێژایی ڕۆژ بەردەوام بوو، باشترین یونانیان بە دیاری و خەڵاتەوە بۆ چادرەکانیان گەڕانەوە. ئاشیل دیسان بۆ ماوەیەك بە دیار گۆڕی دۆستەکەیەوە بە تەنێ مایەوە و پاشان ئەویش بۆ چادرەکەی گەڕایەوە.

ئاشیل، لە حاڵێکا کە بەدەم دانیشتنەوە دەگریا، لە دوورەوە پیرەمێردێکی بەدی کرد کە بەرەو چادرەکەی دەهات. ئەو پیرەمێرە پریامی پاشای تەروادە بوو، ڕەنگ ورووی پەڕیو، چاوانی دەتگوت کانییەکن و ئاوێکی زۆریان لەبەر ڕۆییوە و بەردەوام دەڕوات. پاشای پیر نزیکی ئاشیلی لاو بووەوە. کڕنۆشی برد، دەستەکانی ماچ کرد. کەوتە سەر زەوی، ئەژنۆکانی گرتنە باوەش.

– ئاشیل ی ئاسمانی، سەیری من بکە! دەبینی چەند پیرو تەنیام! پەنجا کوڕم هەبوو هەر هەموویان مردوون! هکتورش بە هێزترین کوڕم بە دەستی تۆ کوژرا. ئەو بەرەڤانی لە نیشتمان دەکرد! خۆش بە حاڵی بابی تۆ کە کوڕەکەی هێشتا زندووە. بەدبەخت خۆم کە دەبێ بێدەسەڵاتانە لەبەردەم پیاوێك دا کە کوڕەکەی کوشتوم دەست پان بکەمەوە. لێت دەپاڕێمەوە کە جەنازەی کوڕەکەم بدەیەوە! بیر لە بابی خۆت بکەوە و بەزەییت بە مندا بێتەوە!

لیا پاڕایەوە: بڵێ بزانم دەیداتەوە.

ئاشیل قەدەرێ تەماشای پاشای چاو بە گریانی بەچۆکدا هاتووی کرد و ئەوجا گوتی:

– تۆ وەکو بابم وایت، هێندە سۆزت بزواندم کە جەستەی هکتورت وێدەمەوە، لێرەدا لە چادرەکەمدا تێر بخۆ و بخۆوە و بمێنەوە، من دەستور دەدەم کە کوڕەکەت بخەنە نێو عەرەبانەیەکەوە تا تۆ بتوانی بۆ تەروادەی بەریتەوە.

ئاشیل لە چادرەکە وەدەرکەوت و دەستووری بە غوڵامان دا کە جەنازەکەی هکتۆر بشۆن، چەوری بکەن و بە شکۆدارییەوە داپۆشن و بیخەنە سەر عەرەبانەیەك و بەرخێکیش بکوژنەوە و

بیبرژێنن و بۆ پریام پاشای دابنەن  با نان بخوات.

ئاشیل گوتی: ئەی شا، بڵێ بزانم، دەتەوێ تا تۆ لە پرسەی هکتور دایت، سولْح بکەین؟ ئەگەر دەتەوێ من بە یونانییەکان دەڵێم شەڕ نەکەن، بەڵام بڵێ بزانم چەند رۆژت دەوێ.

پاشای پیر گوتی: نۆ رۆژم دەوێ بۆ کورەکەم بگریم و لە دەیەم رۆژا جەنازەکەی دەستووتێنین و رۆژی یانزەیەم بە خاکی دەسپێرین و دوانزەیەم رۆژ دەست بەشەڕ دەکەین.

ئاشیل قەولی مۆڵەتێکی یازدە رۆژەی دا، بۆماوەی یازدە رۆژان ئیسراحەتیان کرد.  لە دوازدەیەم رۆژا شەڕ دووبارە دەستی پێکردەوە. هەموو جەنگاوەران چەکیان هەڵگرت و ئاشیل بە هێزترین پیاوانی کوشت. چونکە کەس خۆی لەبەری نەدەگرت.

بەڵام قەدەر و چارەنووسی نزیك دەبووەوە. ئەو رۆژەی کە پلیوسی پیرو هەموو میرمیدونەکان و یۆنانییەکان دەگریان، رۆژی سامناکی مەرگی ئاشیل، نە زرێی عەجایەب، نە هێز و توانای لە شکست نەهاتو، هیچیان نەیاندەتوانی قارەمان رزگار بکەن. چونکە دەبوایە بمرێ. تەنانەت پێستە قایمە چەرم ئاساکەشی نەیدەتوانی رزگاری بکات. وەختێ کە ئاشیل بچووك بوو. تەتیەسی دایکی ئاشیل، ئاشیلی لە پێستێکی قایمی وەکو پۆڵاوە پێچاو لە ئاوی روباری ئەستوکیس ی هەڵکێشا و شوشتی. جا خەسێتی ئەم روبارە ئەوە بوو کە هەر کەس و هەر شتێکی لێ هەڵکێشرایە.  بەدەنی زۆر قایم دەبوو، قەمە و سونگی نەیدەبڕی. بەڵام کاتێ ئاشیلی لە ئاوی رووباکە هەڵکێشا، پاژنەی چەپی کە بەدەستی دایکییەوە بوو تەڕ نەبوو، ئاوی رووبارەکەی پێ نەکەوت. جا لەبەر ئەمە پاژنەی ئاشیل لاواز بوو، پاریس ی کوڕی پریام پاشا بەمەی دەزانی. بۆیەکە چووە مەیدانی شەڕەوە پاریس نیشانەی لە پاژنەی پێی گرت و ئەنگاوتی. قارەمان کەوتە سەر زەوی و لەبەردەم پاریس دا مرد. بە پێی ئەجەل، پاریس کۆتایی بە ژیانی پڕ لە شانازی و کورتی ئاشیل هێنا.

ئاشیل ی بە هێزترین و جوانترین قارەمان مرد. تەتیەس لە ئەشکەوتدا فرمێسکی مرواریوئەڵماسی باراند. خوشکەکانی لە بنکی دەریادا گریان. سەربازان و فەرماندەکان لەسەر زەوی گریان، شاعیران شیعریان گوت. تەنیا تەروادەییەکان نەگریان. چونکە پێیان وابوو ئێستا کە ئاشیل، بەهێزترین دژمنیان لە کۆڵ بۆتەوە، تەروادە دەتوانێ سەر بکەوێ.

## "22"

## سەربوری ئەسپی دارین

ئاشیل مردبوو، فەرماندەکان لە تەگبیری ئەوەدا بوون کە چ بکەن، ئودیسەی زیرەك و دانای پاشای ئیتاکا، دەستی بە قسان کرد:

فەرماندەکان، جەنگاوەری دلێری ئێمە، ئاشیلی کوڕی پلیوس مردووە، ئاشیل مردووە، یانی

باشترین پیاوی ئێمە مردووە، ئێمە تازە ئەوەمان لە دەست چوو کە بەشەڕ لەتەروادەییەکان بەرینەوە، مەگەر فێڵێك بدۆزینەوە. دەبێ ڕێگەیەك بۆ خەڵەتاندنی دژمن بدۆزینەوە کە پەی پێ نەبات، دەبێ غافڵگیریان بکەین. ئەی فەرماندەکان من دەترسم کە ناچار بین بەشەرمەزارییەکی زۆرەوە بگەڕێینەوە، ئەو کاتە خەڵکی دەڵێن: جەنگاوەران دوای دەسالان شەڕ، دوای دەسەلان دووره ولاتی، دوای دەسەلان شەڕ لە رای وەدەست هێنانەوەی هیلین و لە ئەنجامدا هیلین لەتەروادە مایەوە و ئەوانیش بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە، ئەی فەرماندەکان من بە ئێوە دەڵێم کە دەبێ بەهەر نرخێ بووە سەربکەوین. دەبێ هەموو ڕێیەك بۆ سەرکەوتن بگرینەبەر!

ئاگاممنون گوتی: قسەکانت بەجێن، بەڵام ڕێی دروست کامەیە؟

– زۆرم بیر لێ کردۆتەوە. بە بۆچوونی خۆم ڕێگام دۆزیوتەوە. گوێ بگرن: ئەسپێکی دارینی زۆر گەورەی ئەوتۆ کە هەشت یان دە کەس بگرێت دروست دەکەین. دەگەڵ خۆدا بۆ تەروادەی دەبەین، لەنیوەی شەوێدا جەنگاوەرەکان بەدزییەوە لەنێو ئەسپەکە، وەدەر بکەون. دەرگاکان دەکەنەوە، ئێمە پەلاماری تەروادە دەدەین. پێتان وانییە کە بەم شێوەیە بتوانین سەربکەوین؟

ئاگاممنون گوتی: بێگومان ئەمە ڕێگەیەکی باشە!

نەستور گوتی: بەڵێ ڕێگەیەکی باشە، بەڵام مەسەلەیەك هەیە. ئایا تەروادەییەکان ڕێ دەدەن ئێمە ئەسپەکە بگەیەنینە ناو شار؟ مینلایوس گوتی: لەوەیە وا بزانن کە فێڵێك لە ئارادایە، بۆیە ئەسپەکە لە دەرێی حەساری شار رادەگرن!

– هەڵبەتە ئەمە بۆ خۆی کێشەیەکە، من بەر لەوەی قسە دەگەڵ ئەنگۆدا بکەم، ماوەیەکی زۆر بیرم لێکردەوە، ڕێیەکم دۆزیوەتەوە. پیاوێك دەناسم کە دەتوانێ یارمەتییەکی باشمان بدات. بۆ ئەوەی تەروادییەکان باشتر بکەونە تەڵەوە، هەر فەرماندەیەك دەستووری پێویست بەسەربازەکانی دەدا، بەڵام ئێمە کاتێ دەتوانین لە سەرکەوتن دڵنیا بین کە زیوس کۆمەکمان بکات، ئایا ئەنگۆ لەم رووەوە کۆمەکی من دەکەن؟

– بێگومان

– مەعلوم.

– تۆ لە هەمووومان زاناتری.

– لێوەشاوە و کارامەتری.

– لە هەمووومان زیرەکتری

– ئێمە باوەڕمان بەتۆیە.

کە فەرماندەکان ئەوە وەلامیان بوو، ئودیسە چوو بۆ نك دارتاش و ئەسپێکی دارینی دایە کرد:

– ئەسپێکی دارینم بۆ دروست بکە کە بە ئەندازەی چوار ئەسپی راستی بێ بەسەر یەکەوە. ئەم ئەسپە زۆر جوان بێ ولە ناوییەوە ژوورێکی بچوك هەبێ کە خەڵکێکی زۆر بگرێ. بەڵام نابێ دەرگای ئەسپەکە دیار بێ، جا لە زووترین کاتدا بۆم دروست بکە و لەلای کەس باسی نەکەی.

دارتاشان کەوتنە کارکردن، شەوو ڕۆژیان دایە دەم یەکەوە.

هەر لەو کاتانەدا ئەسپە دارینەکە دروست دەکرا، ئودیسە کەشتیوانانی گاز کرد وگوتی:

– هەڤاڵان ئێمە لە شەڕ بێ تاقەت بووین کەشتییەکان ئامادە بکەن و خۆتان بۆ حەرەکەت حازر بکەن. چونکە دەمانەوێ بۆ نك ماڵ و منداڵانمان بگەڕێینەوە.

کەشتیوانەکان لە خۆشحاڵیدا هاواریان کرد و بەرەو کەشتییەکان غاریاندا تا بۆ حەرەکەت حازر بێن. بەڵام ئودیسە بۆ لای کەشتییەکان نەچوو. چوو بە دوای کەسێك دا کە زۆر چاکی دەناسی و زۆری پێویست پێی بوو، دەگەڵ خۆیدا بۆ چادرەکەی هێنا.

– سینون تۆ زرنگ و بەهۆشی و دەتوانی بە چاکی خۆت بگۆڕی!

– بەڵام بە ئەندازەی تۆ نا، بیرتە کە لە بەرگی دەرۆزەکەردا چوویتەناو دژمن و هێزو توانایانت زانی.

– باشە، لەوێندەر من چووم، ئێستاش نۆرەی تۆیە. سینون کاتی ئەوە هاتووە کە هەموو کارامەییەکی خۆت بنوێنی. من نیازێکم هەیە تەنیا بە تۆی دەڵێم، چونکە تەنیا تۆ دەتوانی فریام بکەوی. دەمەوێ کارێ بکەی کە تەروادەییەکان بێڵن ئەو ئەسپەی کە دارتاشەکان خەریکی دروست کردنین، بیبەنە ناو شارەوە، ئەگەر تۆ بتوانی بیبەیە ناو شارەوە، ئیدی بە درێژایی تەمەنت پێویستت بە کارکردن نامێنێ. چونکە هێندەت دیاریو خەڵات دەدرێتێ کە بە هەموو ئاوات و ئارەزوویەکت بگەی..

– شا ئودیسە، تۆ دەتەوێ ئەم ئەسپە بگەیەنیتە ناو شار؟ بۆچی؟ بەکەڵکی چی دێت؟

سینون، ئەمەی بە شێوەیەك گوت، وەکو ئەوەی لە مەسەلەکە بێ ئاگا بێ! بەڵام ئودیسە زۆر چاك حاڵی بوو کە لەو سەری مەسەلەکە دێتەوە.

– یونانییەکان هەوەڵجار وا دەنوێنن کە بە کەشتییەکانیان دەگەڕێنەوە، بەڵام خۆیان لە پشت دورگەی تیندوس، ئەو دورگەیەی کە لەوێوە لە بەرانبەرەوە دەبینری، دەشارنەوە، کە تۆ ئەسپە پڕ لە جەنگاوەرەکانت گەیاندە ناو تەروادە، دۆستەکانمان دووبارە دەگەڕێنەوە. ئێمە لە ئەسپەکە دێینە دەرەوە، دەرگاکان دەکەینەوە وشار دەگرین.

– ئودیسە شا، من قەناعەت بە تەروادەییەکان دەکەم. تۆ چەند بۆکس و شاپێکم لێ بدە و چاك دەموچاوم بڕوشێنە. بەڵام ئاگادار بە کە جەزرەبەکان دەبێ بدینرێن و ببیسترێن. ئەوی دیکەی لەسەر من.

– پاش ئەوەی کە بریندارم کردیت، ئیدی چ دەکەی؟

– پاش ئەوەی تێر شاپانت کردم و هەموو گیانت بریندار و شین و مۆر کردمەوە هەنگێ جلوبەرگی گەدایی لەبەردەکەم و بۆ تەروادە دەڕۆم.

– لەتەروادە چ دەکەیت؟

– شا ئودیسە، تۆ لە من چاکتر دەزانی! لە تەروادە دەڵێم کە خراپەیان دەگەڵ کردوم، ئێوە بێ رەحم و بێ شەرمن و من دەمەوێ تۆڵەی خۆمتان لێ بکەمەوە و هەر هەمووتان بکوژم و..

– ئافەرین سینون! ئەگەر لە من زیرەکتر نەبی کەمتریش نیت! بێگومان تۆ دەوڵەمەند دەبیت!

سینون گوتی: کەواتە تا دەتوانی لێم بدە و بریندارم بکە.

سینون رووت بووەوە و شا ئودیسە بەشاe و بۆکس تێی بەربوو و برینداری کرد. کاتێ بە باشی

بریندار بوو هەموو گیانی خڵتانی خوێن بوو، سینون پارچەیەکی کۆنی چەور و چڵکنی پەیدا کرد و وەکو شانێل بە شانی خۆیدا داو ئەوجا بە شەلەشەل و بەتاقی تەنیا بەرەو تەروادە وەڕێ کەوت.

خۆی وەشاریدا کرد و داوای کۆمەك و دالّدەی کرد. خەڵکی کە بەو حاڵە خەمبارە و بەو شڕ پۆشی و خڵتانی خوێن و برینداریییەوە دیتیان لە دەوری خڕ بوونەوە و کەوتنە پرسیار.

– تۆ کێی؟

– لە کوێوە دێی؟

– کێ وای لێکردویت؟

– بەلەنگازۆ!

– نێوت چییە؟

– بۆچی وەها بریندار بوویت

– چیت لێ قەوماوە؟

– چم لێ قەوماوە؟ بە خۆتان نابینن؟ مامەڵەی سەگیان دەگەڵ کردووم. دەیانویست بمکوژن. بەلام توانیم هەڵێم! دەمەوێ تۆڵەی خۆم بکەمەوە! دەمەوێ تۆڵەی خۆم لە هەر هەموویان بکەمەوە! لە شا مینلایوس، لە شا ئاگامەمنون. لە شا ئودیسە و لەوانی دیکەش! بەخۆتان دەیبینن، پیاوێکی بەلەنگازی وەکو من، کاتێ لە حەیوان خراتر رەفتاری دەگەڵ بکرێ، دەتوانێ خراپە بکات! بەلام من دەمرم، لە برساندا دەمرم! سینون، چاوی خۆی نوقاند و خۆی بە عاردیدا دا، لە تۆ وایە بەراستی خەریکە لە برسان دەمرێ. تەروادەییەکان کە بە دیتنی دژمنێکی ئاگامەمنون خۆشحاڵ بوون، خێرهاتنیان کرد و تێریان کرد و گوتیان:

– بابایەکی وەها، زۆر باشە، چونکە نهێنییەکانی دژمن دەزانێ، دەتوانێ یارمەتیمان بداتو بەسەر دژمندا سەربکەوین.

کە سینون تێر بوو، تەروادەییەکان بە ئومێدی ئەوەی زانیاری زیاتریان لێ دەست بکەوێت، لە دەوری خڕ بوونەوەو یەکێکیان پرسی: پێم بڵێ پیاوی باش، ئەو پەیکەرە گەورەیەی کە لە ئەسپ دەکات و یونانییەکان دورستیان کردووە چییە؟ تۆ هیچی لێدەزانی؟

– هەلبەتە دەزانم! بەراستی ئەسپە! من ئەمەم کاتێ بیست کە ئاگامەمنون لەگەڵ مینلایوس دا باسی دەکرد. ئەمە ئەسپێکە و بەو مەبەستە دروستیان کردووە کە پێشکەشی بکەن بە ئاتینیا تا یارمەتی یونانیەکان بدات کە بەسەلامەتی بۆ ماڵی خۆیان بگەڕێنەوە.

– بۆ ماڵ بگەڕێنەوە؟ کەواتە دەگەڕێنەوە؟ ئیدی شەڕ ناکەن؟

– نازانن؟ دوای مردنی ئاشیل، لەشکر ورەی بەرداو هیچ کەس ئومێدی بە سەرکەوتن نەما! دەگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان، ئەدی نابینن کەشتییەکانیان حازر دەکەن تا بگەڕێنەوە؟ ئەو سەگانە دەگەڕێنەوە و بەسلامەتی دەگەنەوە ماڵەوە! بەلام ئەگەر ئێوە بتانەوێ هەر هەموویان دەکوژن و شتاقیان جارەکی دی خاکی یونان نابیننەوە.

– بێگومان دەمانەوێ! چ بکەین؟ ئەوەمان پێ بڵێ سینون! تۆ ئیدی یەکێکی لە خۆمان و کەس

حەددی نییە بەدرەفتاریت دەگەڵ دا بکات!

– تا ئەسپەکە لە دەرێی شورەی شاردا بێ، یونانییەکان لە دەریادا ساغ و سەلامەت دەبن، بەڵام ئەگەر ئەسپەکە بێتە مەیدانی گەورەی شار و لە بەرانبەر پەرستگەی پالاس ئاتینا بوەستێ، باهۆز و تۆفانێکی ترسناك لە دەریادا هەڵدەکات و شەپۆلی گەورە کەشتییەکان غەرق دەکات، رەشەبا پارچە پارچەیان دەکات و جەنازەی دژمنان هەڵدەداتە رەخی دەریا. ئەوساکە جەنازەی ئەو سەگە، جەنازەی ئاگامەمنون دەبینین! کالخاس، کە بە نێوبانگترین غەیبزانی ئێمەیە، پێشبینی ئەمەی کردووە! هەموو ئومێدێکی من هەر ئەمەیە و چ شتێك لەم دنیایەدا لەمەی پتر خۆشحاڵم ناکات.

تەروادەییەکان باوەڕیان بە سینون کرد و کەوتنە باسی ئەوەی کە ئەسپەکە بێننە ناو تەروادە.

لەم کاتەدا کەشتییەکان ئامادەی حەرەکەت بوون. چارۆکەکانیان هەڵدا، یونانییەکان سواری کەشتییەکان بوون و لە دەریا دوور کەوتنەوە. ئەسپە گەورە دارینەکە لە بەرانبەر دیوارەکانی شاردا بە تەنێ مایەوە. خەڵکی بۆ دڵنیابوون لە رۆیشتنی دژمن و دیتنی ئەسپەکە، بە هەراو زەناوە لە شار وەدەرکەوتن.

– چەند جوانە!

– هەر دەڵێی زندووە!

– دەبێ بیبەینە ناو شار و لە بەرانبەر پەرستگەی پالاس دا دای بنەین!

– ئەگەر بیبەینە ناو شارەوە، دژمنانمان هەموو دەمرن!

– راستە، بەڵام کێ وا دەڵێ!

– ئەو یونانییەی کە بە نیوە گیانی هاتبووە  ئێرە.

– غەیب زانان وایانگوتووە.

– مەعلوم؟

– راستە! بە یونانی و غەیبزان باوەڕ بکەن!

کاساندرای، کیژی شا هاواری دەکرد و دەگریا و دەیگوت کە ئەسپەکە زندووە زەرەرێکمان لێدەدات.

– کاساندرا؟ کیژی شا؟ ئەو چو زانێ! شێتە! کێ گوێ بە قسەی ئەو دەدات؟ کاساندرای جوانترین کیژی شا لە شار وەدەرکەوت. کە گەییە ئاستی ئەسپەکە، خۆی بە عاردیدا داو دەستی بە گریان کرد. ئەوجا هەستاو روانییە  دەریای دوور. دەتگوت لەنێو دەریادا شتی سامناك دەبینێ.

– ئەسپە دارینەکە زندووە! وەکو هەزار دوژمن شەڕ دەکات! من بەچاوی خۆم دەیبنیم! دوای ئەوەی کە سەرکەوتین، دەمرین! ئەسپەکە هەناسە دەدا، رێدەکات، لەگەڵ خۆیدا چەك هەڵدەگرێت! نابینن کە زندووە؟ مەیەڵن بێتە ناو تەروادەوە! ئەوەتا! بەرەو شار غار دەدەن! ئێوە دەکوژن! ئاها! هەموو جێیەك هەر کوژراوە، هەموو شوێنی هەر خوێنە، خوێن، زنجیر، گریان، هاوار، ئازار، داماوی!

کاساندرا هاواری کرد، گریا، خۆی بە عاردیدا دا، بەڵام کەس باوەڕی بە قسەکانی نەکرد. خەڵکەکە لە دەوری ئەسپەکە کۆ دەبوونەوە و ستایشیان دەکرد، بەڵام یەکێك لە غەیبزانەکان بەنێوی لایکون گوتی:

– خەڵکینە، من پێشنیازێك بۆ ئێوە دەکەم. باوەڕ بە یونانییەکان مەکەن، باوەڕ بە سینون مەکەن. ئەسپەکە مەیەننە نێو شار، یونانییەکان فێڵبازن، سینون درۆی کردووە.

کەلایکون ئەمەی گوت، دووماری ترسناك و گەورەی چاو ئاگرین کەیەکی هەزار تاجیان بەسەر سەرەوە بوو، لە دەریاوە بەرەو ئەو هاتن. کەلە لایکون نزیك بوونەوە، نیگایەکیان کرد، ئەوجا لە دەوری بەدەنی هاڵان و بە توندی گوشییان، لە کاتێکدا کە مارەکان دەیان خنکاند، بە لەنکازە هاواری دەکرد و داوای کۆمەکی دەکرد. دوو کوڕەکەی بە دەنگییەوە هاتن و ویستیان بابیان رزگار بکەن، بەڵام مارەکان خۆیان درێژتر کرد و لە دەوری هەر دوو لاوەکەش هاڵان. هەرسێکیان پێکەوە گوشین و هەر سێکیان کوشتن. پاشان مارەکان بۆ دەریا گەڕانەوە.

خەڵکی، کپ و کڕ و ترساو، دیمەنە سامناکەکەیان بینی و یەکسەر دەستیان دایە یەك و هەوڵیاندا ئەسپەکە بەرنە ناو شارەوە، ئەسپەکە برایە نێو شار و تەروادەییەکان بەو خەیاڵەی کە لە ئەنجامدا لە شەڕی دژمنانیان رزگار بوون تا کۆتایی شەو ئاهەنگیان گێڕاو خۆشحاڵییان کرد. ئەوسا هەموو شەکەت و خۆشحاڵ بۆ ماڵەکانیان گەڕانەوە غافڵ بوون لەوەی کە دژمنەکەیان لە پشت دوڕگەی تیندوسەوە خۆیان مەڵاس داوە و هێدی هێدی هێرش دێنن.

"23"

## هەڵاتن لە تەروادە

شەوێکی تاریك بوو. کپی و بێدەنگییەکی سەیر و بەسام شاری تەروادەی باوەشی خەوی داگرتبوو. دەرگا چکۆلەکەی ئەسپە دارینە کە برابووە بەردەم پەرستگەی پالاس، کرایەوە. نەفەرێك سەری لێوە هێنایە دەرێ. ئەو نەفەرە ئودیسەی شای ئیتاکا بوو. کە زیرەکترین فەرماندە بوو. یەکسەر پیاوێك لە مەیدانەکە بەدیار کەوت و گوتی: وەرنە دەرێ! وەختێتی! ئەمە ئیپیوس بوو کە زیرەکترین سەرباز بوو. لە دەرگای ئەسپە دارینەکەوە پەتێك شۆڕ کرایەوە، ئودیسە، مینلایوس، ئایاس و هەموو ئەو جەنگاوەرانەی کە لە نێو سکی ئەسپەکەدا بوون هاتنە خوارەوە. ئەوانە هێدی و هێمن هاتنە خوارەوە و بەرەوشار چوون. بێ سرتەو ورتە شەقامەچۆڵەکانی شاریان بڕی و یەك بە یەکی نۆبەدارەکانیان کوشت، بێ ئەوەی دەنگ لە کەسەوە بێت. نۆبەدارەکانیان کوشت و دەروازەکانی شاریان خستە سەرگازی پشت. سەربازان بەبێدەنگی لە دەروازەکانەوە وەژووکەوتن. 20نەفەر 30 نەفەر، 50 نەفەر سەد نەفەر، هەزار نەفەر، هەموو شەقامەکان تەژی سەرباز بوون. کە ژمارەیەکی زۆری جەنگاوەران وەناو شار

کەوتن هەنگینیٚ بەهاوارو د ەنگی بەرز دەرگاکانیان شکاند و رژانە نێو ماڵەکان. تەروادەییەکان کە هێشتا لە خەودا بوون، راپەڕین، لە پەنجەرەکانەوە روانیان، سەیریان کرد شەقامەکان پڕن لە سەرباز و جەنگاوەرانی دژمن. ژنان و منداڵان ترساو و تۆقیو دەگریان و هاواریان دەکرد. پیاوان بەدووی چەکدا دەگەڕان. بواری شەڕ نەبوو. چونکە یونانییەکان بە شمشێر و نێزەوە خۆیان بەسەر تەروادەییەکاندا دەدا. شەڕ کردن مەحاڵ بوو. چ ڕێگەیەکی رزگار بوون نەبوو، مەگەر فیرار و هەڵاتن. زۆر کەس لە تاریکی شەودا بەرەو دەریا هەڵاتن. شەقام و مەیدانەکانی شار پڕ بوون لەکوژراوو بریندار. جگە لە گریان، شیوەن، پاڕانەوە، هەڕەشە، هاواری دڕندانە، دەنگی چەك، چ شتێکی دی نەدەبیسترا. لەبەر روناکی ئاگر، ژنان دەبینران کە ترساوو تۆقیو منداڵ بەباوەشەوە هەڵدەهاتن. پیاوان بە گوێرەی توانا شت و مەکیان هەڵدەگرت. منداڵان مات و سەرسام و بە ترس و لەرزەوە بەدوی داك و بابدا غاریان دەدا. لە کۆشکی شازادەکاندا هەراو هەنگامە و قەرەباڵغییەك بوو ئەو سەری دیار نەبوو. شازادەکان هاواریان دەکرد و دەگریان. پریام شا لە رای رزگاری خۆیدا بەم لاو بەو لادا غاری دەدا.

لیو پرسی: خۆی رزگار کرد؟

–نە، لە نێو پەرستگەکەدا و لە حاڵەتی دوعا کردنا کوژرا.

لیا پرسی: شابانۆش کوژرا؟

– نە، بەلەنگاز شابانۆ! چارەنووسێکی پڕ کارەساتی بوو. ئەوبوو بە کۆیلەی ئودیسە و کاساندرا بوو بە کۆیلە و کەنیزەکی ئاگاممەنون. هەموو کەسێکیان هەر دەکوشت. مینلایوس لە ژوورەکاندا بەدوی هیلین دا دەگەڕا تا بیکوژیٚ. دۆزییەوە و شمشێر بەدەست تاوی دایێ. هیلین ی جوان بەدەم پاڕانەوەوە خۆی بەسەر پێیدادا. مینلایوس کە توندارێوس ی (بابی هیلین)ی بیرکەوتەوە، لێبرا کە نەیکوژێت و بۆ ئەسپارتەی بگێڕێتەوە. هیلین کرنۆشی برد و کەوتە سەر دەست و پێی.

شازادە ئاینەیاس ی پس مامی شا، کە لە شەڕی تەن بەتەن دەگەڵ ئاشیل دا، لەلایەن پوسیدون ەوە رزگار کرابوو، وەکو ئەوانی دی غاری دەدا، هەوڵی دەدا ئەو بەلاٚو ئاژاوەیە جلەو بگریٚ و هێندەی لە تواناد ا بیٚ خەڵکەکە رزگار بکات. حاڵی بوو کە هەر بەرگری و بەرەڤانییەك بێفایدەیە. بە هەموو ئەوانەی کە بۆ لای ئەو دەهاتن، دەگوت: خێراکەن، هەڵێن! ئەگەر دەتانەویٚ رزگار بن بەرەو دەریا برۆن!

لە یەکێك لە ژوورەکاندا تووشی ئانخسیس ی بابی بوو. خستییە سەر شانی. چونکە ئانخسیس پیر بوو و نەیدەتوانی خۆی رزگار بکات.

شازادە ئاینەیاس لە حاڵێکا کە ئانخسیس ی بەسەر شانەوە بوو و دەیبردە دەریٚ، گوێی لە دەنگیٚ بوو: "باوکە! باوکە" ئاینەیاس ئاوڕی دایەوە. ئاسکانیوس ی کوڕی بچوکی خۆی بینی. ئەو منداڵە کە بێدار بووەوە و بابەگەورەی بەسەر شانی ئاینەیاس ەوە بینی، سەیری پێهات. ئاسکانیوس هێشتا هەستی بە خەتەر نەکردبوو.

– بۆچی بابەگەورەت لەکۆڵ گرتووە؟

–دوایی پێت دەڵێم: ئێستا دەبێ منداڵێکی باش بیت و هەرچییەکت پێ دەڵێم وا بکەی. دەستت بدە بە من و تا دەتوانی غار بدە. بێدەنگبە و پرسیار مەکە.

ئاسکانیوس بە جدی وەڵامی دایەوە: باشە، زۆر باشە.

دەستە بچووکەکەی دایە بابی و بە بێدەنگی لەو تاریکە شەوەدا رۆیی. لەرێگەدا کە چاوی بەوپیاو و ژنانە دەکەوت کە دەکوژران. نە قسەی کرد و نە هیچ پرسیارێکی کرد. کە لە دەرگا وە دەرکەوت، حاڵی بوو کەسەربازانی نۆبەدار کوژراون. بەڵام هیچی نەگوت. بەرەو دەریا رۆیی. لەرێگەدا زۆری بینی وەکوئەو گورج و زیت و زرنگ غار دەدەن و هەندێکیان دەگرین و هەندێکی دی بێدەنگن. لێ ئەو بە درێژایی رێگە چ قسەیەکی نەکرد و گەییە دەریا.

شازادە ئاینەیاس. ئانخسیس ی لە کۆڵی خۆی داگرت. ئەو سێ کەسەش کەوتنە ناو تەروادەییەکانی ترەوە. پیاوان، ژنان، منداڵان. بێ شار و ماڵ و حاڵ مابوونەوە. بێنەوا. تەنیا شەکەت و داماو. دەگەڵ خۆیاندا شتی بە هادار و کیسە گەنمیان هێنا بوو. بەڵام زۆر شتیان لە تەروادە مابووەوە! سات بە سات سەربازان و کوژراوان لە رێگەوە دەگەییین. تەروادە لە تاریکی شەودا دە نێو ئاگردا دەسووتا. بڵێسەی ئاگر هەمووانی بێزار و بێ تاقەت کردبوو هەموو بە کوڵ دەگریان. بەڵام شازادە ورەی بەر نەدا. گوتی: گریان فایدەی نییە! با هەوڵ بدەین بەو بەلەم و کەشتیانەی کە لەرەخی دەریادا بەستراونەتەوە خۆمان رزگار بکەین. ژنان و منداڵان سواری بەلەمەکان بکەن. هەموو ئەو خشڵ و زێڕ و زیوو و ئاردانەی کە لە تەروادەوە هێناومانن بار بکەن و با لە کەنار دوور بکەوینەوە. هەرکەسەتان دەبێ کارێك بکات، کەئاینەیاس ئەمەی گوت، ئیدی کەس نە گریا. ئارد و خشڵ و زێڕ و زیویان لە کەشتییەکان بار کرد. ئاسکانیوس ی چکۆڵەش پێ بەپێی ئەوانی دی کاری دەکرد و هەر شتێکی بتوانایە دەگەڵ خۆی دەیبرد. ئاسکانیوس، هەرچەندە بچووك بوو. بەڵام هەستی بە کارەساتەکە دەکرد.

کەشتییەکان بارکران، ئەوجا ژنان و منداڵان و پیرەمێران و ئەوجا پیاوانی دی سواری کەشتی بوون. پیاوان دەستیان بە سەوڵ لێدان کرد. هێشتا بەیانی نەدابوو، بەڵام بڵێسەی ئاگر شاری روناك کردبووەوە. هێشتا دەنگی هاوار و گریان و ناڵە لە شارەوە دەهات، ئاسکانیوس، هەرچەندە کە خەوی دەهات و برسی بوو و دایکی دەویست، بەڵام هیچی نەدەگوت. سەری نایە سەر رانی ژنێکی نەناس و خەوت. پیاوان هەر خەریکی سەوڵ لێدان بوون. با، کەشتییەکانی بە خێرایی دەبرد. رۆژ بووەوە و ئەان هێشتا هەر سەوڵیان لێدەدا. رۆژانی یەك لە دووی یەك سەوڵیان لێدا. لە دەریای یونان و لە دەریای سیسیل پەڕینەوە و گەینە کەنارێن ئەفریقیا. کە شارێکی گەورە و جوانیان بینی وەستان، چونکە لە کەشتی ڕانی ماندوو بووبوون. لە رەخی دەریادا ماسی گرێکیان بینی کە تۆڕەکانی کۆ دەکردەوە، ئاینەیاس لەماسیگرەکەی پرسی ئەمشارە نێوی چییە؟ ماسیگرەکە وەڵامی دایەوە:

–ناوی ئەم شارە کارتاژە.

– ئەی ناوی پاشای کارتاژ چییە؟

– کارتاژ، هەرگیز پاشای نەبووە. شارەکەمان ماوەیەك لەمەوبەر ژنێك بەنێوی دیدو دروستی

کردووه و دیدۆ مەلیکەی ئێمەیە و کاتێ هاتە ئێرە بێوەژن بوو. زۆر کەس هەوڵیانداوە بیخوازن. بەڵام ئەو نایەوێ مێردە کوژراوەکەی لەبیربکات و هەمیشەدەگری. سوێندی خواردووە کە شوو نەکاتەوە. بۆیە نایەوێ کەس بدینێ.

ئاینەیاس پرسی: ئایا من دەتوانم بیدینم؟

– بەڵێ، چونکە تۆ هەژارێکی دەست کورتی و ناتوانی داوای لێ بکەی کە شووت پێ بکات.

ئاینەیاس، چووە نك مەلیکە و سەربوری خۆی بۆ گێڕایەوە. مەلیکە زۆر بە وردی گوێی لێگرت. پاشان دیارییەکی زۆری دایێ و ئەو ئاسکانیوس ی لەکۆشکەکەی خۆیدا دەعوەت کرد.

چونکە ئاینەیاس جوان و بەهێز بوو، دیدۆ داوای لێکرد کە لەوێندەر بمێنێ و ببێ بە پاشای کارتاژ. بەڵام ئاینەیاس پێشنیازەکەی ئەوی رەتکردەوە و گوتی:

– ئەی مەلیکە، من ناتوانم. خواوەندان منیان نەجاتداوە. تا تەروادەییەکان بۆ وڵاتێکی سەیر و عەجایەب کە ببێ بە بناغەی شارێکی گەورە، نەك بۆ وڵاتی کارتاژ، رێنوێنی بکەم. ئەی مەلیکە من ناتوانم لێرە وەمێنم. ئاینەیاس لەگەڵ خەڵکەکەیدا لە کارتاژەوە بەرێکەوت. پیاوان سەوڵیان لێدا، سەوڵیان لێدا، ئەوجا گەیینە رێژگەی روبارێکی گەورە. لەوێندەر وەستان. لە کەشتییەکان دابەزین و لەوێندەر مانەوە. پاشان کەمێ دوورتر لەوێندەر بۆ ماوەی چەندین سەدە شارێکی گەورە بەنێوی رۆم کە بوو بە خاوەنی هەموو دنیا بەرپا کرا.

سەرچاوە:

داستانهای از اساطیر یونان

لائورا اورویتو

ترجمە جمشید کاویانی

گروە سنی "د"

Laura Orvieto

storie Della Momdo

Tales From Ancentgreece

کۆمەڵە چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانەوە

لائورا اوریتو

وەرگێڕانی: جەمشید کاویانی

تایبەتە بە تەمەنی گروپی (د)

چاپی یەکەم 1357 (1979)

## حەمە كەریم عارف

- كەركووكییە و لە ساڵی 1951دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی 1975 كۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو كردووە.
- یەكەم بەرهەمی شیعرێكە بەناوی (هەڵبەستێكی هەتیو كەوتوو) كە لە ژمارە (170) رۆژنامەی هاوكاری ساڵی 1973 بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی 1976ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەكاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سكرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوكراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی كەركووك, نووسەری كوردستان, كەلتوور, نووسەری كورد, گوڵانی عەرەبی, ئاڵای ئازادی تا ژمارە 00222, گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی, بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی كەركووك, نووسەری كوردستان, كەلتوور, رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: 222 بەناوی گۆڤەند, زنار, سیپان, پاكزاد, محەمەدی حاجی, سیروان عەلی, دیدار هەمەوەندی, هێژا, ح. ع بەرهەمی بڵاو كردۆتەوە.
- جگە لە پارتی دیموكراتی كوردستان و یەكێتیی قوتابیانی كوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و رێكخراوێكی سیاسی نەبووە, لە ساڵی 1974 – 1975دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە, لە هەشتاكاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ, بێ وابەستەگی حیزبی, پێشمەرگە بووە و وەكو بەشدارییەكی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی كوردا شانازی پێوە دەكات و منەت بەسەر كەسدا ناكات, چونكە باوەڕی وایە كە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحكومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاكانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆكایەتی لقی كەركووكی یەكێتیی نووسەرانی كوردی كردووە.
- زۆر بەرهەم و كتێبی چاپ و بڵاو كردۆتەوە, لێ زۆربەی هەرە زۆریان, بە تایبەتی ئەوانە لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە كەم بڵاو بوونەتەوە, لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە كە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

1- تیرۆژ, كۆ چیرۆك, چاپی یەكەم 1979
2- كۆچی سوور, رۆمان, چاپی یەكەم 1988
3- بەیداخ, چیرۆك, 1988
4- داوەتی كۆچەرییان, كۆ چیرۆك چاپی دووەم 2005
5- لە خۆ بێگانە بوون, كۆمەڵە چیرۆك, چاپی یەكەم (1999) دەزگای گوڵان
6- كوچ سرخ, كۆ چیرۆك, بە فارسی, وەرگێران چاپی یەكەم 1987 شاخ

7- نینا, رۆمان, سابت رەحمان, دوو چاپ, شاخ, شار 2002
8- نامۆ, رۆمان, ئەلبێر کامۆ, دوو چاپ, شاخ, شار 2003 دەزگای ئاراس
9- ڕێبەر, رۆمان, مەهدی حسین, یەك چاپ (شاخ)
10-شکست, رۆمان, ئەلکساندەر فەدایەف, چاپی شاخ (راە کارگر)
11 – هاوماڵەکان, رۆمان, ئەحمەد مەحمود, دوو چاپ, شاخ, شار 2000 گوڵان
12- بێناسنامەکان, رۆمان, عەزیز نەسین, 3 چاپ شاخ, شار 2003
13- قوربانی, رۆمان, هیرب میدۆ, چاپی یەکەم 2004 دەزگای شەفەق
14- دووره ولات, رۆمان ع. ڤاسموف, چاپی یەکەم2000 دەزگای گوڵان
15- ئازادی یا مەرگ, رۆمان, کازانتزاکیس, چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران
16- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی, دوو چاپ, شاخ, شار 2004 کتێبخانەی سۆران هەولێر
17- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی, چاپی شاخ 1985
18- دلێریی خۆراگرتن, ئەشرەڤ دەهقانی, چاپی شاخ
19- مەسەلەی کورد لە عێراقدا, عزیز شەریف
20- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد, ئیحسان نوری پاشا, یەك چاپ
21- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ, مەسعودی ئەحمەد زادە, چاپی شاخ
22- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو, د. کوینتەر دیشنەر, چاپی شێیەم 2004 دەزگای ئاراس
23- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس, نەجەف قولی پسییان
24- گوزارشتی مۆسیقا, د. فۆاد زەکەریا.
25- دەربارەی شیعر و شاعیری, رەزا بەراهەنی.
26- ڤنسنت ڤان گوگ, شانۆنامە, باول ئایز لەر
27- بە دوعا شاعیرەکان, شانۆنامە, جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:12)
28- جولەکەکەی مالْتا, شانۆنامە, مالرۆ.
29- دادپەروەران, شانۆنامە, ئەلبێر کامۆ.
30-بەد حاڵی بوون, شانۆنامە, ئەلبێر کامۆ.
31- چاو بە چاو, شانۆنامە, گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)
32- ریچاردی سێیەم, شانۆنامە, شەکسپیر.
33- گەمەی پاشا و وەزیر, شانۆنامە, عەبدوڵڵائەلبوسێری.
34- کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا, چاپی یەکەم 1998 وەزارەتی رۆشنبیری.
35- هونەر و ژیانی کۆمەڵایەتی, پلیخانۆڤ, چاپی یەکەم 2005 دەزگای موکریانی
36- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت, ئیڤلین رید.
37- لێکدانەوەیەك لە مەڕ نامۆ, لویس ریی.
38- منداڵە دارینە, چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.

39- فاشیزم چیی؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان, یەلماز گونای

40- شوانە بچکۆلەکە, چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان

41- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)

42- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە.

43- کۆمەڵێك ئەفسانەی جیهانی (23 ئەفسانە)

44- زندە خەون, کۆمەڵە چیرۆکی چیخوف, چاپی یەکەم (2001) دەزگای موکریانی

45- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی, چاپی یەکەم (2004) کتێبخانەی سۆران, هەولێر

46- جیٚ پیٚ, کۆمەڵێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان:(سادقی هیدایەت, جەلال ئال ئەحمەد, بوزرگی عەلەوی, سادقی چوبەك, مەنسوری یاقوتی)

47- چیرۆکستان, کۆمەڵێك دەق و رەخنە, چاپی یەکەم 2005 نووسەرانی کەرکووك

48- چۆنیەتی فێر بوونی زمانی فارسی, چاپی یەکەم (2000) حەمە کەریم عارف

49- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف

50- پەلکە رەنگینە, حەمە کەریم عارف, چاپی یەکەم (2004) وەزارەتی رۆشنبیری

51- کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە

52- چزیشفسکی, فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس

53- چایکۆ فسکی, ژیان و بەرهەمی.

54- ئیدگار ئالین پۆ, ژیان و بەرهەمی.

55- جاك لەندەن, ژیان و بەرهەمی

56- گوگول, نووسەری ریالیست

57- یەڵماز گونای, ژیان و بەرهەمی

58- سادقی هیدایەت, ژیان و بەرهەمی

59- خافرو غ لە شیعر دەدویٚ, ژیان و بەرهەمی

60- رێبازە هونەرییەکانی جیهان

61- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا, چاپی یەکەم (2004) دەزگای سپیرێز

62- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا ( بە شەریکی) چاپی یەکەم (2001) دەزگای گولان

63- راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا, حەمە کەریم عارف

64- دیدار و دەق و رەخنە.

65- دیداری چیرۆکڤانی.

66- قوتابخانە ئەدەبییەکان, رەزا سەید حسەینی.

67- ناودارانی ئەدەب, حەمە کەریم عارف

68- هەزار تۆپی شیعری نوێخوازی و چەند باسێکی دی, حەمە کەریم عارف.

69- کورد لە سەدەی نۆزدە و بیست دا, کریس کۆچرا, چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران

* لـە ڕاپەڕینــەوە تـا نهـوو چـالاکانە بەشـداری بزاڤـی ئـەدەبی و ڕۆشـنبیریی کـوردی دەکـات و بەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هـەر کـەس و گـروپ و لایـەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، ئامادەیە بە خۆڕایی پێشکەشیان بکات.

# پێرست